# پێرست

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين أحمده حمدًا يرضيه وَيزكينا لَديه، وصلى الله أولى صلواته على النبي الطاهر عبده وَرسوله، مفتاح الرحمة وَخاتم النبوة، الأوّل منزلةً وَالآخر رسالةً، الأمين فيما استودع، والصادق فيما بلّغ، أما بعد:

مانگی ڕەمەزان گەورەترین مانگە لە مانگەکانی ساڵ، ئەجری عیبادەت تیایدا جیاوازە لە ئەجرەکەی لە چاو مانگەکانی تردا، عیبادەت و چاکە کردن تیایدا چەند بارەی عیبادەتە لە مانگەکانی تر، عیبادەتێکی تێدا فەڕز کراوە کە نموونەی نییە ئەویش ڕۆژووە کە دەبێتە قەڵغان بۆ خاوەنەکەی، لەم مانگەدا الله ﷻ ڕەحمەتی فراوانی خۆی دەڕژێنێتە سەر ئیمانداران، دەرگای ڕەحمەت و لێخۆشبوون و ئاسمانەکان دەکاتەوە بۆ ئیمانداران، لەم مانگەدا شەوێکی تێدایە کە خێری لە هەزار مانگ زیاترە ئەویش شەوی قەدرە.

ئەو ڕۆژووەی کە لەسەرمان فەڕز کراوە گەورەترین پاداشتی هەیە، الله ﷻ یەک بە دە هەتا یەک بە حەوت سەد پاداشتی ئیمانداری ڕۆژووەوان

دەداتەوە، ئینسانی ئیماندار ئەگەر هاتوو یەک ڕۆژ لە پێناو اللە ﷻ بەڕۆژوو بێ ئەوە اللە ﷻ لە پاداشتیدا حەفتا پاییز لە ئاگری جەهەنەم دووری دەخاتەوە و دەیپارێزێ، جا دەبێ حاڵی ئیمانداران چۆن بێ کە لە پێناو اللە ﷻ مانگێک بەڕۆژوو دەبن؟!

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: « **مَنْ صَامَ يَوْمًا فِي سَبِيلِ الله بَعَّدَ اللَّهُ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا** ».

صحيح البخاري | ٢٨٤٠ صحيح مسلم | ٢٧١١ سنن الترمذي | ١٧١٧ سنن النسائي | ٢٢٥٠ سنن ابن ماجه | ١٧١٧ مسند أحمد | ١١٥٦٠

جا لەبەرئەوەی ئەم مانگی ڕەمەزانە هەموو ساڵێک دێتەوە ڕێمان، وە لەبەر گەورەیی و فەزیلەتی عیبادەتی ڕۆژووەکەی، وە پێویستی ئەهلی ئیمان بە واجبات و وەزیفەکانی ئەم مانگە پێم خۆش بوو کتێبێک لەبارەیەوە بنوسم هەتا موسڵمانان بەرچاو ڕوون بن لە فەڕیزەی ئەم ڕۆژووە و واجبات و عیبادەتەکانی ئەم مانگە، والحمدلله رب العالمين.

هەڵمەت عبدالله

هەڵەبجە | جمعة

٦/شعبان/١٤٤٥

# ڕۆژووی یوم الشک و دوو ڕۆژی پێش مانگی ڕەمەزان

**صلة بن زفر** دەڵێ: ئێمە لای عمار بن یاسر بووین رضي الله عنهما ڕۆژێک بوو کە شەک و گومان هەبوو ئایا ڕەمەزانە یاخود نا، عمار شاتێکی هێنا بۆ خواردن، هەندێک لە ئامادەبووان کشانەوە، عمار وتی: هەرکەسێک ئەم ڕۆژە بەڕۆژوو بێ ئەوە سەرپێچی أبا القاسم ـی کردووە ﷺ.

عَنْ صِلَةَ بْنِ زُفَرَ قَالَ: كُنَّا عِنْدَ عَمَّارٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي الْيَوْمِ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ، فَأَتَى بِشَاةٍ، فَتَنَحَّى بَعْضُ الْقَوْمِ، فَقَالَ عَمَّارٌ: مَنْ صَامَ هَذَا الْيَوْمَ فَقَدْ عَصَى أَبَا الْقَاسِمِ ﷺ.

سنن أبي داود ا ٢٣٣٤ سنن الترمذي ا ٦٩٤ سنن النسائي ا ٢١٨٨ سنن ابن ماجه ا ١٦٤٥ سنن الدارمي ا ١٧٠٨ صحيح ابن خزيمة ا ١٩١٤ سنن الدارقطني كتاب الصيام ا ٥

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثە لای زۆربەی زۆری ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، وە دوای ئەوانیش تابعین، وە سفیان الثوري، مالک بن أنس، عبدالله بن

المبارک، شافعي، أحمد، إسحاق بن راهوية بە کەراهەتیان داناوە ئینسان لە یوم الشک ـدا ڕۆژوو بگرێ. وە زۆربەیان وای دەبینن ئەگەر کەسێک بیگرێ وە ڕەمەزانیش بێ ئەوە دەبێ ڕۆژێک بگرێتەوە لە جێی.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَمَنْ بَعْدَهُمْ مِنَ التَّابِعِينَ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَمَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَعَبْدُاللَّه بْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ كَرِهُوا أَنْ يَصُومَ الرَّجُلُ الْيَوْمَ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ. وَرَأَى أَكْثَرُهُمْ: إِنْ صَامَهُ فَكَانَ مِنْ شَهْرِ رَمَضَانَ أَنْ يَقْضِيَ يَوْمًا مَكَانَهُ.

**عبيدالله بن يحيى** دەڵێ: یحیی بۆی گێڕامەوە لە مالک بن أنس ـەوە، لە ئەهلی عیلمی بیستووە ڕێگریان کردووە لە بەڕۆژوو بوونی ئەو ڕۆژەی گومانت هەیە لێی لە شەعباندا ئەگەر نییەتی لێ بهێنێ بۆ ڕۆژووی ڕەمەزان، وە وای دەبینن ئەگەر کەسێک بەڕۆژوو بێ لەکاتێکدا مانگ نەبینراوە، پاشان هەواڵ هات مانگ بینراوە، ئەوە دەبێ ئەو ڕۆژە قەزا بکاتەوە، وە بە کێشەیان نەزانیوە ئەو ڕۆژە وەک سوننەت بگرێ.

وە مالک وتی: ئەمە ئەوەیە ئێمە لەسەرینی، وە گەیشتووم بە ئەهلی عیلم لە شارەکەماندا لەسەر ئەمە بوون.

حَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ مَالِكٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ يَنْهَوْنَ أَنْ يُصَامَ الْيَوْمُ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ مِنْ شَعْبَانَ إِذَا نَوَى بِهِ صِيَامَ رَمَضَانَ، وَيَرَوْنَ أَنَّ عَلَى مَنْ صَامَهُ عَلَى غَيْرِ رُؤْيَةٍ، ثُمَّ جَاءَ الثَّبَتُ أَنَّهُ مِنْ رَمَضَانَ أَنَّ عَلَيْهِ قَضَاءَهُ، وَلَا يَرَوْنَ بِصِيَامِهِ تَطَوُّعًا بَأْسًا. قَالَ مَالِكٌ: وَهَذَا الْأَمْرُ عِنْدَنَا، وَالَّذِي أَدْرَكْتُ عَلَيْهِ أَهْلَ الْعِلْمِ بِبَلَدِنَا.

الموطأ لمالك ا ٧٠٤

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: پێش مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ ڕۆژوو مەگرن، ئیللا مەگەر کەسێک عادەتی وابووبێ بەردەوام هەندێک ڕۆژ بگرێ جا ئەو ڕۆژانەی بکەونە ئەو دوو ڕۆژە، کاتێک مانگتان بینی بەڕۆژوو بن، کاتێکیش لە کۆتاییدا مانگتان بینی ئەوە بیکەنە جەژن، ئەگەر هاتوو مانگتان نەدی و هەور بوو، ئەوە سی ڕۆژ بگرن، پاشان بیکەنە جەژن.

عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَمْرٍو، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: « **لَا تَقَدَّمُوا الشَّهْرَ بِيَوْمٍ وَلَا بِيَوْمَيْنِ، إِلَّا أَنْ يُوَافِقَ ذَلِكَ**

صَوْمًا كَانَ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ، صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَعُدُّوا ثَلَاثِينَ، ثُمَّ أَفْطِرُوا ».

صحيح مسلم | ٢٥١٨ سنن الترمذي | ٦٩٢ سنن ابن ماجه | ١٦٥٠ سنن الدارمي | ١٧١٥ مسند أحمد | ٩٦٥٤ مسند أبي داود الطيالسي | ٢٤٨٢ سنن الدارقطني كتاب الصيام | ١٥

وتم: مەبەستی ئەوەیە ئەگەر هاتوو کەسێک عادەتی وابێ ڕۆژی نا ڕۆژێ بەڕۆژوو بووبێ، یاخود ڕۆژانی دوو شەممان و پێنج شەممان بەڕۆژوو بووبێ، لەم کاتەدا ئەو ڕۆژانە دەکەونە یەکێک لەم دوو ڕۆژەی پێش ڕەمەزان، ئەوە دەتوانێ بەڕۆژوو بێ، هەروەها کەسێک ڕۆژێک یان دوو ڕۆژی ڕەمەزانی پێشوو قەرزارە، ئەوە ئەم کەسەش دەتوانێ بەڕۆژوو بێ.

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثە لای ئەهلی عیلم بە کەراهەتیان بینیوە ئینسان پەلە بکات بەڕۆژوو بێ پێش داخڵ بوون بە مانگی ڕەمەزان، ئەگەر هاتوو کەسێک عادەتی

وابووبێ بەردەوام هەندێک ڕۆژ بگرێ جا ئەو ڕۆژانەی بکەونە ئەو دوو ڕۆژە، ئەوە بەلایانەوە کێشەی تێدا نەبووە.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ كَرِهُوا أَنْ يَتَعَجَّلَ الرَّجُلُ بِصِيَامٍ قَبْلَ دُخُولِ شَهْرِ رَمَضَانَ لِمَعْنَى رَمَضَانَ، وَإِنْ كَانَ رَجُلٌ يَصُومُ صَوْمًا، فَوَافَقَ صِيَامُهُ ذَلِكَ فَلَا بَأْسَ بِهِ عِنْدَهُمْ .

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « پێش ڕەمەزان بە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ بەڕۆژوو مەبن، ئیللا مەگەر کەسێک عادەتی وابووبێ ڕۆژانێک ڕۆژووی هەبێ، ئەوە با بەڕۆژوو بێ ».

عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **لَا تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ وَلَا يَوْمَيْنِ، إِلَّا رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا، فَلْيَصُمْهُ** ».

صحيح البخاري | ١٩١٤ صحيح مسلم | ٢٥١٨ سنن أبي داود | ٢٣٣٥ سنن الترمذي | ٦٩٣ سنن النسائي | ٢١٩٠ سنن ابن ماجه | ١٦٥٠ سنن الدارمي | ١٧٣١ مسند أحمد | ٧٢٠٠ المصنف لعبدرزاق | ٧٤٤٣

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ئەگەر هەموو ساڵ بەڕۆژوو بم، ئەوە ڕۆژووی یوم الشک ناگرم و دەیشکێنم.

حَدَّثَنَا وَكيعٌ، عَن سُفيانَ، عَن عبدالعزيز بن حَكيمٍ، قال: سمعتُ ابنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يقول: لو صُمتُ السَّنَةَ كُلَّها لأَفطرت اليوم الذي يُشَكُّ فيه.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٨١

**الضحاك بن قيس** دەڵێ: ئەگەر هەموو ساڵ بەڕۆژوو بم، ئەوە ئەو ڕۆژە ناگرم کە گومانی لێدەکرێ ڕەمەزان بێ یاخود نا.

حَدَّثَنَا حَفصُ وَعلي بنُ مُسهِرٍ، عَن الشَّيباني، عَنِ الشَّعبيِّ، قال: قالَ الضَّحاك بنُ قَيسٍ لَو صُمتُ السَّنَةَ كُلَّها ما صُمت اليوم الذي يُشَكُّ فيه مِن رمضان.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٨٢

**محمد بن سيرين** دەڵێ: ئەگەر بێ ئەنقەست ڕۆژێک ڕۆژووی ڕەمەزان بشکێنم، پێم باشترە هەتا ئەوەی بەڕۆژووبم لەو ڕۆژەی گومانم لێی هەیە لە شەعباندا.

عَنْ جَعْفَرِ بْنِ سُلَيْمَانَ، قَالَ: أَخْبَرَنِي حَبِيبُ بْنُ الشَّهِيدِ، قَالَ: سَمِعْتُ مُحَمَّدَ بْنَ سِيرِينَ يَقُولُ: لأَنْ أُفْطِرَ يَوْمًا مِنْ رَمَضَانَ لَا أَعْمِدُهُ، أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أَصُومَ الْيَوْمَ الَّذِي يُشَكُّ فِيهِ مِنْ شَعْبَانَ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٤٥٧

**محمد بن سيرين** دەڵێ: لە بەصرە بەیانیەک هەستاین گومانمان هەبوو لە ڕۆژووەکەی نەماندەزانی ڕەمەزانە یاخود نا، چووین بۆ لای أنس بن مالک سەیرم کرد خەزیرەیەک هەیە پێش ئەوەی بچێت گرتی بەدەستیەوە، پاشان ڕۆیشت، پاشان چووم بۆ لای أبا السوار و العتكي داوای خواردنەکەی کرد، پاشان چووم بۆ لای مسلم بن یسار بینیم بەڕۆژوو نەبوو.

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَن مهدي بن ميمونٍ، عَنِ ابن سيرينَ، قال: أُصبحنا يومًا بالبصرة ولَسنا ندري على ما نحنُ فيه مِن صَومنا في اليوم الذي يُشَكُّ فيه، فأتينا أنس بن مالكٍ فإذا هو أخذ خزيرة كانَ يأخذها قبل أن يغدُوَ، ثُمَّ غدوا، ثُمَّ أتيت أبا السَّوَّار والعَتَكيَّ فدَعا بِغَدائه ثُمَّ تغدى ثُمَّ أتيت مسلم بنَ يسار فوَجدته مُفطرًا.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٨٤

الخزيرة: واتە گۆشتی پارچە پارچە کراو لەناو ئاودا دەکوڵێنرێ، کاتێک پێدەگات ئارد دەکرێ بەسەریدا.

مغيرة دەڵێ: إبراهيم النخعي و عامر الشعبي وتیان: بەڕۆژوو مەبە ئیللا لەگەڵ جەمع و کۆمەڵی خەڵکی نەبێ.

حَدَّثَنَا أَبو الأَحوَصِ، عَن مُغَيرةَ، عَن إبراهيم والشَّعبيِّ، أَنَّهما قالا: لا تَصُم إلَّا مع جماعةِ النَّاس.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٨٥

عامر الشعبي دەڵێ: هیچ ڕۆژێک نییە ڕۆژووەکەی بێزراو بێ بەلامەوە هێندەی ئەو ڕۆژەی خەڵکی خیلافیان هەیە تیایدا ڕەمەزانە یاخود نا .

حَدَّثَنَا وَكيعٌ، عَن إسماعيل بن أبي خالدٍ، عَنِ الشَّعبيِّ، قال: ما مِن يومٍ صَومه أبغَضُ إليَّ مِن يوم يختلفُ النَّاس فيه.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٨٦

**أبي العيزار** دەڵێ: هاتم بۆ لای إبراهيم النخعي لە ڕۆژی يوم الشك ـدا، وتی: پێم وابێ بەڕۆژووی، ڕۆژوو مەگرە ئیللا لەگەڵ جەماعە و کۆمەڵدا نەبێ.

حَدَّثَنَا وَكيعٌ، عَن أَبي العَيزارِ، قال: أَتيتُ إبراهيمَ في اليوم الذي يُشَكُّ فيه، فقال: لعلَّكَ صائمٌ لا تَصُم إلا مع الجماعة.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٨٨

**أبي المعلى** دەڵێ: سعيد بن جبير بە کەراهەتی دەبینی بەڕۆژوو بوون لەو ڕۆژەی کە خیلاف هەیە ئایا ڕەمەزان بێ یاخود نا.

حَدَّثَنَا أبو داود، عَن شُعبَة، عَن أَبي المعلى، عن سعيد بنِ جُبيرٍ، أَنَّه كانَ يَكره أَن يصومَ اليوم الذي يُختلَف فيه مِن رمضان.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٩١

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: هیچ ڕۆژێک نییە ڕۆژووەکەی بێزراو بێ بەلامەوە هێندەی ئەو ڕۆژەی خەڵکی گومانی هەیە لێی لە ڕەمەزاندا.

حَدَّثَنَا ابن فُضَيلٍ، عَنِ العلاء بنِ المُسَيَّبِ، عَن إبراهيمَ، أنَّه قال: ما مِن يومٍ أبغَضُ إليَّ أن أصومه مِنَ اليوم الذي يُشكُّ فيه مِن رمضان.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٩٦



# فەڕز بوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕۆژی عاشوراء ڕۆژێک بوو قورەیش لە جاهلیەتدا بەڕۆژوو دەبوون تیایدا، وە ڕەسول الله ـش ﷺ پێش ئەوەی ببێ بە پێغەمبەر بەڕۆژوو دەبوو تیایدا، وە کاتێک ڕەسول الله ﷺ هاتە مەدینە بەڕۆژوو بوو، وە ئەمریشی کرد بە گرتنی، بەڵام کاتێک ڕەمەزان فەڕز کرا، ئەوە ڕۆژووی عاشوراء وەک واجبی پێشوو تەرک کرا، هەرکەسێک ویستی لێ بووایە دەیگرت، هەرکەسیش ویستی لێ نەبووایە نەیدەگرت.

عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ يَوْمًا تَصُومُهُ قُرَيْشٌ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَصُومُهُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ صَامَهُ، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَانُ كَانَ هُوَ الْفَرِيضَةَ، وَتُرِكَ يَوْمُ عَاشُورَاءَ، فَمَنْ شَاءَ صَامَهُ، وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ .

صحيح البخاري | ٢٠٠٢ صحيح مسلم | ٢٦٣٧ سنن أبي داود | ٢٤٤٢ سنن الترمذي | ٧٦٣ سنن الدارمي | ١٧٨٩ الموطأ لمالک | ٦٨٠ مسند

أحمد | ٢٤٠١١ المصنف لعبدرزاق | ٧٩٨٧ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٤٦

**جابر بن سمرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ئەمری کرد بە گرتنی ڕۆژووی عاشوراء، وە هانی دەداین لەسەری، وە ئێمە لە لای یەکتریدا بەڵێنمان لەسەر گرتنی دەدا، بەڵام کاتێک ڕەمەزان فەڕز کرا، ئەوکات ئەمری پێ نەدەکردین لەسەر گرتنی ڕۆژووی عاشوراء، وە ڕێگریشی لێ نەدەکردین، وە ئێمەش لە لای یەکتریدا بەڵێنی گرتنیمان نەدەدا.

عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَأْمُرُنَا بِصِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، وَيَحُثُّنَا عَلَيْهِ، وَيَتَعَاهَدُنَا عِنْدَهُ، فَلَمَّا فُرِضَ رَمَضَانُ، لَمْ يَأْمُرْنَا، وَلَمْ يَنْهَنَا، وَلَمْ يَتَعَاهَدْنَا عِنْدَهُ.

صحيح مسلم | ٢٦٥٢ مسند أحمد | ٢٠٩٠٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٤٧ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٨٢

**أنس بن مالك** رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لە مزگەوت لە دەوری ڕەسول الله ﷺ دانیشتبووین، پیاوێک بە سوار حوشترێکەوە هاتە ژوورەوە، حوشترەکەی بەستەوە، پاشان پێی وتن: کام لە ئێوە محمد ـە؟ ڕەسول الله

ﷺ لە نێوانیاندا لەسەر شان دانیشتبوو وتمان: ئەو پیاوە سپیەیە کە لەسەر لا شانی دایاوە. پیاوەکە وتی: ئەی کوڕی عبدالمطلب، ڕەسول الله ﷺ وتی: « وەڵامتم دایەوە ». پیاوەکە بە ڕەسول الله ـی ﷺ وت: من هەندێک پرسیارت لێدەکەم توندیش دەبم لەسەرت بۆیە لە دڵی مەگرە. فەرمووی: « چ پرسیارێک دەکەی بیکە ». پیاوەکە وتی: سوێندت دەدەم بە ڕەبی تۆ، وە ڕەبی پێش تۆ: ئایا الله تۆی بۆ هەموو خەڵکی ناردووە؟ فەرمووی: « اللهم نعم ». ئەنجا وتی: ئایا الله ئەمری پێکردووی لە ڕۆژ و شەوێکدا پێنج فەرز نوێژ بکەین؟ فەرمووی: « اللهم نعم ». دوای ئەوە وتی: ئایا الله ئەمری پێکردووی کە ڕۆژووی ئەم مانگە بگرین لە ساڵدا؟ فەرمووی: « اللهم نعم ». ئەنجا وتی: ئایا الله ئەمری پێکردووی ئەم زەکاتە لە دەوڵەمەندەکان وەربگریت و دابەشی بکەیتەوە بەسەر فەقیرەکانماندا؟ فەرمووی: « اللهم نعم ». پیاوەکە وتی: ئەوە من باوەڕم هێنا بەوەی هێناوتە، وە من نێردراوی قەومی خۆمم، ضمام بن ثعلبة ـم برای هۆزی سعد بن بکر.

عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: بَيْنَما نَحْنُ جُلُوسٌ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ في الْمَسْجِدِ، دَخَلَ رَجُلٌ عَلَى جَمَلٍ فَأَنَاخَهُ فِي الْمَسْجِدِ،ثُمَّ عَقَلَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ:

أَيُّكُمْ مُحَمَّدٌ؟ وَالنَّبِيُّ ﷺ مُتَّكِئٌ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ فَقُلْنَا: هَذَا الرَّجُلُ الأَبْيَضُ الْمُتَّكِئُ. فَقَالَ لَهُ الرَّجُلُ: ابْنَ عَبْدِالْمُطَّلِبِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ : « قَدْ أَجَبْتُكَ ». فَقَالَ الرَّجُلُ لِلنَّبِيِّ ﷺ: إِنِّي سَائِلُكَ فَمُشَدِّدٌ عَلَيْكَ فِي الْمَسْأَلَةِ، فَلَا تَجِدْ عَلَيَّ فِي نَفْسِكَ، فَقَالَ: « سَلْ عَمَّا بَدَا لَكَ ». فَقَالَ: أَسْأَلُكَ بِرَبِّكَ وَرَبِّ مَنْ قَبْلَكَ: آللَّهُ أَرْسَلَكَ إِلَى النَّاسِ كُلِّهِمْ؟ فَقَالَ: « اللَّهُمَّ نَعَمْ ». قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ نُصَلِّيَ الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ فِي الْيَوْمِ وَاللَّيْلَةِ؟ قَالَ: « اللَّهُمَّ نَعَمْ ». قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ نَصُومَ هَذَا الشَّهْرَ مِنَ السَّنَةِ؟ قَالَ: « اللَّهُمَّ نَعَمْ ». قَالَ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ آللَّهُ أَمَرَكَ أَنْ تَأْخُذَ هَذِهِ الصَّدَقَةَ مِنْ أَغْنِيَائِنَا فَتَقْسِمَهَا عَلَى فُقَرَائِنَا؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ « اللَّهُمَّ نَعَمْ ». فَقَالَ الرَّجُلُ: آمَنْتُ بِمَا جِئْتَ بِهِ، وَأَنَا رَسُولُ مَنْ وَرَائِي مِنْ قَوْمِي، وَأَنَا ضِمَامُ بْنُ ثَعْلَبَةَ أَخُو بَنِي سَعْدِ بْنِ بَكْرٍ.

صحيح البخاري | ٦٣ سنن النسائي | ٢٠٩٢ مسند أحمد | ١٢٧١٩ مسند أبي داود الطيالسي | ٢٤٤٩

**طلحة بن عبيدالله** رضي الله عنه دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی قژ پەشۆکاو هاتە خزمەت ڕەسول الله ﷺ وتی: ئەی ڕەسولی الله هەواڵم بدەرێ الله

ﷻ لە نوێژ چی لەسەر فەڕز کردووم؟ فەرمووی: « لە ڕۆژ و شەوێکدا پێنج فەڕز، ئیللا مەگەر خۆت نوێژی سوننەت بکەی ». ئەنجا وتی: هەواڵم بدەرێ الله ﷻ چی لەسەر فەڕز کردووم لە ڕۆژوو؟ فەرمووی: « مانگی ڕەمەزان، ئیللا مەگەر خۆت ڕۆژووی سوننەت بگری ». ئەنجا وتی: هەواڵم بدەرێ دەربارەی زەکات الله ﷻ چی لەسەر فەڕز کردووم؟ ڕەسول الله ﷺ شەعائرەکانی ئیسلامی بۆ ڕوون کردەوە، پیاوەکە وتی: بەو زاتەی کە تۆی بە حەق ناردووە و ڕێزدار کردووی هیچ سوننەتێک ئەنجام نادەم، وە هیچ یەکێک لە فەڕزکراوەکانی الله کەم ناکەمەوە. ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « ئەگەر ڕاست بکات ئەوە سەرکەوتوو دەبێ، یاخود ئەگەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە ».

عَنْ طَلْحَةَ بْنِ عُبَيْدِالله، أَنَّ أَعْرَابِيًّا جَاءَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ ثَائِرَ الرَّأْسِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ الله، أَخْبِرْنِي مَاذَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصَّلَاةِ؟ فَقَالَ: «**الصَّلَوَاتِ الْخَمْسَ، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ شَيْئًا**». فَقَالَ: أَخْبِرْنِي مَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الصِّيَامِ؟ فَقَالَ: « **شَهْرَ رَمَضَانَ، إِلَّا أَنْ تَطَّوَّعَ شَيْئًا** ». فَقَالَ: أَخْبِرْنِي بِمَا فَرَضَ اللَّهُ عَلَيَّ مِنَ الزَّكَاةِ؟ فَقَالَ: فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ شَرَائِعَ الإِسْلَامِ، قَالَ: وَالَّذِي أَكْرَمَكَ لَا أَتَطَوَّعُ شَيْئًا، وَلَا أَنْقُصُ مِمَّا فَرَضَ

اللَّهُ عَلَيَّ شَيْئًا. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **أَفْلَحَ إِنْ صَدَقَ، أَوْ دَخَلَ الْجَنَّةَ إِنْ صَدَقَ** ».

صحيح البخاري | ١٨٩١ صحيح مسلم | ١٠١ سنن النسائي | ٢٠٩٠ مسند أحمد | ١٣٩٠

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ئەهلی جاهلی ڕۆژی عاشوراء بەڕۆژوو دەبوون، وە ڕەسول الله ﷺ بەڕۆژوو دەبوو موسڵمانەکانیش بەڕۆژوو دەبوون پێش ئەوەی ڕەمەزان فەڕز بکرێ، بەڵام کاتێک ڕەمەزان فەڕز کرا، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « عاشوراء ڕۆژێکە لە ڕۆژەکانی الله، هەرکەسێک ویستی لێ بووایە دەیگرت، هەرکەسیش ویستی لێ نەبووایە نەیدەگرت ».

عَنْ نَافِعٍ، أَخْبَرَنِي عَبْدُاللَّه بْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ أَهْلَ الْجَاهِلِيَّةِ كَانُوا يَصُومُونَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ، وَأَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَامَهُ وَالْمُسْلِمُونَ قَبْلَ أَنْ يُفْتَرَضَ رَمَضَانُ، فَلَمَّا افْتُرِضَ رَمَضَانُ، قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِنَّ عَاشُورَاءَ يَوْمٌ مِنْ أَيَّامِ اللَّه، فَمَنْ شَاءَ، صَامَهُ وَمَنْ شَاءَ تَرَكَهُ** ».

صحيح البخاري | ١٨٩٣ صحيح مسلم | ٢٦٤٢ مسند أحمد | ٤٤٨٣ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٤٥

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ئیسلام پێکهاتووە لە پێنج پایە: شەهادەی لا إله إلا الله محمد رسول الله، نوێژ، زەکات، حەج، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

عَنْ عِكْرِمَةَ بْنِ خَالِدٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **بُنِيَ الْإِسْلَامُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّهِ، وَإِقَامِ الصَّلَاةِ، وَإِيتَاءِ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ** ».

صحيح البخاري | ٨ صحيح مسلم | ١١٤ مسند أحمد | ٦٣٠١



# سابت بوونی ڕەمەزان و جەژن بە بینینی مانگ

دیاری کردنی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژن پەیوەستە بە بینینەوە نەک ئەو حساباتە کە ئێستا پێی دەوترێ فەلەک ناسی، گەڕان بە دوای مانگدا بابەتێکی شەرعییە، ڕەسول الله ﷺ بەو جۆرەی کردووە.

لە ڕوویەکی ترەوە ئەوە بزانن دەرکەوتن و ون بوونی مانگ لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێ، هەروەک چۆن کاتی نوێژەکان و خۆرهەڵهاتن و خۆرئاوا بوون دەگۆڕێ ، بۆیە لە ڕووی شەرعەوە هەموو ناوچەیەک پێویستە تەماشای مانگ بکەن بۆ بینینی، هەرکات بە عەمەلی مانگ لە ناوچەیەک بینرا، ئەوە دەبێ مولزەم بن پێوەی، پێویست ناکات چاوەڕێی مانگی ناوچەیەکی تر بکرێ و خۆیان وابەستەی ئەوان بکەن.

کریب دەڵێ: أم الفضل بنت الحارث بۆ ئیشێک ناردمی بۆ شام بۆ لای معاوية رضي الله عنه، گەیشتمە شام ئیشەکەم تەواو کرد مانگی ڕەمەزان هات بەسەرمدا کاتێک لەوێ بووم، شەوی جمعە مانگم بینی، پاشان لە کۆتایی مانگدا هاتمەوە بۆ مەدینە، عبدالله بن عباس رضي الله عنهما پرسیاری لێ کردم پاشان باسی مانگی کرد، وتی: کەی مانگتان بینی؟

وتم: شەوی جمعە بینیمان، وتی: تۆ بینیت؟ وتم: بەڵێ، هەروەها خەڵکیش بینی و بەڕۆژوو بوون، وە معاویة ـش بەڕۆژوو بوو، وتی: بەڵام ئێمە شەوی شەممە بینیمان، بەڕۆژوو دەبین هەتا دەیکەین بە سی یاخود مانگ دەبینین، وتم: ئەی بینینی معاویة بەس نییە بۆمان؟ وتی: نەخێر، ڕەسول الله ﷺ بەو جۆرە ئەمری پێکردین.

عَنْ كُرَيْبٍ، أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ بِالشَّامِ، قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ، فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا، وَاسْتُهِلَّ عَلَيَّ رَمَضَانُ، وَأَنَا بِالشَّامِ، فَرَأَيْتُ الْهِلَالَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ، فَسَأَلَنِي عَبْدُاللَّه بْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، ثُمَّ ذَكَرَ الْهِلَالَ، فَقَالَ: مَتَى رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ؟ فَقُلْتُ: رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، فَقَالَ: أَنْتَ رَأَيْتَهُ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، وَرَآهُ النَّاسُ وَصَامُوا، وَصَامَ مُعَاوِيَةُ، فَقَالَ: لَكِنَّا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ، فَلَا نَزَالُ نَصُومُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلَاثِينَ، أَوْ نَرَاهُ، فَقُلْتُ: أَوَلَا تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ؟ فَقَالَ : لَا، هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ الله ﷺ.

صحيح مسلم | ٢٥٢٨ سنن أبي داود | ٢٣٣٢ سنن الترمذي | ٧٠٢ سنن النسائي | ٢١١١ مسند أحمد | ٢٧٨٩ صحيح ابن خزيمة | ١٩١٦

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: وە عەمەل کردن بەم حدیثە لای ئەهلی عیلم بەو جۆرەیە کە ئەهلی هەر شارێک بینینی خۆیان هەیە و بەپێی ئەو بینینەی مانگ لە ناوچەکەیان ڕۆژوو دەگرن.

**وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا الْحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ أَنَّ لِكُلِّ أَهْلِ بَلَدٍ رُؤْيَتَهُمْ.**

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: مانگ بیست و نۆ شەوە، بەڕۆژوو مەبن هەتا مانگ دەبینن، ئەگەر مانگتان بۆ نەبینرا، ئەوە مانگی شەعبان بکەنە سی ڕۆژ.

عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ : « **الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ لَيْلَةً، فَلَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا الْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ** ».

صحيح البخاري ا ١٩٠٧ صحيح مسلم ا ٢٥٠٥ الموطأ لمالک ا ٦٤٧ مسند أحمد ا ٤٤٨٨ كتاب الأم للشافعي ا ٩٠٧ مسند الشافعي ا ٣٧١

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ سوێندی خوارد مانگێک نەچێتە لای خێزانەکانی، ماوەی بیست و نۆ ڕۆژ وابوو، پێم وت: مەگەر تۆ سوێندت نەخوارد بوو مانگێک تێکەڵیان نەکەیت و جیابی لێیان،

ڕۆژەکانم ژماردووە بیست و نۆ ڕۆژە؟ ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « مانگ بیست و نۆ ڕۆژە ».

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا قَالَتْ: أَقْسَمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ لَا يَدْخُلَ عَلَى نِسَائِهِ شَهْرًا، فَلَبِثَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، فَقُلْتُ: أَلَيْسَ قَدْ كُنْتَ آلَيْتَ شَهْرًا، فَعَدَدْتُ الْأَيَّامَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ** ».

صحيح مسلم | ٢٥٢٠ سنن النسائي | ٢١٣١ مسند أحمد | ٢٤٠٥٠

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: «جبریل علیه السلام هات بۆ لام، وتی: مانگ بیست و نۆ ڕۆژە».

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: « **أَتَانِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ، فَقَالَ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ يَوْمًا** ».

سنن النسائي | ٢١٣٣ مسند أحمد | ١٨٨٥

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ڕۆژوو مەگرن هەتا مانگ نەبینن، وە مەیکەنە جەژن هەتا مانگ نەبینن، ئەگەر مانگتان بۆ نەبینرا، ئەوە مانگی شەعبان بکەنە سی ڕۆژ.

عَنْ عَبْدِاللَّه بْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ ذَكَرَ رَمَضَانَ، فَقَالَ: « **لَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلَالَ، وَلَا تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا الْعَدَدَ ثَلَاثِينَ** »

الموطأ لمالك ا ٦٤٨ سنن الترمذي ا ٦٩٦

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر مانگتان بینی بەڕۆژوو بن، وە ئەگەریش مانگتان بینی بیکەنە جەژن، ئەگەر مانگتان بۆ نەبینرا، ئەوە سی ڕۆژ بەڕۆژوو بن.

عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِذَا رَأَيْتُمُ الْهِلَالَ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَصُومُوا ثَلَاثِينَ يَوْمًا** ».

صحيح مسلم ا ٢٥١٤ سنن ابن ماجه ا ١٦٥٤ سنن النسائي ا ٢١١٩

مسند أحمد | ٧٥٨١ مسند إسحاق بن راهوية | ٤٨٨ المصنف لعبدرزاق | ٧٤٣٣ المصنف لابن أبي شيبة | ٩١١٥ سنن الدارقطني كتاب الصيام | ١٩

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموويەتی: بەڕۆژوو بن بە بینینی مانگ، وە بیکەن بە جەژن بە بینینی مانگ، ئەگەر مانگتان بۆ نەبینرا ئەوە مانگی شەعبان بکەنە سی ڕۆژ.

عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ زِيَادٍ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ : « **صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ، وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ، فَإِنْ غُبِّيَ عَلَيْكُمْ فَأَكْمِلُوا عِدَّةَ شَعْبَانَ ثَلاَثِينَ** ».

صحيح البخاري | ١٩٠٩ صحيح مسلم | ٢٥١٦ سنن النسائي | ٢١١٧ سنن الدارمي | ١٧١١ مسند أحمد | ٩٥٥٦ مسند إسحاق بن راهوية | ٥٤ مسند أبي داود الطيالسي | ٢٦٠٣

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: «ئێمە ئوممەتێکی نەخوێندەوارین، نانوسین و حساب ناکەین، مانگ بەو شێوەیە و بەو شێوەیە». واتە جارێک بیست و نۆ، وە جارێک سی.

حَدَّثنَا شُعْبَةُ، حَدَّثنَا الْأَسْوَدُ بْنُ قَيْسٍ، حَدَّثنَا سَعِيدُ بْنُ عَمْرٍو، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: « **إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ، لَا نَكْتُبُ وَلَا نَحْسُبُ. الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا** ». يَعْنِي مَرَّةً تِسْعَةً وَعِشْرِينَ، وَمَرَّةً ثَلَاثِينَ.

صحيح البخاري | ١٩١٣ صحيح مسلم | ٢٥١١ سنن أبي داود | ٢٣١٩ سنن النسائي | ٢١٤١ مسند أحمد | ٥٠١٧ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٩٤

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « ئێمە ئوممەتێکی نەخوێندەوارین، نانوسین و حساب ناکەین، مانگ بەو شێوەیە و بەو شێوەیە ». سێ جار بە پەنجەکانی دەستی ئیشارەتی کرد، پاشان یەک پەنجەی لا برد و کەم کردەوە.

حَدَّثنَا عَبِيدَةَ بْنُ حُمَيدٍ، عَنِ الْأَسْوَدُ بْنُ قَيْسٍ، عَنْ سَعِيدُ بْنُ عَمْرٍو، أَنَّ عَبْدَاللهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا حَدَّثَهُمْ، أَنَّ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: « **إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ، لَا نَكْتُبُ وَلَا نَحْسُبُ الشَّهْرُ كَذَا وَكَذَا** ». وَضَرَبَ بِيَدِهِ ثَلَاثًا، ثُمَّ نَقَصَ وَاحِدَةً.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٩٧

**حذيفة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: پێش مانگی ڕەمەزان مەکەون هەتا مانگ نەبینن یاخود شەعبان بە تەواوی بکەنە سی، پاشان ڕۆژوو بگرن هەتا مانگ دەبینن یاخود سی تەواو بکەن.

عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **لَا تُقَدِّمُوا الشَّهْرَ حَتَّى تَرَوُا الْهِلَالَ أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ، ثُمَّ صُومُوا حَتَّى تَرَوُا الْهِلَالَ أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ** ».

سنن أبي داود | ٢٣٢٦ سنن النسائي | ٢١٢٦

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: لەگەڵ ڕەسول الله ـدا ﷺ زیاتر بیست و نۆ بەڕۆژوو دەبووین هەتا سی.

عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: لَمَا صُمْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ تِسْعًا وَعِشْرِينَ أَكْثَرُ مِمَّا صُمْنَا مَعَهُ ثَلَاثِينَ.

سنن أبي داود | ٢٣٢٢ سنن الترمذي | ٦٩٧ مسند أحمد | ٤٣٠٠ صحيح ابن خزيمة | ١٩٢٢

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: لە سەردەمی ڕەسول الله ـدا ﷺ زیاتر بیست و نۆ بەڕۆژوو دەبووین هەتا سی.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: مَا صُمْنَا عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ تِسْعًا وَعِشْرِينَ أَكْثَرَ مِمَّا صُمْنَا ثَلَاثِينَ.

سنن ابن ماجه | ١٦٥٨

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: پێش مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ ڕۆژوو مەگرن، ئیللا مەگەر ڕۆژوویەک بێ کەسەکە عادەتی بێ پێشتریش گرتبێتی، ڕۆژوو مەگرن هەتا مانگ دەبینن، پاشان مەیشکێنن هەتا مانگ دەبینن، ئەگەر هاتوو هەور بوویە بەربەست لە نێوان بینینی مانگ، ئەوە سی تەواو بکەن، پاشان بیکەن بە جەژن، وە مانگ بیست و نۆ ڕۆژە.

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **لَا تُقَدِّمُوا الشَّهْرَ بِصِيَامِ يَوْمٍ وَلَا يَوْمَيْنِ، إِلَّا أَنْ يَكُونَ شَيْءٌ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ، وَلَا تَصُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، ثُمَّ صُومُوا حَتَّى تَرَوْهُ، فَإِنْ حَالَ دُونَهُ غَمَامَةٌ فَأَتِمُّوا الْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ، ثُمَّ أَفْطِرُوا، وَالشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشْرُونَ** ».

سنن أبي داود | ٢٣٢٨ سنن الترمذي | ٦٩٦ مسند أحمد | ٢٣٣٥

أبي بكرة رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله فەرموویەتی: دوو مانگی جەژن ناقص نابن واتە بیست و نۆ: ڕەمەزان و ذو الحجة.

عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «شَهْرَا عِيدٍ لَا يَنْقُصَانِ: رَمَضَانُ وَذُو الْحِجَّةِ».

صحيح البخاري ا ١٩١٢ صحيح مسلم ا ٢٥٣١ سنن أبي داود ا ٢٣٢٣ سنن الترمذي ا ٧٠١ سنن ابن ماجه ا ١٦٥٩ مسند أحمد ا ٢٠٣٩٩

الترمذي دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: أحمد لە مانای ئەم حدیثە: « شَهْرَا عِيدٍ لَا يَنْقُصَانِ ». دەڵێ: مانگی ڕەمەزان و ذو الحجة هەردووکیان پێکەوە ناقص نابن لە یەک ساڵدا، ئەگەر یەکێکیان ناقص بێ ئەویتریان تەواو دەبێ سی ڕۆژ. وە إسحاق بن راهوية دەڵێ: « لَا يَنْقُصَانِ ». واتە: ئەگەر بیست و نۆش بێ ئەوە کامڵ و تەواوە ناقص نییە. لەسەر مەزهەبی إسحاق دەکرێ هەردوو مانگەکە لە ساڵێکدا ناقص بن واتە بیست و نۆ.

قَالَ أَحْمَدُ: مَعْنَى هَذَا الْحَدِيث: « شَهْرَا عِيدٍ لَا يَنْقُصَانِ ». يَقُولُ: لَا يَنْقُصَانِ مَعًا فِي سَنَةٍ وَاحِدَةٍ شَهْرُ رَمَضَانَ وَذُو الْحِجَّةِ، إِنْ نَقَصَ أَحَدُهُمَا تَمَّ

الْآخَرُ. وَقَالَ إِسْحَاقُ: مَعْنَاهُ: « لَا يَنْقُصَانِ ». يَقُولُ: وَإِنْ كَانَ تِسْعًا وَعِشْرِينَ فَهُوَ تَمَامٌ غَيْرُ نُقْصَانٍ. وَعَلَى مَذْهَبِ إِسْحَاقَ يَكُونُ يَنْقُصُ الشَّهْرَانِ مَعًا فِي سَنَةٍ وَاحِدَةٍ.

**ربعي بن خراش** لە یەکێک لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ ڕیوایەت دەکات دەڵێ: خەڵکی خیلافیان هەبوو لە کۆتا ڕۆژی ڕەمەزان، پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای ڕەسول الله ﷺ بە الله سوێندی خوارد کە ئێوارە مانگی بینیوە، ڕەسول الله ﷺ ئەمری بە خەڵکی کرد بیکەن بە جەژن.

عَنْ رِبْعِيِّ بْنِ حِرَاشٍ، عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: اخْتَلَفَ النَّاسُ فِي آخِرِ يَوْمٍ مِنْ رَمَضَانَ، فَقَدِمَ أَعْرَابِيَّانِ فَشَهِدَا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ بِاللهِ لَأَهَلَّا الْهِلَالَ أَمْسِ عَشِيَّةً، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ النَّاسَ أَنْ يُفْطِرُوا.

سنن أبي داود | ٢٣٣٩ مسند أحمد | ٢٣٠٦٩ سنن الدارقطني باب الشهادة على رؤية الهلال | ١٢

**الترمذي** دوای ڕیوایەتی حدیثی ژمارە «٦٩٩» لە سونەنەکەیدا دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای زۆربەی ئەهلی عیلم دەڵێن: شاهێدی دانی یەک کەس لە بینینی مانگی ڕەمەزان مەقبولە. ئەمە قەولی عبدالله

بن المبارک و شافعي و أحمد و ئەهلی کوفەیە. إسحاق بن راهوية دەڵێ: ڕۆژوو ناگیررێ ئیللا بە شاهێدی دانی دوو پیاو نەبێ. ئەمما بۆ جەژن ئەوە ئەهلی عیلم خیلاف نییە لە نێوانیاندا قەولی تێدا مەقبول نییە بە شەهادەی دوو پیاو نەبێ.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا الْحَدِيثِ عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ قَالُوا: تُقْبَلُ شَهَادَةُ رَجُلٍ وَاحِدٍ فِي الصِّيَامِ. وَبِهِ يَقُولُ ابْنُ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَأَهْلُ الْكُوفَةِ. قَالَ إِسْحَاقُ: لَا يُصَامُ إِلَّا بِشَهَادَةِ رَجُلَيْنِ. وَلَمْ يَخْتَلِفْ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي الْإِفْطَارِ أَنَّهُ لَا يُقْبَلُ فِيهِ إِلَّا شَهَادَةُ رَجُلَيْنِ.

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی بینینی مانگ ئەگەر یەک پیاو شاهێدی بدات بینیویەتی؟ وتی: ئیمام ئەمر دەکات بە خەڵکی بەڕۆژوو بن.

وتم: ئەگەر یەک پیاو شاهێدی بدات کە مانگی جەژنی بینیوە؟ وتی: نەخێر، دەبێ دوو پیاو شاهێدی بدەن، ئەمما یەک پیاو ئەوە نەخێر.

سألت أبي عَن رؤية الهلال إذا شَهِدَ على رؤيته رجل واحد؟ قال: يأمر الإمام بالناس بالصيام.

قلتُ: فإن شَهِدَ على رؤية الهلال رجل واحد في الإفطار؟ قال: لا، حتى يكونا رجلين يشهدان، فإما رجل واحد فلا.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد ا ٦٦٤

**إسحاق بن منصور الكوسج** دەڵێ: بە أحمد بن حنبل ـم وت: هەرکەسێک خۆی بە تەنها مانگی ڕەمەزان ببینێ بەڕۆژوو دەبێ؟ وە هەرکەسێک خۆی بە تەنها مانگی شەوال ببینێ دەیکاتە جەژن؟ وتی: بەڕۆژوو دەبێ، بەڵام نایکاتە جەژن.

**إسحاق بن راهوية** دەڵێ: نە بەڕۆژوو دەبێ نە دەیکاتە جەژن، لەبەرئەوەی ڕۆژوو لەگەڵ جەماعە و کۆمەڵدایە.

قلت لأحمد بن محمد بن حنبل: مَن رأى هلال رمضان وَحدَه أَيَصوم وَمَن رأى هلال شَوال وَحدَه أَيَفطر؟ قال: يَصوم وَلا يفطر.

قال إسحاق: لا يصوم ولا يفطر، لأَنَّ الصَّوم مع الجماعة.

مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية الكوسج ا ٧٤٧

**إسحاق بن منصور الكوسج** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أحمد بن حنبل: وتم شاهێدی پیاوێک دەربارەی بینینی مانگی ڕەمەزان و شەوال؟ وتی: ئەمما شەوال ئەوە مەقبول نییە، بەڵام بۆ ڕەمەزان شاهێدی یەک پیاو دروستە و مەقبولە.

**إسحاق بن راهوية** دەڵێ: بۆ ڕۆژووش دەبێ دوو کەسی عادل شاهێدی بدەن وەک جەژنی ڕەمەزان و قوربان.

قلت، يجوز شهادة رجل على رؤية الهلال لرمضان أو الشَوال؟ قال: أمَّا الشَوال فلا، ولكن لرمضان تجوز شهادة رَجُلٍ واحد .

قال إسحاق: لا يجوز في الصَّوم حتى يشهد عدلان كالفطر والأضحى.

مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية الكوسج | ٧٦٠

**هشام بن حسان** دەڵێ: حسن البصري دەربارەی پیاوێک خۆی بە تەنها پێش خەڵکی مانگ دەبینێ، وتی: ڕۆژوو ناگرێ ئیللا لەگەڵ خەڵکی نەبێ، وە ناکرێتە جەژن ئیللا لەگەڵ خەڵکی نەبێ.

حَدَّثَنَا أبو أُسامة، عَن هِشامٍ، عَنِ الحَسنِ، أنَّه كانَ يقولُ في الرَّجُلِ يرى الهِلال وَحده قَبلَ النَّاسِ، قال: لا يَصومُ إلَّا مع النَّاس، ولا يُفطِرُ إلَّا مع النَّاس.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٦١

**الأشعث** دەڵێ: حسن البصري دەربارەی پیاوێک خۆی بە تەنها مانگ دەبینێ، وتی: لای بۆ ناکرێتەوە.

حَدَّثَنَا الضَّحاک، عَنِ الأشعثَ، عَنِ الحَسنِ في الرَّجُلِ شَهِدَ على رؤيةِ الهِلال وَحده، قال: لا يُلتَفَتُ إليه.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٦٢



# فەزڵ و گەورەیی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

أبي هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: پێنج فەڕزەی نوێژەکان، جمعة بۆ جمعة، ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان کەفارەتی تاوانەکانی ئەو نێوانەن بە مەرجێک تاوانی گەورەی ئەنجام نەدابێ.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ الله ﷺ كَانَ يَقُولُ: « الصَّلَوَاتُ الْخَمْسُ، وَالْجُمْعَةُ إِلَى الْجُمْعَةِ، وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ مَا بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتَنَبَ الْكَبَائِرَ ».

صحيح مسلم | ٥٥٠ مسند أحمد | ٩١٩٧

أبي هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک ڕەمەزان بەڕۆژوو بوو، وە باوەڕی پێی هەبێ و چاوەڕێی پاداشتەکەی بکات، ئەوە الله ﷻ لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێ، وە هەرکەسێک شەوانی قەدر بە شەو نوێژ زیندوو بکاتەوە، وە باوەڕی پێی هەبێ و چاوەڕێی پاداشتەکەی بێ، ئەوە الله ﷻ لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێ.

عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « **مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَاباً، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ، وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ** ».

صحيح البخاري | ٢٠١٤ صحيح مسلم | ١٧٨١ سنن أبي داود | ١٣٧٢ سنن الترمذي | ٦٩٠ سنن النسائي | ٢٢٠٦ سنن ابن ماجه | ١٦٤١ سنن الدارمي | ١٨٠٢ مسند أحمد | ٧٢٨٠ مسند أبي داود الطيالسي | ٢٤٨١ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٦٥ مسند الحميدي | ٩٨٠ سنن سعيد بن منصور | ٥٤٦٤ صحيح ابن خزيمة | ١٨٩٤

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: هەرکەسێک شەوانی ڕەمەزان بە شەو نوێژ زیندوو بکاتەوە، وە باوەڕی پێی هەبێ و چاوەڕێی پاداشتەکەی بێ، ئەوە الله ﷻ لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێ.

عَنْ حُمَيْدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: «**مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ**».

صحيح البخاري | ٣٧ صحيح مسلم | ١٧٧٩ سنن النسائي | ٢١٩٧ مسند أحمد | ١٠٣٠٤

**أبو أمامة** رضي الله عنه دەڵێ: هاتمە خزمەت ڕەسول الله ﷺ پێم وت: ئەمرم پێبکە و شتێکم پێ بڵێ هەتا لێتی وەربگرم. فەرمووی: « دەست بگرە بە ڕۆژووەوە، چونکە نمونەی نییە ».

عَنْ أَبِي أُمَامَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: أَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَقُلْتُ: مُرْنِي بِأَمْرٍ آخُذُهُ عَنْكَ. قَالَ: « **عَلَيْكَ بِالصَّوْمِ، فَإِنَّهُ لَا مِثْلَ لَهُ** ».

سنن النسائي | ٢٢٢٠ مسند أحمد | ٢٢١٤١ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٨٦ صحيح ابن خزيمة | ١٨٩٣

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: کە ڕەمەزان هات، دەرگاکانی ڕەحمەت دەکرێنەوە، وە دەرگاکانی جەهەنەم دادەخرێن، وە شەیتانەکان زنجیر دەکرێن.

عَنْ يُونُسٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنِ ابْنِ أَبِي أَنَسٍ، أَنَّ أَبَاهُ حَدَّثَهُ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِذَا كَانَ رَمَضَانُ، فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الرَّحْمَةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ جَهَنَّمَ، وَسُلْسِلَتِ الشَّيَاطِينُ** ».

صحيح البخاري | ١٨٩٩ صحيح مسلم | ٢٤٩٦ سنن النسائي | ٢٠٩٩ مسند أحمد | ٩٢٠٤ المصنف لعبدرزاق | ٧٥١٥ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٥٩

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: هەرکات ڕەمەزان هات، دەرگاکانی بەهەشت دەکرێنەوە، وە دەرگاکانی ئاگر دادەخرێن، وە شەیتانەکان زنجیر دەکرێن.

عَنْ أَبِي سُهَيْلٍ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: «**إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ، فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ، وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النَّارِ، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ**».

صحيح مسلم | ٢٤٩٥ سنن النسائي | ٢٠٩٧ سنن الدارمي | ١٨٠١ صحيح ابن خزيمة | ١٨٨٢



# نییەت هێنانی ڕۆژوو

ئەصڵ لە نییەتی ڕۆژوو ئەوەیە دەبێ پێش فەجر واتە بانگی بەیانی نییەتت هەبێ بەڕۆژوو بیت، ئەمە بە نیسبەت ڕۆژووی فەرزەوە، ئەمما ڕۆژووی سوننەت ئەوە پێویستی بە نییەتی شەو نییە، بەڵکو ڕۆژ بوویەوە ئەگەر ئینسان ویستی ڕۆژوو بگرێ ئەوە دەتوانێ، بۆ نمونە بەیانی ڕۆژی لێدەبێتەوە هیچ خواردنێکی دەست ناکەوێ بیخوات، ئەوکات دەتوانێ نییەتی ڕۆژووی لێ بهێنێ و هیچ کێشەی تێدا نییە و ڕۆژووەکەی دروست و مەقبولە.

**حفصة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک بە شەودا هەتا پێش فەجر نییەتی نەبووبێ بەڕۆژوو بێ، ئەوە ڕۆژووەکەی بۆ حسێب نییە.

عَنْ يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، عَنْ عَبْدِاللَّه بْنِ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَزْمٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِاللَّه، عَنْ أَبِيهِ عَنْ حَفْصَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: « **مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ فَلَا صِيَامَ لَهُ** ».

سنن أبي داود | ٢٤٥٤ سنن الترمذي | ٧٣٩ سنن النسائي | ٢٣٣١ سنن ابن ماجه | ١٧٠١ سنن الدارمي | ١٧٢٤ الموطأ لمالک | ٦٥١ مسند أحمد | ٢٤٢٢٠ سنن الدارقطني تبييت النية من الليل وغيره | ٣

ئەم حدیثە ئەصڵ لێی مەوقوفە لەسەر دایە حفصة.

**أبي داود** دوای ڕیوایەت کردنی دەڵێ: الليث و إسحاق بن حازم هەردووکیان ڕیوایەتیان کردووە لە عبدالله بن أبي بكر ابن حزم ـەوە وەک ئەم ڕیوایەتەی پێشوو، وە هەریەک لە معمر و الزبيدي و سفيان بن عيينة و يونس الأيلي لە الزهري ـیەوە بە مەوقوفی ڕیوایەتیان کردووە.

رَوَاهُ اللَّيْثُ وَإِسْحَاقُ بْنُ حَازِمٍ أَيْضًا، جَمِيعًا عَنْ عَبْدِاللَّه بْنِ أَبِي بَكْرٍ مِثْلَهُ، وَوَقَفَهُ عَلَى حَفْصَةَ: مَعْمَرٌ وَالزُّبَيْدِيُّ وَابْنُ عُيَيْنَةَ وَيُونُسُ الْأَيْلِيُّ، كُلُّهُمْ عَنِ الزُّهْرِيِّ.

وە **الترمذي** ـش پاش ڕیوایەت کردنی دەڵێ: حديثي حفصة بێجگە لەم وەجهە لە هیچ ڕێگایەکی ترەوە نازانین بە مەرفوعی ڕیوایەت کرا بێ .

وە نافع لە إبن عمر ـەوە ڕیوایەتی کردووە ئەوەیان صەحیح ترە، وە هەروەها بە مەوقوفیش لە ڕێگەی الزهري ـیەوە ڕیوایەت کراوە. وە

نازانین هیچ کەسێک هەبێ بە مەڕفوعی ڕیوایەتی کرد بێ بێجگە لە یحیی بن أیوب، وە ماناکەی لای هەندێک لە ئەهلی عیلم ئەوەیە: ئەو کەسەی لە شەودا نییەت نەهێنێ هەتا پێش دەرکەوتنی فەجر لە ڕەمەزاندا ئەوە ڕۆژووی بۆ نییە، وە هەروەها بۆ ڕۆژووی نەزریش دەبێ شەو نییەتی هەبێ، ئەمما بۆ ڕۆژووی سوننەت ئەوە ڕێ پێدراوە دوای ڕۆژ بوونەوە نییەت بهێنێ ئەمە قەولی شافعی و أحمد و إسحاق بن راهوية ـشە.

حَدِيثُ حَفْصَةَ حَدِيثٌ لَا نَعْرِفُهُ مَرْفُوعًا إِلَّا مِنْ هَذَا الْوَجْهِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَوْلُهُ وَهُوَ أَصَحُّ، وَهَكَذَا أَيْضًا رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ عَنِ الزُّهْرِيِّ مَوْقُوفًا. وَلَا نَعْلَمُ أَحَدًا رَفَعَهُ إِلَّا يَحْيَى بْنُ أَيُّوبَ، وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ: لَا صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ طُلُوعِ الْفَجْرِ فِي رَمَضَانَ، أَوْ فِي قَضَاءِ رَمَضَانَ، أَوْ فِي صِيَامِ نَذْرٍ إِذَا لَمْ يَنْوِهِ مِنَ اللَّيْلِ لَمْ يُجْزِهِ. وَأَمَّا صِيَامُ التَّطَوُّعِ فَمُبَاحٌ لَهُ أَنْ يَنْوِيَهُ بَعْدَمَا أَصْبَحَ وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ .

هەروەک چۆن أبي داود و الترمذي وتیان ڕیوایەتەکە بە مەوقوفی لە قەولی دایە حفصة رضي الله عنها سابت بووە، ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لە ڕێگاکانی ڕیوایەتەکە.

**حفصة** رضي الله عنها دەڵێ: هەرکەسێک پێش فەجر نییەتی نەبووبێ بەڕۆژوو بێ ئەوە ڕۆژووەکەی بۆ حسێب نییە.

أَخْبَرَنِي زَكَرِيَّا بْنُ يَحْيَى، قَالَ: حَدَّثَنَا الْحَسَنُ بْنُ عِيسَى، قَالَ: أَنْبَأَنَا ابْنُ الْمُبَارَكِ، قَالَ: أَنْبَأَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِاللَّه، عَنْ عَبْدِاللَّه بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لاَ صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعْ قَبْلَ الْفَجْرِ.

سنن النسائي | ٢٣٣٧

أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ حَاتِمٍ، قَالَ: أَنْبَأَنَا حِبَّانُ، قَالَ: أَنْبَأَنَا عَبْدُاللَّه، عَنْ سُفْيَانَ بْنِ عُيَيْنَةَ وَمَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِاللَّه بْنِ عُمَرَ، عَنْ أَبِيه، عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لاَ صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ.

سنن النسائي | ٢٣٣٨

أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَرْبٍ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَبْدِ اللَّه، عَنْ حَفْصَةَ رضي الله عنها قَالَتْ: لاَ صِيَامَ لِمَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ.

سنن النسائي | ٢٣٤٠

ئەم ڕیوایەتە **النسائي** لە سنن الكبرى ـش بە ژمارە «٢٦٦١» هێناویەتی، دوای ڕیوایەت کردنی دەڵێ: ئەوەی دروستە لامان مەوقوفە، وە سابت نەبووە بە مەرفوعی، لەبەرئەوەی یحیى بن أیوب هێندە بەهێز نییە، وە حدیثی ابن جریج لە الزهري ـەوە مەحفوظ نییە.

الصواب عندنا موقوف، ولم يصح رفعه، لأن يحيى بن أيوب ليس بذاك القوي، وحديث ابن جريج عن الزهري غير محفوظ.

مەبەستی لە ڕیوایەتی ابن جریج لە الزهري ـیەوە ئەم ڕیوایەتەیە: أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ الْأَزْهَرِ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ سَالِمٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ حَفْصَةَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: « **مَنْ لَمْ يُبَيِّتِ الصِّيَامَ مِنَ اللَّيْلِ فَلَا صِيَامَ لَهُ** ».

سنن النسائي | ٢٣٣٤

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: بەڕۆژوو نابێ و ڕۆژووەکەی بۆ حسێب ناکرێ ئەو کەسەی کە بە شەودا هەتا فەجر نییەتی ڕۆژوو گرتنی نەبووە.

عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: لَا يَصُومُ إِلَّا مَنْ أَجْمَعَ الصِّيَامَ قَبْلَ الْفَجْرِ.

الموطأ لمالك | ٦٥٠ سنن النسائي | ٢٣٤٣ كتاب الأم للشافعي | ٩١٠

**شافعي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم خەبەرە دەڵێ: ئەمە بە تایبەتی بۆ مانگی ڕەمەزانە، هەروەها بۆ ئەو کەسەشی نەزری لەسەر خۆی واجب کردبێ، یاخود ڕۆژووی واجبی لە گەردنە، ئەمما سوننەت ئەوە کێشەی نییە پێش کاتی نوێژی نیوەڕۆش نییەت بێنێ مادام نزیکی خواردن و خواردنەوە نەکەوتووە.

قالَ الشَّافعي: فكانَ هذا على شهر رمضان خاصَة، وعلى ما أوجَبَ المرء على نفسه مِن نَذر، أو وَجَبَ عليه مِن صَوم، فأمَّا التَطوع فلا بأسَ أن ينوى الصّوم قبل الزوال، ما لم يأكل، ولم يشرب.

كتاب الأم للشافعي | **(٦٤٦/١)**

هەروەها دەڵێ: ئەوەی لەسەر ئەو کەسەیە کە ڕۆژووی سوننەت دەگرێ جیاوازە لەسەر ئەو کەسەی کە ڕۆژووی ڕەمەزان دەگرێ، وە غەیری ئەوانیش وەک ئەوانەی ڕۆژووی واجبیان لە گەردنە، بە لای منەوە

ڕۆژوویان بۆ حسێب ناکرێ ئەگەر بە شەودا هەتا پێش کاتی نوێژی بەیانی نییەتیان نەبووبێ، وە ئەوەی ڕۆژووی سوننەت دەگرێ هەتا نزیکی خواردن و خواردنەوە نەکەوتبێ ئەوە ڕۆژیش ببێتەوە ڕۆژەکەی کێشەی نییە.

قالَ الشَّافعي: والمتطوعُ بالصَّومِ مُخالف لِلذي عليه الصومِ مِن شهرِ رمضان، وغيره الذين يجب عليهم الصوم، لا يجزيهم عندي إلا جماع الصوم قبل الفجر، والذي يتطوعُ بالصَّومِ ما لم يأكل ولم يشرب وإن أصبح يجزيه الصَّوم.

كتاب الأم للشافعي | **(٦٥٧/١)**

**إسحاق بن منصور الكوسج** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی قەولی: « لَا صِيَامَ لِمَن لَم يَجمَع الصِّيَامَ مِنَ اللَّيلَ »؟وتی: ئەمە بە لای منەوە بۆ ڕۆژووی ڕەمەزانە.

إسحاق بن راهوية دەڵێ: بەو جۆرەیە کە وتی، وە شمولی هەموو ڕۆژوویەکی واجب دەکات نەزر بێ یاخود قەرز.

قلت: قوله « لَا صِيَامَ لِمَن لَم يَجمَع الصِّيَامَ مِنَ اللَّيلَ »؟ قال: هذا عندي على رمضان.

قال إسحاق: كما قال وَكُل واجب نذرًا أو قضاء.

مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية الكوسج | ٧٧٩

**سلمة بن الأكوع** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ڕۆژی عاشوراء پیاوێکی نارد هەتا لە ناو خەڵکیدا جاڕ بدات: هەرکەسێک خواردنی خواردووە ئەوە با پاشماوەی ڕۆژەکە دەست بگرێتەوە و بەڕۆژوو بێ، ئەوەشی هیچی نەخواردووە ئەوە با هیچ نەخوات و بەڕۆژوو بێ.

عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ بَعَثَ رَجُلًا يُنَادِي فِي النَّاسِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ: أَنَّ مَنْ أَكَلَ فَلْيُتِمَّ أَوْ فَلْيَصُمْ، وَمَنْ لَمْ يَأْكُلْ فَلَا يَأْكُلْ.

صحيح البخاري | ١٩٢٤ صحيح مسلم | ٢٦٦٨ سنن النسائي | ٢٣٢١ مسند أحمد | ١٦٥٠٧

**ربيع بنت معوذ** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول ﷺ بەیانی ڕۆژی عاشوراء کەسێکی نارد بۆ لادێکانی ئەنصار لە دەوروبەری مەدینە: «هەرکەسێک ڕۆژی لێبووەتەوە هیچی نەخواردووە، ئەوە با درێژە بە

ڕۆژووەكەی بدات، ئەو كەسەشی خواردنی خواردووە، ئەوە با درێژەی ڕۆژەكە هیچ نەخوات».

عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ الَّتِي حَوْلَ الْمَدِينَةِ: «**مَنْ كَانَ أَصْبَحَ صَائِمًا، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، وَمَنْ كَانَ أَصْبَحَ مُفْطِرًا، فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ**».

صحيح البخاري ١٩٦٠ | صحيح مسلم ٢٦٦٩ | مسند أحمد ٢٧٠٢٥

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ڕۆژێک پێی وتم: « ئەی عائشة هیچ شتێک هەیە بیخۆم؟ ». وتم: نەخێر هیچمان نییە. فەرمووی: «من بەڕۆژووم». ڕەسول الله ﷺ چووە دەرەوە، دواتر هەدیەیەكیان بۆ هێناین، كاتێک ڕەسول الله ﷺ هاتەوە وتم: ئەی ڕەسولی الله ﷺ هەدیەیەكیان بۆ هێناوین، منیش تۆزێكم بۆ هەڵگرتووی، فەرمووی : «چییە؟». وتم: حەیسە. فەرمووی: « ئا بیهێنە ». هێنام خواردی، دواتر وتی: « كە ڕۆژ بوویەوە بەڕۆژوو بووم ». طلحة دەڵێ: ئەم حدیثەم بۆ مجاهد گێڕایەوە، ئەویش وتی: نمونەی نییەتی ڕۆژووی سوننەت وەک

پیاوێک وایە دەیەوێ هەندێک لە پارەکەی بکاتە خێر، ئەگەر بیەوێ دەیبەخشێ، وە ئەگەریش نەیەوێ نایبەخشێ.

حَدَّثَنَا طَلْحَةُ بْنُ يَحْيَى بْنِ عُبَيْدِاللَّه، حَدَّثَتْنِي عَائِشَةُ بِنْتُ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنهَا، قَالَتْ: قَالَ لِي رَسُولُ اللهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمٍ: « **يَا عَائِشَةُ هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟** ». قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَا عِنْدَنَا شَيْءٌ. قَالَ: « **فَإِنِّي صَائِمٌ** ». قَالَتْ: فَخَرَجَ رَسُولُ اللهِ، فَأُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ، أَوْ جَاءَنَا زَوْرٌ، قَالَتْ: فَلَمَّا رَجَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّه، أُهْدِيَتْ لَنَا هَدِيَّةٌ، أَوْ جَاءَنَا زَوْرٌ، وَقَدْ خَبَأْتُ لَكَ شَيْئًا، قَالَ: « **مَا هُوَ ؟**» .قُلْتُ: حَيْسٌ . قَالَ: « **هَاتِيهِ** ». فَجِئْتُ بِهِ، فَأَكَلَ، ثُمَّ قَالَ: « **قَدْكُنْتُ أَصْبَحْتُ صَائِمًا** ». قَالَ طَلْحَةُ: فَحَدَّثْتُ مُجَاهِدًا بِهَذَا الْحَدِيثِ، فَقَالَ: ذَاكَ بِمَنْزِلَةِ الرَّجُلِ، يُخْرِجُ الصَّدَقَةَ مِنْ مَالِهِ، فَإِنْ شَاءَ أَمْضَاهَا، وَإِنْ شَاءَ أَمْسَكَهَا.

صحيح مسلم | ٢٧١٤ سنن الترمذي | ٧٤٣ سنن النسائي | ٢٣٢٢

سنن ابن ماجه | ١٧٠١ مسند أحمد | ٢٤٢٢٠ كتاب الأم للشافعي | ٩٣٠ مسند الحميدي | ١٩٠ سنن الدارقطني تبييت النية من الليل وغيره | ١٧

حیس: بە خواردنێک دەوترێ پێکهاتووە لە خورما و کەشک و زەیت.



# پارشێو کردن

**أنس بن مالک** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: پارشێو بکەن، چونکە لە پارشێو کردندا بەرەکەت هەیە.

عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ: « **تَسَحَّرُوا، فَإِنَّ فِي السَّحُورِ بَرَكَةً** ».

صحيح البخاري | ١٩٢٣ صحيح مسلم | ٢٥٤٩ سنن الترمذي | ٧١٧ سنن النسائي | ٢١٤٦ سنن ابن ماجه | ١٦٩٢ سنن الدارمي | ١٧٢٢ مسند أحمد | ١٣٩٩٣ مسند أبي داود الطيالسي | ٢١١٨ المصنف لعبدرزاق | ٧٧٣٢ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٠٤ صحيح ابن خزيمة | ١٩٣٧

**عمرو بن العاص** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: جیاکەرەوەی نێوان ڕۆژووی ئێمە لەگەڵ ئەهلی کیتاب خواردنی پارشێوە.

عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: « **فَصْلُ مَا بَيْنَ صِيَامِنَا وَصِيَامِ أَهْلِ الْكِتَابِ أَكْلَةُ السَّحَرِ** ».

صحيح مسلم | ٢٥٥٠ سنن أبي داود | ٢٣٤٣ سنن الترمذي | ٧١٨ سنن النسائي | ٢١٦٦ سنن الدارمي | ١٧٢٣ مسند أحمد | ١٧٨٠١ المصنف لعبدرزاق | ٧٧٣٦ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٠٦ صحيح ابن خزيمة | ١٩٤٠

**أنس بن مالک** رضي الله عنه دەڵێ: زيد بن ثابت لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ پارشێویان کرد کاتێک تەواو بوون ڕەسول الله ﷺ هەستایەوە بۆ نوێژ و نوێژی کرد. قتادة دەڵێ: پرسیارمان کرد لە أنس ماوەی نێوان پارشێو کردنیان لەگەڵ نوێژ کردنیان چەند بوو؟ وتی: هێندەی ئەوەی کەسێک پەنجا ئایەت بخوێنێ.

عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ، أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ وَزَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ تَسَحَّرَا فَلَمَّا فَرَغَا مِنْ سَحُورِهِمَا قَامَ نَبِيُّ اللَّه ﷺ إِلَى الصَّلَاة، فَصَلَّى، قُلْنَا لِأَنَسٍ: كَمْ كَانَ بَيْنَ فَرَاغِهِمَا مِنْ سَحُورِهِمَا وَدُخُولِهِمَا فِي الصَّلَاةِ؟ قَالَ: قَدْرُ مَا يَقْرَأُ الرَّجُلُ خَمْسِينَ آيَةً .

صحيح البخاري | ١٩٢١ صحيح مسلم | ٢٥٥٢ سنن الترمذي | ٧١٢ سنن النسائي | ٢١٥٥ سنن ابن ماجه | ١٦٩٤ سنن الدارمي | ١٧٢١

مسند أحمد | ١٢٧٣٩ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠١٩ صحيح ابن خزيمة | ١٩٤١

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: ئەمە قەولی شافعي و أحمد و إسحاق بن راهوية ـشە، پێیان باشە پارشێو کردن دوا بخرێ.

وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ: اسْتَحَبُّوا تَأْخِيرَ السُّحُورِ.

**أبي عطية** دەڵێ: بە عائشة ـم وت: دوو کەسمان لە ناودایە لە هاوەڵانی ڕەسول الله ﷺ یەکێکیان خێرا ڕۆژوو دەشکێنێ، وە پارشێو دوا دەخات، ئەویتریان ڕۆژوو شکاندن دوا دەخات، وە زوو پارشێو دەکات، وتی: ئەوەیان خێرا ڕۆژوو دەشکێنێ و پارشێو دوا دەخات کێیە؟ وتم: عبدالله بن مسعود، وتی: ڕەسول الله ﷺ بەو شێوەیەی دەکرد.

عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ قَالَ: قُلْتُ: لِعَائِشَةَ: فِينَا رَجُلَانِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ: أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ السُّحُورَ، وَالْآخَرُ يُؤَخِّرُ الْإِفْطَارَ وَيُعَجِّلُ السُّحُورَ. قَالَتْ: أَيُّهُمَا الَّذِي يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ وَيُؤَخِّرُ السُّحُورَ؟ قُلْتُ: عَبْدُ اللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ. قَالَتْ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَصْنَعُ.

سنن النسائي | ٢١٥٨ مسند أحمد | ٢٥٣٩٩

**عبدالله بن الحارث** لە یەکێک لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ دەگێڕێتەوە دەڵێ: چوومە ژوورەوە بۆ لای ڕەسول ﷺ خەریکی پارشێو کردن بوو، فەرمووی: پارشێو بەرەکەتە الله ﷻ پێتانی بەخشیوە وازی لێ مەهێنن.

عَنْ عَبْدِ الْحَمِيدِ صَاحِبِ الزِّيَادِيِّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَاللَّه بْنَ الْحَارِثِ يُحَدِّثُ عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يَتَسَحَّرُ، فَقَالَ: « **إِنَّهَا بَرَكَةٌ أَعْطَاكُمُ اللَّهُ إِيَّاهَا فَلاَ تَدَعُوهُ** ».

سنن النسائي | ٢١٦٢ مسند أحمد | ٢٤١١٣

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: چاکترین پارشێوی ئیماندار خورمایە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: « **نِعْمَ سَحُورُ الْمُؤْمِنِ التَّمْرُ** ».

سنن أبي داود | ٢٣٤٥

**عمرو بن حريث** دەڵێ: صەحابەی ڕەسول الله ﷺ خێراترینی خەڵکی بوون لە ڕۆژوو شکاندندا، وە لەسەرخۆترین بوون لە پارشێو کردندا.

حَدَّثَنَا شَرِيكٌ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمرو يَعني ابن حَريث، قال: كان أَصحابُ رسول الله ﷺ أَعجَلَ النَّاسِ إفطارًا وأَبطَأَهَم سُحورًا.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٢٣



# فەجری صادق و فەجری کاذب

الله ﷻ فەرموویەتی: بخۆن و بخۆنەوە هەتا بۆتان ڕوون دەبێتەوە خەتی سپی بەرەبەیان لە خەتی ڕەشی شەو، پاشان درێژە بە ڕۆژووەکانتان بدەن هەتا شەو.

قَالَ اللهُ ﷻ: ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ﴾ البقرة : ١٨٧

**شافعي** دەڵێ: ئەو کاتەی خواردن تیایدا حەڕام دەبێ لەسەر ڕۆژووەوان ئەو کاتەیە فەجرەکەی ترە کە ڕوون دەبێتەوە بە شێوەیەکی ئاسۆیی دەردەکەوێ.

بەم جۆرە لە ڕەسول الله ـەوە ﷺ پێمان گەیشتووە هەتا خۆرئاوا بوون، هەروەک چۆن الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ﴾.

قال الشافعي: الوقتُ الذي يُحرمُ فيه الطعام على الصَّائم، حينَ يَتَبين الفجرُ الآخرُ مُعترضًا في الأفق.

وكذالکَ بلغنا عَنِ النبي ﷺ إلى أن تَغيبَ الشَّمس، وكذالکَ قال الله ﷻ: ﴿ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ ﴾.

كتاب الأم للشافعي | (٦٤٧/١)

**سهل بن سعد** رضي الله عنهما دەڵێ: کاتێک ئایەتی: ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾. دابەزی، ئەم بەشەی: ﴿ مِنَ الْفَجْرِ ﴾. لەگەڵ دانەبەزی بوو. هەندێک لە هاوەڵان بەتەمای ڕۆژوو بووان پەتێکی سپی و پەتێکی ڕەشی دەبەست بە قاچیەوە، بەردەوام دەبوو لە خواردن و خواردنەوە هەتا دونیا ڕووناک دەبوو، دوو پەتەکەی لە یەک جیا دەکردنەوە، پاشان الله ﷻ ﴿ مِنَ الْفَجْرِ ﴾ دابەزاند ئەنجا تێگەیشتن مەبەست لێی ڕۆژ و شەوە.

عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أُنْزِلَتْ: ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾. وَلَمْ يَنْزِلْ مِنَ الْفَجْرِ، فَكَانَ رِجَالٌ إِذَا أَرَادُوا الصَّوْمَ رَبَطَ أَحَدُهُمْ فِي رِجْلِهِ الْخَيْطَ الْأَبْيَضَ وَالْخَيْطَ الْأَسْوَدَ، وَلَمْ يَزَلْ يَأْكُلُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ رُؤْيَتُهُمَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدُ: ﴿مِنَ الْفَجْرِ﴾. فَعَلِمُوا أَنَّهُ إِنَّمَا يَعْنِي اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ.

صحيح البخاري | ١٩١٧ صحيح مسلم | ٢٥٣٥

**عدي بن حاتم** رضي الله عنه دەڵێ: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾. هەستام پەتێکی ڕەش و پەتێکی سپیم خستە ژێر پشتییەکەم، سەیرم دەکرد لە شەودا، بۆم جیا نەدەبوویەوە، بەیانی چوومە خزمەتی ڕەسول الله ﷺ بابەتەکەم بۆ باس کرد، فەرمووی: « ئەوە مەبەست لێی ڕەشایی شەو لەگەڵ سپێتی ڕۆژە».

عَنْ عَدِيٍّ بْنِ حَاتِمٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾. عَمَدْتُ إِلَى عِقَالٍ أَسْوَدَ، وَإِلَى عِقَالٍ أَبْيَضَ، فَجَعَلْتُهُمَا تَحْتَ وِسَادَتِي، فَجَعَلْتُ أَنْظُرُ فِي اللَّيْلِ، فَلَا يَسْتَبِينُ لِي، فَغَدَوْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَذَكَرْتُ لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ: « إِنَّمَا ذَلِكَ سَوَادُ اللَّيْلِ وَبَيَاضُ النَّهَارِ ».

صحيح البخاري | ١٩١٦ صحيح مسلم | ٢٥٣٣ سنن أبي داود | ٢٣٤٩ سنن الترمذي | ٣٢١٠ سنن النسائي | ٢١٦٩ سنن الدارمي | ١٧٢٠ مسند أحمد | ١٩٣٧٠ المصنف لابن أبي شيبة | ٩١٧٠ صحيح ابن خزيمة | ١٩٢٥

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ دوو بانگ بێژی هەبوو: بلال لەگەڵ إبن أم مکتوم ـی کوێر، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « بلال بە شەودا بانگ دەدات، بخۆن و بخۆنەوە، هەتا إبن أم مکتوم بانگ دەدات ». وتیشی: نێوان هەردوو بانگەکە هەر هێندە بوو ئەمیان دادەبەزی، ئەویان سەردەکەوت.

عَنْ نَافِعٍ، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ مُؤَذِّنَانِ: بِلَالٌ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الْأَعْمَى، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِنَّ بِلَالاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا، حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ** ». قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا إِلَّا أَنْ يَنْزِلَ هَذَا، وَيَرْقَى هَذَا.

صحيح البخاري | ٦٢٢ صحيح مسلم | ٢٥٣٨ الموطأ لمالک | ١٦٦ مسند أحمد | ٥١٩٥ صحيح ابن خزيمة | ١٩٣١

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: «بلال بە شەودا بانگ دەدات، بخۆن و بخۆنەوە هەتا بانگی إبن أم مکتوم دەبیستن». پاشان وتی: إبن أم مکتوم پیاوێکی کوێر بوو بانگی نەدەدا هەتا پێیان نەوتایە: ڕۆژ بوویەوە ڕۆژ بوویەوە.

عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِاللَّه، عَنْ عَبْدِاللَّه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنْ رَسُولِ الله ﷺ أَنَّهُ قَالَ: « **إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى تَسْمَعُوا تَأْذِينَ ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ** ». ثُمَّ قَالَ: وَكَانَ رَجُلًا أَعْمَى لَا يُنَادِي حَتَّى يُقَالَ لَهُ: أَصْبَحْتَ أَصْبَحْتَ.

صحيح البخاري | ٦١٧ صحيح مسلم | ٢٥٣٦ سنن النسائي | ٦٣٧ مسند أحمد | ٤٥٥١ كتاب الأم للشافعي | ١٥٨ مسند أبي داود الطيالسي | ١٩٢٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠١٤

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: فەجر دووانن: یەکەمیان خواردن تێیدا حەڕام نییە، وە کاتی هاتن و کردنی نوێژ نییە، ئەما دووەمیان ئەوە خواردن حەڕام دەکات، وە کاتی کردنی نوێژە.

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ مُحْرِزٍ أَصْلُهُ بَغْدَادِيٌّ انْتَقَلَ إِلَى فُسْطَاطٍ، أَخْبَرَنَا أَبُو أَحْمَدَ الزُّبَيْرِيُّ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: « **الْفَجْرُ فَجْرَانِ: فَأَمَّا الأَوَّلُ**

**فَإِنَّهُ لَا يُحَرِّمُ الطَّعَامَ، وَلَا يُحِلُّ الصَّلَاةَ، وَأَمَّا الثَّانِي فَإِنَّهُ يُحَرِّمُ الطَّعَامَ وَيُحِلُّ الصَّلَاةَ** ».

صحيح ابن خزيمة ا ١٩٢٧ سنن الدارقطني باب في وقت السحر ا ٤

**عبدالله بن مسعود** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « بلال بە شەودا بانگ دەدا بۆ ئەوەی ئەوەتان خەوتووە خەبەری ببێتەوە، وە ئەوەشی بە خەبەرە و نوێژ دەکات دەست هەڵگرێ، وە فەجر ئەوە نییە ئاوایە -بە دەستی ئیشارەتی بۆ کرد- بەڵکو فەجر ئەوە بەو جۆرە بێ ». بە دوو پەنجەی شەهادە ئیشارەتی بۆ دەکرد.

عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: « **إِنَّ بِلَالًا يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ، لِيُنَبِّهَ نَائِمَكُمْ وَيَرْجِعَ قَائِمَكُمْ وَلَيْسَ الْفَجْرُ أَنْ يَقُولَ هَكَذَا -وَأَشَارَ بِكَفِّهِ- وَلَكِنِ الْفَجْرُ أَنْ يَقُولَ هَكَذَا** ». وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَتَيْنِ.

صحيح البخاري ا ٧٢٤٧ صحيح مسلم ا ٢٥٤١ سنن النسائي ا ٢١٧٠ سنن ابن ماجه ا ١٦٩٦ مسند أحمد ا ٣٦٥٤ صحيح ابن خزيمة ا ١٩٢٨

**سمرة بن جندب** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: لێتان تێک نەچێ و بە هەڵەدا نەتان بات بانگەکەی بلال، وە هەروەها ئەو

سپیایەی بە ستوونی لە ئاسمانەوە دادەبەزێ بەم شێوەیە هەتا نەبێتە سپیایی ئاسۆیی ».

عَنْ عَبْدِاللَّه بْنِ سَوَادَةَ الْقُشَيْرِيِّ، عَنْ أَبِيهِ، سَمِعْتُ سَمُرَةَ بْنَ جُنْدُبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ يَخْطُبُ وَهُوَ يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **لَا يَمْنَعَنَّ مِنْ سُحُورِكُمْ أَذَانُ بِلَالٍ، وَلَا بَيَاضُ الْأُفُقِ الَّذِي هَكَذَا حَتَّى يَسْتَطِيرَ** ».

صحيح مسلم ا ٢٥٤٦ سنن أبي داود ا ٢٣٤٦ سنن الترمذي ا ٧١٥ سنن النسائي ا ٢١٧١ مسند أحمد ا ٢٠١٤٩ مسند أبي داود الطيالسي ا ٩٤٠ صحيح ابن خزيمة ا ١٩٢٩ سنن الدارقطني باب في وقت السحر ا ٨

لە ڕیوایەتەکەی النسائي ـدا کە لە ڕێگەی محمود بن غيلان ئەویش لە أبي داود ـەوە هێناویەتی، دوای تەواو بوونی حدیثەکە هاتووە دەڵێ: واتە بە درێژی، أبو داود دەڵێ: دەستەکانی کردەوە و درێژ کرد ڕووە و ڕاست و چەپ.

يَعْنِي مُعْتَرِضًا، قَالَ أَبُو دَاوُدَ: وَبَسَطَ بِيَدَيْهِ يَمِينًا وَشِمَالًا، مَادًّا يَدَيْهِ.

**أبي موسى الأشعري** رضي الله عنه دەڵێ: فەجر ئەوە نییە بەو شێوەیە واتە ستوونی، بەڵکو فەجر ئەوەیە بەو شێوەیە واتە ئاسۆیی.

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ ثَابتِ بنِ عُمارة، عَنْ غُنَيمِ بنِ قَيسٍ، عَنْ أبي موسى، قال: ليس الفجرُ الذي هكذا يعني المُستَطيلَ، ولكن الفجر الذي هكذا يعني المُعتَرِضَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩١٦٣

**جعفر بن نهار** دەڵێ: پرسیارم کرد لە قاسم دەربارەی فەجر ستوونیەکەیە یاخود ئاسۆییە؟ وتی: ئاسۆییەکەیە، ڕووناکییە ستوونییەکە فەجری درۆزنە.

حَدَّثَنَا عبدالصمت بن عبدالوارث، عَنْ حَوشَبٍ بن عَقيل، عَنْ جعفر بن نهَار، قال: سألتُ القاسم أهو السَّاطعُ أم المُعتَرِضُ، قال: المُعتَرِضُ والسَّاطعُ الصُّبحُ الكَاذِب.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩١٦٤

**مسلم بن صبيح** دەڵێ: ئەوان ئەم فەجرەی ئێستای ئێوەیان بە فەجر حسێب نەدەکرد، بەڵکو ئەوەیان بە فەجر دادەنا کە ماڵەکان و ڕێگاکانی دەگرتەوە و بڵاودەبوویەوە.

حَدَّثَنَا أَبو مُعاوية، عَنْ الأعمشِ، عَنْ مُسلمٍ، قال: لم يكونوا يَعُدُّونَ الفجرَ فجركُم هذا، إنما كانوا يَعُدُّونَ الفجرَ الذي يملأُ البُيوتَ والطُّرُوقَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩١٦٦

**عدي بن ثابت** دەڵێ: خیلافمان هەبوو لە فەجردا، هاتین بۆ لای إبراهیم النخعي، وتی: فەجر دووانن، ئەمما یەکێکیان ڕووناکییە ستوونییەکەیە ئەمە کاتی نوێژ نییە، وە خواردنەوەش حەڕام ناکات، ئەمما فەجری ئاسۆیی سوور، ئەوە کاتی نوێژە، وە خواردن حەڕام دەکات.

حَدَّثَنَا يزيد بنُ هارونَ، عَنْ حجَّاجٍ، عَنْ عَدِيِّ بن ثابتٍ، قال: اختلفنا في الفجر فأتينا إبراهيمَ، فقال: الفَجرُ فجران، فأَمَّا أَحدهُما فالفجرُ السَّاطعُ فلا يَحِلُّ الصّلاة، ولا يُحَرِّمُ الطّعام، وأمَّا الفجرُ المُعترِضُ الأحمر، فإنَّه يُحِلُّ الصّلاة ويُحَرِّمُ الطّعامَ والشَّرابَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩١٦٧

**جعفر بن برقان** دەڵێ: پرسیارم کرد لە الزهري و میمون، وتم: دەمەوێ ڕۆژوو بگرم ئەو ڕووناکییە ستوونییەکەی بەیانی دەبینم، هەردووکیان وتیان: خواردن و خواردنەوە بخۆ هەتا ڕووناکییە ئاسۆییەکە دەردەکەوێ.

حَدَّثَنَا كَثِيرُ بنُ هشامٍ، عَنْ جعفر بنِ بُرقان، قال: سألتُ الزُهري وميمونًا فقلت: أُريدُ الصَّومَ فأرى عَمودَ الصُّبحِ السَّاطعِ فقالا جميعًا: كُلْ واشرَب حتَّى تراه في أُفُقِ السَّماءِ مُعترِضًا.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩١٦٩

**صالح بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی ئەو فەجرەی خواردن و خواردنەوە حەڕام دەکات؟ وتی: فەجر دووانن: فەجری ستوونی، فەجری ئاسۆیی، ئەوەی کە خواردن و خواردنەوە حەڕام دەکات فەجری ئاسۆییە.

سألت أبي عَنِ الفجر الذي يحرم الطعام والشراب؟ فقال: هما فجران: الفجر المستطيل، والفجر المعترض، فالذي يحرم الطعام والشراب الفجر المعترض.

مسائل أحمد بن حنبل رواية صالح بن أحمد | ١٣١٤



## هەستان بۆ نوێژی بەیانی بە لەش گرانی

أبو بكر بن عبدالرحمن بن الحارث بن هشام دەڵێ: عبدالرحمن ـی باوکم بە مروان بن حكم ـی ڕاگەیاندووە کە عائشة و أم سلمة هەواڵیان پێداوە کە ڕەسول الله ﷺ ڕۆژی لێ ئەبوویەوە لەش گران بوو بەهۆی جیماعەوە لەگەڵ خێزانەکانی، پاشان خۆی دەشۆری و بەڕۆژوو دەبوو. مروان بە عبدالرحمن ـی وت: سوێند بە الله دەبێ ئەمە بدەی بە گوێی أبا هريرة ـدا، ئەوکات مروان والی مەدینە بوو، أبو بكر دەڵێ: عبدالرحمن ئەمەی پێ ناخۆش بوو، پاشان وا ڕێک کەوت لە ذي الحليفة کۆبووینەوە، لەوێ أبي هريرة پارچە زەوییەکی هەبوو، عبدالرحمن بە أبي هريرة ـی وت: من شتێکت پێ دەڵێم و بیر دەخەمەوە، ئەگەر مروان سوێندی نەدامایە بۆتم باس نەدەکرد. قەولی عائشة و أم سلمة ـی باس کرد، أبي هريرة وتی: بەڵێ وایە، بەو جۆرەش فضل بن عباس بۆی گێڕامەوە، وە ئەو شارەزایە.

عَنْ أَبُو بَكْرِ بْنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، أَنَّ أَبَاهُ عَبْدَالرَّحْمَنِ أَخْبَرَ مَرْوَانَ، أَنَّ عَائِشَةَ وَأُمَّ سَلَمَةَ أَخْبَرَتَاهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ مِنْ أَهْلِهِ، ثُمَّ يَغْتَسِلُ وَيَصُومُ. وَقَالَ مَرْوَانُ لِعَبْدِالرَّحْمَنِ

بْنِ الْحَارِثِ: أُقْسِمُ بِاللَّهِ لَتُقَرِّعَنَّ بِهَا أَبَا هُرَيْرَةَ، وَمَرْوَانُ يَوْمَئِذٍ عَلَى الْمَدِينَةِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: فَكَرِهَ ذَلِكَ عَبْدُالرَّحْمَنِ. ثُمَّ قُدِّرَ لَنَا أَنْ نَجْتَمِعَ بِذِي الْحُلَيْفَةِ، وَكَانَتْ لِأَبِي هُرَيْرَةَ هُنَالِكَ أَرْضٌ، فَقَالَ عَبْدُالرَّحْمَنِ لِأَبِي هُرَيْرَةَ: إِنِّي ذَاكِرٌ لَكَ أَمْرًا، وَلَوْلَا مَرْوَانُ أَقْسَمَ عَلَيَّ فِيهِ لَمْ أَذْكُرْهُ لَكَ. فَذَكَرَ قَوْلَ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ. فَقَالَ كَذَلِكَ حَدَّثَنِي الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ، وَهُوَ أَعْلَمُ.

صحيح البخاري | ١٩٢٥-١٩٢٦ صحيح مسلم | ٢٥٨٩ سنن الترمذي | ٧٨٩ سنن ابن ماجه | ١٧٠٣ الموطأ لمالك | ٦٥٧ سنن الدارمي | ١٧٥١ مسند أحمد | ٢٥٦٧٣ كتاب ناسخ الحديث ومنسوخه لابن شاهين | ٣٨٥

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حەدیثەیە لای زۆربەی ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، وە غەیری ئەوانیش. وە قەولی سفیان الثوري و شافعي و أحمد و إسحاق بن راهوية ـیە، وە هەندێک لە تابعین وتوویانە: ئەگەر ڕۆژ بوویەوە لەش گران بێ ئەوە دەبێ قەزای بکاتەوە. بەڵام قەولی یەکەم دروستە.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَغَيْرِهِمْ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ، وَقَدْ قَالَ قَوْمٌ مِنَ التَّابِعِينَ: إِذَا أَصْبَحَ جُنُبًا يَقْضِي ذَلِكَ الْيَوْمَ. وَالْقَوْلُ الْأَوَّلُ أَصَحُّ.

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەجری بەسەردا دەهات لەش گران بوو بە هۆی جیماعەوە نەک لەش گرانی، خۆی دەشۆری و بەڕۆژوو دەبوو.

عَنْ عُرْوَةَ، وَأَبِي بَكْرٍ، قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُدْرِكُهُ الْفَجْرُ فِي رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ حُلْمٍ، فَيَغْتَسِلُ وَيَصُومُ.

صحيح البخاري | ١٩٣٠ صحيح مسلم | ٢٥٩٠ مسند أحمد | ٢٤٠٦٢ مسند الحميدي | ٢٠٠ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٥٧ صحيح ابن خزيمة | ٢٠١٠

**نافع** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أم سلمة رضي الله عنها، دەربارەی پیاوێک ڕۆژی لێ بووەتەوە لەش گرانە و دەیەوێ ڕۆژوو بگرێ؟ وتی: ڕەسول الله ﷺ ڕۆژی لێ دەبویەوە لەش گران بوو لە جیماع نەک لەش گرانی خەو پاشان خۆی دەشۆری و درێژەی بەڕۆژوو گرتن دەدا.

عَنْ نَافِعٍ، قَالَ: سَأَلْتُ أُمَّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، عَنِ الرَّجُلِ يُصْبِحُ وَهُوَ جُنُبٌ يُرِيدُ الصَّوْمَ. قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنَ الْوِقَاعِ لَا مِنِ احْتِلَامٍ ثُمَّ يَغْتَسِلُ، وَيُتِمُّ صَوْمَهُ.

سنن ابن ماجه | ١٧٠٤

**أبا بكر** دەڵێ: مەروان ناردمی بۆ لای أم سلمة پرسیاری لێ بکەم دەربارەی پیاوێک لەش گرانە ڕۆژ دەبێتەوە ئایا بەڕۆژوو بێ؟ وتی: ڕەسول الله ﷺ فەجری بەسەردا دەهات لەش گران بوو بەهۆی جیماعەوە نەک لەش گرانی خەو، پاشان ڕۆژووی دەگرت و قەزاشی نەدەکردەوە.

عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ كَعْبٍ الْحِمْيَرِيِّ، أَنَّ أَبَا بَكْرٍ حَدَّثَهُ أَنَّ مَرْوَانَ أَرْسَلَهُ إِلَى أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، يَسْأَلُ عَنِ الرَّجُلِ، يُصْبِحُ جُنُبًا، أَيَصُومُ؟ فَقَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ، لَا مِنْ حُلُمٍ، ثُمَّ لَا يُفْطِرُ وَلَا يَقْضِي.

صحيح مسلم | ٢٥٩١

**عائشة** و **أم سلمة** خێزانی ڕەسول الله ﷺ دەڵێن: ڕەسول الله ﷺ لە ڕەمەزاندا فەجری بەسەردا دەهات لەش گران بوو بەهۆی جیماعەوە نەک لەش گرانی خەو، پاشان ڕۆژووی دەگرت.

عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ زَوْجَيِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُمَا قَالَتَا: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ غَيْرِ احْتِلَامٍ فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ يَصُومُ .

صحيح البخاري | ١٩٣٢-١٩٣١ صحيح مسلم | ٢٥٩٢ سنن أبي داود | ٢٣٨٨ الموطأ لمالک | ٦٥٦ مسند أحمد | ٢٤٠٧٤ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٢٩ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٦٧

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەت ڕەسول الله ﷺ پرسیارێ لێکرد وتی: ئەی ڕەسولی الله جاری وا هەیە نوێژی بەیانی دێتە پێشەوە لەش گرانم، ڕۆژوو بگرم؟ ڕەسول الله ﷺ: « منیش نوێژی بەیانی دێتە پێشەوە لەش گرانم، ڕۆژوو دەگرم ». پیاوەکە وتی: ئەی ڕەسولی الله، تۆ الله لێت خۆش بووە، فەرمووی: « والله هیوام وایە من لە هەمووتان زیاتر لە الله بترسم، وە لە هەمووشتان شارەزاترم بە خۆپارێزی ».

عَنْ عَبْدُاللَّه بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ -وَهُوَ ابْنُ مَعْمَرِ بْنِ حَزْمٍ الْأَنْصَارِيُّ أَبُو طُوَالَةَ- أَنَّ أَبَا يُونُسَ مَوْلَى عَائِشَةَ أَخْبَرَهُ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَجُلًا جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَسْتَفْتِيهِ -وَهِيَ تَسْمَعُ مِنْ وَرَاءِ الْبَابِ- فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، تُدْرِكُنِي الصَّلَاةُ وَأَنَا جُنُبٌ، أَفَأَصُومُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «**وَأَنَا تُدْرِكُنِي الصَّلَاةُ وَأَنَا جُنُبٌ، فَأَصُومُ**». فَقَالَ: لَسْتَ مِثْلَنَا يَا رَسُولَ اللَّه، قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، فَقَالَ: « **وَاللهِ، إِنِّي لَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَخْشَاكُمْ لله، وَأَعْلَمَكُمْ بِمَا أَتَّقِي** ».

صحيح مسلم ا ٢٥٩٣ الموطأ لمالك ا ٦٥٥ سنن أبي داود ا ٢٣٨٩ مسند أحمد ا ٢٤٣٨٥ كتاب الأم للشافعي ا ٩٢٠ مسند الشافعي ا ٣٧٨ صحيح ابن خزيمة ا ٢٠١٤

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول اللە ﷺ شەو دەمایەوە لەش گران بوو بلال دەهات بانگی دەدا ئەویش هەڵدەستایەوە خۆی دەشۆری سەیرم دەکرد ئاو بەسەریەوە دەهاتە خوارەوە، پاشان دەچوو بۆ مزگەوت دەنگیم دەبیست نوێژی بەیانی دەکرد، پاشان بەڕۆژوو دەبوو. مطرف دەڵێ: بە عامر الشعبي ـم وت: لە ڕەمەزاندا؟ وتی: لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزاندا وەک یەکە.

حَدَّثَنَا ابن فُضَيلٍ، عَن مُطَرِّفٍ، عَن الشَّعبيِّ، عَن مَسروقٍ، عَن عائشةَ قالت: كانَ النَّبيُّ ﷺ يَبيتُ جُنُبًا فيأتيه بِلالُ فيؤذِنُه بالصلاةِ فيقوم فيغتَسلُ فأنظرُ إلى تَحَدُّر الماء مِن رأسِه، ثُمِّ يَخرُج فأسمعُ صَوتَه في الصَّلاةِ الفجر، ثُمَّ يَظَلُّ صائمًا، قال مُطَرِّف: فقلتُ لعامرٍ في رمضان؟ قال: نعم سواءُ رمضان وغيره.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٦٥٦

**الأسود بن هلال** دەڵێ: عبدالله بن مرداس هات بۆ لای عبدالله بن مسعود رضي الله عنه، وتی: من ڕۆژم لێ بووەتەوە لەش گرانم درێژە بدەم بە ڕۆژووەکەم؟ عبدالله وتی: ڕۆژت لێ بووەتەوە نوێژت لەسەر حەڵاڵ بووە و لەسەرە، وە ڕۆژووت لەسەر حەڵاڵ بووە و لەسەرە خۆت بشۆ درێژە بدە بە ڕۆژووەکەت.

حَدَّثَنَا أَبو مُعاوية، عَنِ الأعمشِ، عَن جامعِ بنِ شَدَّادٍ، عَنِ الأَسوَدِ بنِ هلالٍ، قال: جاءَ عبدالله بنُ مِرداسٍ إلى عبدالله بنِ مسعودٍ، فقال: إنيَّ أَصبَحت جُنُبُ فأُتِمُّ صَومي؟ قالَ عبدالله: أَصبَحت فَحَلَّ لَكَ الصَّلاةُ فَحَلَّ لَكَ الصِّيام اغتَسل وأَتِمَّ صومَك.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٦١ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٣٤

**أبي عطية الوداعي** دەڵێ: دوو پیاو لە مزگەوت بووە موناقەشەیان دەربارەی کەسێک ڕۆژی لێ بووەتەوە لەش گرانە، هەردووکیان چوون بۆ لای عبدالله بن مسعود رضي الله عنه، منیش چووم لەگەڵیان، یەکێکیان لێی پرسی: بەڕۆژوو دەبێ؟ وتی: بەڵێ. وتی: ئەگەر لەش گرانی جیماعیش بێ؟ وتی: تەنانەت با لەش گرانی جیماعیش بێ، وتی: ئەگەر بە

ئەنقەست خەوت بێ دوای لەش گرانییەکە؟ وتی: تەنانەت با بە ئەنقەستیش خەوت بێ.

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنِ الأعمشِ، عَن عُمارةَ بن عُمَيرٍ، عَن أَبي عَطيَّةَ الوَداعيِّ، قال: تَدارَأَ رجُلانِ في المسجد في رَجُلٍ يُصبِحُ وهو جُنُبٌ فانطلقا إلى عبدِالله فانطلقتُ معهما، فسألَه أحدهما، فقال: أيصوم؟ قالَ: نعم، قالَ: فإن كانَ مِنَ النِّساءِ؟ قالَ: وإن كانَ مِنَ النِّساءِ، قالَ: وإن نامَ مُتَعَمِّدًا؟ قالَ: وإن نامَ مُتَعَمِّدًا.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٦٢

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما دەڵێ: ئەگەر بانگ بێژ بانگ بدات من لە نێوان قاچەکانی خێزانمدا بم ئەوە هەڵدەستمەوە و درێژە دەدەم بە ڕۆژووەکەم، ڕۆژووی ڕەمەزان بێ یاخود غەیری ڕەمەزان.

حَدَّثَنَا شَبابَةُ، قال: حَدَّثَنَا هِشام بنُ الغاز، عَن نافعٍ، عَنِ ابن عُمَرَ، قالَ: لَو نادى الْمُنادى وَأَنَّا بينَ رِجليها لَقُمتُ فأَتمَمتُ الصِّيَامَ، صِيامَ رمضان كانَ أَو غيره.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٦٨

**أبي داود** دەڵێ: بیستم بە أحمد بن حنبل وترا: کەسی لەش گران ڕۆژی لێ دەبێتەوە و بەڕۆژووە؟ وتی: کێشەی نییە.

وَسمعتُ أحمد قيل له: الجُنب يُصبح صائمًا؟ قال: وَما بأس.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٤٢



## ئاو ڕادان لەدەم و خۆ فێنک کردنەوەی ڕۆژووەوان

**أبو بكر بن عبدالرحمن** دەڵێ: لە یەکێک صەحابەی ڕەسول الله ﷺ بیست وتی: ڕەسول الله ﷺ بینی لە سەفەرەکەی فەتحی مەککە ئەمری کرد بە خەڵکی ڕۆژووەکەیان بشکێنن، وە فەرمووی: « خۆتان بەهێز بکەن بۆ دوژمنەکەتان ». ڕەسول الله ﷺ بەڕۆژوو بوو بینم لە عرج وەستابوو ئاوی دەکرد بە سەریدا هێندە تینووی بوو یاخود هێندە گەرمای بوو، پاشان بە ڕەسول الله ﷺ وترا: ئەی ڕەسولی الله، کۆمەڵێک لە خەڵکی بەڕۆژوون کاتێک تۆیان بینی بەڕۆژووی، کاتێک ڕەسول الله ﷺ گەیشتە الكديد داوای قاپێک ئاوی کرد، بۆیان هێنا و خواردی، ئیتر خەڵکیش ڕۆژووەکەیان شکاند.

عَنْ سُمَيٍّ مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ النَّاسَ فِي سَفَرِهِ عَامَ الْفَتْحِ بِالْفِطْرِ، وَقَالَ: « **تَقَوَّوْا لِعَدُوِّكُمْ** ». وَصَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ الَّذِي حَدَّثَنِي: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ بِالْعَرْجِ يَصُبُّ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهِ مِنَ الْعَطَشِ أَوْ مِنَ الْحَرِّ، ثُمَّ قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ

اللَّه، إِنَّ طَائِفَةً مِنَ النَّاسِ قَدْ صَامُوا حِينَ صُمْتَ، قَالَ: فَلَمَّا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْكَدِيدِ دَعَا بِالْقَدَحِ، فَشَرِبَ، فَأَفْطَرَ النَّاسُ .

الموطأ لمالك ا ٦٦٩ سنن أبي داود ا ٢٣٦٥ مسند أحمد ا ١٥٩٠٣ كتاب الصيام للفريابي ا ٩٠

**لقيط بن صبرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: زێدەڕۆیی بکە زۆر ئاو ڕا بدە لە لووتت، ئیللا مەگەر بەڕۆژوو بی.

عَنْ عَاصِمِ بْنِ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ، عَنْ أَبِيهِ لَقِيطِ بْنِ صَبِرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «**بَالِغْ فِي الِاسْتِنْشَاقِ، إِلَّا أَنْ تَكُونَ صَائِمًا**».

سنن أبي داود ا ٢٣٦٦ سنن الترمذي ا ٧٩٨ سنن النسائي ا ٨٧ سنن ابن ماجه ا ٤٠٧ مسند أحمد ا ١٦٣٨٠ المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٨٤١

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما جلەکانی تەڕ کردووە و داویەتی بەسەر خۆیدا کاتێک بەڕۆژوو بووە.

وە عامر الشعبي چووەتە حەمام کاتێک بەڕۆژوو بووە.

**حسن البصري** دەڵێ: ئاو ڕادان لە دەم و خۆ فێنک کردنەوەی ڕۆژووەوان کێشەی تێدا نییە.

**أنس بن مالك** رضي الله عنه دەڵێ: حەوزێکی بچووکم هەبوو دەچوومە ناوی هەرکات بەڕۆژوو بوومایە.

وَبَلَّ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا ثَوْبًا فَأَلْقَاهُ عَلَيْهِ وَهُوَ صَائِمٌ. وَدَخَلَ الشَّعْبِيُّ الْحَمَّامَ وَهُوَ صَائِمٌ .

وَقَالَ الْحَسَنُ: لَا بَأْسَ بِالْمَضْمَضَةِ وَالتَّبَرُّدِ لِلصَّائِمِ.

وَقَالَ أَنَسٌ: إِنَّ لِي أَبْزَنَ أَتَقَحَّمُ فِيهِ وَأَنَا صَائِمٌ.

صحيح البخاري باب اغتسال الصائم | ٢٥

**أبي فروة** دەڵێ: الشعبي وتی: ئەگەر ئاوت ڕادا لە لووتت لەکاتێکدا بەڕۆژوو بووی ئەوە زێدەڕۆیی مەکە.

حَدَّثَنا مُعاويةُ بنُ هِشامٍ، عَن عَمَّارِ بن زُرَيق، عَن أبي فَروَةَ، عَنِ الشَّعبيِّ، قال: إذا استَنشَقتَ وأنتَ صائِم فلا تُبالِغ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٨٤٤

**ابن عون** دەڵێ: محمد بن سيرين بە کێشەی نەدەبینی تەڕکردنی کراس، پاشان دەیدا بەسەر ڕوومەتیدا.

حَدَّثَنَا أَزهَرُ السَّمانُ، عَنِ ابنِ عَونٍ، قال: كان ابن سيرينَ لا يرى بأسًا أن يُبُلَّ الثَّوبَ، ثُمَّ يُلقيه على وَجهِه.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٣٠٣

**ابن جريج** دەڵێ: پرسیارم کرد لە عطاء ابن أبي رباح دەربارەی ئاو ڕادان لە دەم بۆ ڕۆژووەوان لە غەیری دەست نوێژدا؟ وتی: بە کەراهەتی دەبینم لەبەر قەولی أبي هريرة لێیم بیست دەیوت: بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای الله ﷻ لە بۆنی میسک خۆشترە.

عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَطَاءً، عَنِ الْمَضْمَضَةِ لِلصَّائم لغيْرِ الصلَاةِ؟ فَقَالَ: مَا أَكْرَهُهُ إِلَّا لِقَوْلِ أَبِي هُرَيْرَةَ سَمِعْتُهُ يَقُولُ: خُلُوفُ فَمِ الصائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْك .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٣٣



# سیواک کردن لە کاتی بەڕۆژوو بووندا

**عامر بن ربيعة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ـم ﷺ بینی بەڕۆژوو بوو سیواکی دەکرد، هێندە زۆر دەم بینی سیواکی دەکرد نەدەژمێردرا.

عَنْ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَسْتَاكُ وَهُوَ صَائِمٌ مَا لَا أُحْصِي أَوْ أَعُدُّ.

صحيح البخاري | ٢٧ باب سواك الرَّطب واليابس للصائم.

ئەم حدیثە هەریەک لە: « أبي داود، أحمد، عبدالرزاق، الحميدي، إبن خزيمة، الدارقطني، الترمذي ». بە موتەصلی هێناویانە.

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الصَّبَّاحِ ، حَدَّثَنَا شَرِيكٌ. وَحَدَّثَنَا مُسَدَّدٌ ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ :

سنن أبي داود | ٢٣٦٤

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ. وَعَبْدُ الرَّحْمَن، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ ، قَالَ:

مسند أحمد | ١٥٦٧٨

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِاللهِ بْنِ عَاصِمٍ، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ :

المصنف لعبدرزاق | ٧٦١٦

حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ:

مسند الحميدي | ١٤١

حَدَّثَنَا أَبُو مُوسَى، حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ:

صحيح ابن خزيمة | ٢٠٠٧

حَدَّثَنَا أَبُو القَاسِمَ بْنِ منيع، حَدَّثَنَا أَبو بَكرِ بْنِ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا شَريك بْن عَبْدِالله، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ:

سنن الدارقطني باب السواك للصائم | ٢

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا عَبْدُالرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ، قَالَ: حَدَّثَنَا سُفْيَانُ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه، عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَامِرِ بْنِ رَبِيعَةَ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ:

سنن الترمذي | ٧٣٤

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای ئەهلی عیلم سیواک کردنی ڕۆژووەوان بەلایانەوە کێشەی نییە، بەڵام هەندێک لە ئەهلی عیلم بە کەراهەتیان داناوە سیواک کردنیان بە دار سیواکی تەڕ، هەروەها بە کەراهەتیان بینیوە لە کۆتایی ڕۆژدا، شافعي سیواک کردنی لە سەرەتای ڕۆژ و کۆتایی ڕۆژ بەلاوە ئاساییە، وە أحمد و إسحاق بن راهوية بە کەراهەتیان داناوە سیواک کردن لە کۆتایی ڕۆژدا.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ لَا يَرَوْنَ بِالسِّوَاكِ لِلصَّائِمِ بَأْسًا إِلَّا أَنَّ بَعْضَ أَهْلِ الْعِلْمِ كَرِهُوا السِّوَاكَ لِلصَّائِمِ بِالْعُودِ الرُّطْبِ، وَكَرِهُوا لَهُ السِّوَاكَ آخِرَ النَّهَارِ، وَلَمْ يَرَ الشَّافِعِيُّ بِالسِّوَاكِ بَأْسًا أَوَّلَ النَّهَارِ وَلَا آخِرَهُ، وَكَرِهَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ السِّوَاكَ آخِرَ النَّهَارِ.

**شافعي** دەڵێ: بە کەراهەتی نابینم سیواک کردنی بە دار سیواکی تەڕ و وشک لە بەیانیاندا، ئەمما ئێواران بە مەکروهی دەبینم لەبەرئەوەی حەزدەکەم ڕۆژووەوان بۆنی دەمی هەبێ، وە ئەگەر سیواکیش بکات ڕۆژووەکەی ناشکێ.

قال الشافعي: ولا أَكرَه السِّواكَ بالعُودِ الرَّطبِ واليابس وغيره بُكرَةً، وأَكرَهه بالعشيِّ لِما أحب مِن خَلوف فَم الصَّائم، وإن فعل لم يفطره.

كتاب الأم للشافعي | **(٦٥٥/١)**

**عبيدالله بن يحيى** دەڵێ: يحيى بۆی گێڕامەوە لە مالک ـەوە کە لە ئەهلی عیلمی بیستووە سیواک کردن بۆ ڕۆژووەوان لە ڕەمەزاندا لە هەر سەعاتێکدا بێ بەیانی یان ئێوارە کەراهەتی نەبووە لایان، وە نەم بیستووە لە هیچ یەکێک لە ئەهلی عیلم بە مەکروهی زانیبێ، وە نەهی لێ کردبێ.

وَحَدَّثَنِي، عَنْ مَالِك: أَنَّهُ سَمِعَ أَهْلَ الْعِلْمِ لَا يَكْرَهُونَ السِّوَاكَ لِلصَّائِمِ فِي رَمَضَانَ فِي سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ النَّهَارِ لَا فِي أَوَّلِهِ وَلَا فِي آخِرِهِ، وَلَمْ أَسْمَعْ أَحَدًا مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ يَكْرَهُ ذَلِكَ، وَلَا يَنْهَى عَنْهُ .

الموطأ لمالک | ٧٠٩

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی سیواک بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: کێشەی تێدا نییە سیواک و بۆن هەتا نیوەڕۆ، بەڵام لە کۆتایی ڕۆژدا خۆی لێ دەپاراست.

سألتُ أَبي عَن السِّواك للصائم؟ فقال: لا بأس بالسِّواكِ والطيب إلى الظهر، وَيتوقاه آخر النهار.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد ا ٦٨٥

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی سیواک لە کۆتایی ڕۆژدا؟ وتی: عبدالله بن عمر سیواکی دەکرد هەتا نیوەڕۆ، وە دەوترێ: بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای الله ﷻ لە بۆنی میسک خۆشترە.

سألتُ أَبي عَن السِّواك للصائم آخر النهار؟ فقال: كانَ ابنِ عمر يستاك عند الظهر، ويقال: خلوف فَم الصائم أطيَب عندالله من ريح المسك.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد ا ٦٨٦

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما سیواک کردنی بۆ ڕۆژووەوان بەلاوە ئاسایی بوو.

حَدَّثَنَا ابن عُلَيَّةَ، عَنْ أيُّوبَ، عَنْ نافعٍ، عَنِ ابن عمرَ، أنه لم يكُن يرى بأسًا بالسِّواكِ للصَّائم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٣٩

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما، دەڵێ: سیواک کردنی ڕۆژووەوان بە سیواکی تەڕ یاخود وشک کێشەی تێدا نییە.

حَدَّثَنَا علي بن الحَسنِ بن شَقيقٍ، أخبرنا أبو حَمزة، عَن إبراهيم الصائغ، عَن نافعٍ، عَن ابن عُمر رضي الله عنهما، قال: لا بأسَ أن يَستَاك الصَّائمُ بالسِّواك الرَّطبِ واليابس.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٦٢

**هشام بن عروة** دەڵێ: باوکم سیواکی دەکرد بە سیواکی تەڕ و وشک بەڕۆژووش بوو.

حَدَّثَنَا أبو مُعاوية وَوَكيع، عَنْ هشام بن عُروة، عَنْ أبيه، أَنَّه كان يَستَاكُ بالسِّواك الرَّطبِ وهو صائِم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٥٥ المصنف لعبدرزاق | ٧٦٢٣

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: کێشەی تێدا نییە سیواک کردنی ڕۆژووەوان لە سەرەتا و کۆتایی ڕۆژدا.

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: لَا بَأْسَ بِالسِّوَاكِ أَوَّلَ النَّهَارِ وَآخِرَهُ لِلصَّائِمِ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٢٨

**خصيف** دەڵێ: عطاء ابن أبي رباح وتی: هەرکات بەڕۆژوو بووی سەرەتای ڕۆژ سیواک بکە، بەڵام کۆتایی ڕۆژ سیواک مەکە. وتم: بۆچی کۆتایی ڕۆژ سیواک نەکەم؟ وتی: چونکە بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای الله ﷻ لە بۆنی میسک خۆشترە.

حَدَّثَنَا ابن فُضَيلٍ، عَنْ خُصَيفٍ، عَنْ عطاءٍ، قال: استَك أَوَّلَ النَّهَار، ولا تَستَك آخره إذا كنت صائمًا. قلت: لِمَ لا أَستَاك آخرِ النَّهارِ؟ قال: إِنَّ خُلوفَ الصَّائمِ أَطيبُ عند اللهِ مِنْ ريحِ المِسك.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٤٥

**عطاء ابن أبي رباح** دەڵێ: سیواک کردنی ڕۆژووەوان بە سیواکی تەڕ کێشەی تێدا نییە.

حَدَّثَنَا وَكيع، عَنْ سُفيان، عَنْ ابن جريجٍ، عَن عطاءٍ، قال: لا بأسَ بالسِّواك الرَّطبِ للصَّائِم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٥٩

**هشام بن حسان** دەڵێ: حسن البصري بە کێشەی نەدەبینی سیواک کردن بە سیواکی تەڕ کاتێک بەڕۆژوو بوو.

حَدَّثَنَا أبو أُسامة، عَنْ هشامٍ، عَنْ الحسنِ، أنَّه كان لا يرى بأسًا بالسِّواك الرَّطبِ وَهو صائِم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٥٨

**سلمة بن كهيل** دەڵێ: مجاهد سیواک کردنی لە کۆتایی ڕۆژ بەلایەوە کەراهەتی هەبوو.

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ كُهَيْلٍ، عَنْ مُجَاهِدٍ أَنَّهُ كَانَ يَكْرَهُ السِّوَاكَ لِلصَّائِمِ آخِرَ النَّهَارِ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٢٧

**أبي إسحاق** دەڵێ: عمرو بن شرحبيل وتی: ئەگەر بەڕۆژوو بووی سیواک مەکە بە سیواکی تەڕ، چونکە لە تەڕییەکەی دەچێتە ناو قوڕگت.

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ شُرَحْبِيلَ قَالَ: لَا تَسَوَّكْ بِسِوَاكٍ رَطْبٍ وَأَنْتَ صَائِمٌ، فَإِنَّهُ يَدْخُلُ فِي حَلْقِكَ مِنْ طَعْمِهِ.

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٢٥



# غەیبەت کردن لەگەڵ قسەی باتڵ و تاوان

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: الله ﷻ دەفەرموێ: هەموو عەمەلی بەنی آدم بۆ خۆیەتی بێجگە لە ڕۆژوو، ڕۆژوو بۆ منە وە من پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژوو قەڵغانە، وە ئەگەر یەکێک لە ئێوە بەڕۆژوو بوو با جنێو نەدات و دەمە قاڵێ نەکات، ئەگەر یەکێک جنێوی پێ بدات یاخود شەڕی لەگەڵ کرد، ئەوە با بڵێ: من بەڕۆژووم. سوێند بەو زاتەی نەفسی محمد ـی بە دەستە، بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای الله ﷻ لە بۆنی میسک خۆشترە. ڕۆژووەوان دوو خۆشی هەیە دڵ خۆشە پێیان: کاتێک بەربانگ دەکاتەوە دڵ خۆشە، وە کاتێکیش دەگاتەوە خزمەت پەروەردگاری دڵ خۆشە بە ڕۆژووەکەی.

عَنْ أَبِي صَالِحٍ الزَّيَّاتِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **قَالَ اللَّهُ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إِلَّا الصِّيَامَ، فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ، وَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ فَلاَ يَرْفُثْ وَلاَ يَصْخَبْ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ أَوْ قَاتَلَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ. وَالَّذِي نَفْسُ**

**مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ. لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا: إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ، وَإِذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ** ».

صحيح البخاري | ١٩٠٤ صحيح مسلم | ٢٧٠٦ سنن النسائي | ٢٢١٦ سنن ابن ماجه | ١٦٨٩ سنن الدارمي | ١٧٩٥ مسند أحمد | ٧٦٩٣ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٨٤ صحيح ابن خزيمة | ١٨٩٦

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک واز لە درۆ کردن و کارکردن پێی و باتڵ نەهێنێ، ئەوە الله ﷻ پێویستی بەو ڕۆژووەی نییە خۆی بگرێتەوە لە خواردن و خواردنەوە.

عَنْ ابْنُ أَبِي ذِئْبٍ، حَدَّثَنَا سَعِيدٌ الْمَقْبُرِيُّ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالْعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ للهِ حَاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ** ».

صحيح البخاري | ١٩٠٣ سنن أبي داود | ٢٣٦٢ سنن الترمذي | ٧١٦ سنن ابن ماجه | ١٦٨٩ مسند أحمد | ٩٨٣٩ صحيح ابن خزيمة | ١٩٩٥

**حفصة بنت سيرين** دەڵێ: أبي العالية دەڵێ: ڕۆژووەوان لە عیبادەتدایە مادام غەیبەتی کەس نەکات، تەنانەت ئەگەر هاتوو لەسەر جێگاکەی

خەوتبێ، حفصة دەیوت: خۆزگە بەو عیبادەتە، لەکاتێکدا من خەوتووم لەسەر جێگاکەم.

**هشام** دەڵێ: حفصة دەیوت: ڕۆژوو قەڵغانە مادام خاوەنەکەی کەلێنی تێ ناخات، کەلێنەکەی غەیبەتە.

عَنْ هِشَامٍ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي الْعَالِيَةِ، قَالَ: الصَّائِمُ فِي عِبَادَةٍ مَا لَمْ يَغْتَبْ أَحَدًا، وإِنْ كَانَ نَائِمًا عَلَى فِرَاشِهِ، فَكَانَتْ حَفْصَةُ، تَقُولُ: يَا حَبَّذَا عِبَادَةٌ، وَأَنَا نَائِمَةٌ عَلَى فِرَاشِي .

قَالَ هِشَام: وَقَالَتْ حَفْصَةُ: الصيَامُ جُنَّةٌ مَا لَمْ يَخْرِقْهَا صَاحِبُهَا، وَخَرْقُهَا الْغِيبَةُ.

المصنف لعبدرزاق | ٨٠٣٧ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٨١

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: دەیانوت: درۆ کردن ڕۆژوو دەشکێنێ.

حَدَّثَنَا أَبو مُعاوية، عَنِ الأعمشِ، عَن إبراهيمَ، قال: كانوا يقولونَ: الكَذِبُ يُفْطِرُ الصّائِمَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٧٨

**محمد بن سيرين** دەڵێ: كعب دەڵێ: ڕۆژووەوان لە عیبادەتدایە مادام غەیبەت نەكات.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، أَنَّ كَعْبًا قَالَ: الصَّائِمُ فِي عِبَادَةٍ مَا لَمْ يَغْتَبْ.

المصنف لعبدرزاق | ٨٠٣٨



## چ کاتێک ڕۆژووەوان بەربانگ دەکاتەوە

سهل بن سعد رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: بەردەوام خەڵکی لەسەر خێر و ڕێنمونی ڕاستن هەتا خێرا بکەن لە ڕۆژوو شکاندندا.

عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: « لَا يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ ».

صحيح البخاري | ١٩٥٧ صحيح مسلم | ٢٥٥٤ سنن الترمذي | ٧٠٨ سنن ابن ماجه | ١٦٩٧ سنن الدارمي | ١٧٢٥ الموطأ لمالك | ٦٥٢ مسند أحمد | ٢٢٨٥٩ كتاب الأم للشافعي | ٩١٢ مسند الشافعي | ٣٧٤ المصنف لعبدرزاق | ٧٧٢٦ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٤٤ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٥٩ كتاب الصيام للفريابي | ٣٨

الترمذي دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: ئەمە هەڵبژاردەی ئەهلی عیلمە لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ وە غەیری ئەوانیش پێیان باش بووە خێرا ڕۆژوو بشکێنرێ. وە قەولی شافعي و أحمد و إسحاق بن راهوية ـشە.

وَهُوَ الَّذِي اخْتَارَهُ أَهْلُ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمُ اسْتَحَبُّوا تَعْجِيلَ الْفِطْرِ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

**عمر بن الخطاب** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر شەو لێرەوە هات لە خۆرهەڵاتەوە، وە ڕۆژ لێرەوە ڕۆیشت لە خۆرئاواوە، وە خۆر نیشت، ئەوە ڕۆژووەوان ڕۆژوو دەشکێنێ.

عَنْ عَاصِمَ بْنَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ مِنْ هَاهُنَا، وَأَدْبَرَ النَّهَارُ مِنْ هَاهُنَا ، وَغَرَبَتِ الشَّمْسُ ، فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ** ».

صحيح البخاري | ١٩٥٤ صحيح مسلم | ٢٥٥٨ سنن أبي داود | ٢٣٥١ سنن الترمذي | ٧٠٧ سنن الدارمي | ١٧٢٦ مسند أحمد | ٣٣٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٢٢ مسند الحميدي | ٢٠ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٥٨ كتاب الصيام للفريابي | ٤٢

**عبدالله بن أبي أوفى** رضي الله عنه دەڵێ: لە سەفەرێكدا بووین لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ بە پیاوێكی وت: « دابەزە خۆراكەكەم بۆ ئامادە بكە ». پیاوەكەش وتی: ئەی ڕەسولی الله سەیری خۆر بكە. فەرمووی: « دابەزە

خۆراکەکەم بۆ ئامادە بکە ». پیاوەکەش وتی: ئەی ڕەسولی الله سەیری خۆر بکە. فەرمووی « دابەزە خۆراکەکەم بۆ ئامادە بکە ». ئیتر دابەزی خۆراکەکەی ئامادەکردوو ڕەسول الله ـش خواردی، پاشان بە دەستی ئاماژەی کرد وتی: « ئەگەر شەو لە خۆرئاواوە هات، ئەوە ڕۆژووەوان ڕۆژوو دەشکێنێ ».

عَنْ عَبْدُالله ابْنَ أَبِي أَوْفَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ الله ﷺ فِي سَفَرٍ، فَقَالَ لِرَجُلٍ: « **انْزِلْ فَاجْدَحْ لِي** ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه الشَّمْسُ. قَالَ: « **انْزِلْ فَاجْدَحْ لِي** ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه الشَّمْسُ. قَالَ: « **انْزِلْ فَاجْدَحْ لِي** ». فَنَزَلَ فَجَدَحَ لَهُ فَشَرِبَ، ثُمَّ رَمَى بِيَدِهِ هَاهُنَا، ثُمَّ قَالَ: « **إِذَا رَأَيْتُمُ اللَّيْلَ أَقْبَلَ مِنْ هَاهُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ** ».

صحيح البخاري | ١٩٤١ صحيح مسلم | ٢٥٥٩ سنن أبو داود | ٢٣٥٢ مسند أحمد | ١٩٣٩٥ المصنف لعبدرزاق | ٧٧٢٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٣٣ مسند الحميدي | ٧٣١

لە ڕیوایەتەکەی أبی داود ناوی ئەو پیاوە هاتووە کە خۆراکی بەربانگەکەی حازر کردووە، ئەو کەسە بلال بووە.

عَنْ عَبْدُاللهِ ابْنَ أَبِي أَوْفَى رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: سِرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلَمَّا غَرَبَتِ الشَّمْسُ قَالَ: « **يَا بِلَالُ، انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا** ... »

سنن أبي داود | ٢٣٥٢

فاجدح: واتە تێکەڵ کردنی دوو شت پێکەوە لە دەفرێکدا، لێرەدا مەبەست لێی ئارد و ئاوە پێکەوە تێکەڵ بکرێن!

**أبي عطية** دەڵێ: لەگەڵ مەسروق چووینە خزمەت عائشە رضي الله عنها، وتمان: ئەی دایکی ئیمانداران دوو کەس لە هاوەڵانی ڕەسول الله ﷺ یەکێکیان خێرا ڕۆژوو دەشکێنێ، خێراش نوێژ دەکات، ئەویتریان درەنگ ڕۆژوو دەشکێنێ، وە نوێژیش دوا دەخات، وتی: ئەوەیان خێرا ڕۆژوو دەشکێنێ، زوو نوێژیش دەکات کێیە؟ وتمان: عبدالله بن مسعود، وتی: ڕەسول الله ﷺ بەو شێوەیەی دەکرد.

عَنْ أَبِي عَطِيَّةَ، قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ عَلَى عَائِشَةَ رَضيَ اللهُ عَنْهَا، فَقُلْنَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رَجُلَانِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ ﷺ، أَحَدُهُمَا: يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ، وَيُعَجِّلُ الصَّلَاةَ، وَالْآخَرُ يُؤَخِّرُ الْإِفْطَارَ، وَيُؤَخِّرُ الصَّلَاةَ، قَالَتْ:

أَيُّهُمَا الَّذِي يُعَجِّلُ الْإِفْطَارَ، وَيُعَجِّلُ الصَّلَاةَ؟ قَالَ: قُلْنَا: عَبْدُ الله -يَعْنِي ابْنَ مَسْعُودٍ- قَالَتْ: كَذَلِكَ كَانَ يَصْنَعُ رَسُولُ الله ﷺ.

صحيح مسلم | ٢٥٥٦ سنن أبي داود | ٢٣٥٤ سنن الترمذي | ٧١١ سنن النسائي | ٢١٦٠ مسند أحمد | ٢٤٢١٢ كتاب الصيام للفريابي | ٥٨

**سعيد بن المسيب** لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: لای عمر بن الخطاب رضي الله عنه دانیشت بووم، کەسێکی سواری لە شامەوە هات عمر هەواڵی حاڵیانی دەپرسی، وتی: ئایا ئەهلی شام خێرا ڕۆژوو دەشکێنن؟ وتی: بەڵێ. وتی: بەردەوام لەسەر خێرن هەتا ئاوا بکەن، وە چاوەڕوانی دەرهاتنی ئەستێرەکان نەکەن وەک چاوەڕوانی ئەهلی عێراق.

أَخبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، إِذْ جَاءَهُ رَاكِبٌ مِنَ الشَّامِ فَطَفِقَ عُمَرُ يَسْتَخْبِرُ عَنْ حَالِهِمْ، فَقَالَ: هَلْ يُعَجِّلُ أَهْلُ الشَّامِ الْفِطْرَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: لَنْ يَزَالُوا بِخَيْرٍ مَا فَعَلُوا ذَلِكَ، وَلَمْ يَنْتَظِرُوا النُّجُومَ انْتِظَارَ أَهْلِ الْعِرَاقِ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٧٢٣ كتاب الصيام للفريابي | ٤٦

**قيس** دەڵێ: عمر بن الخطاب رضي الله عنه قاپێکی دایە دەست پیاوێک لە تەنیشتی بوو کاتێک خۆرئاوا بوو، وتی: بخۆرەوە، پاشان وتی: لەوانەیە لەو کەسانە بی کە درەنگ ڕۆژوو دەشکێنن و دەڵێن دواتر دواتر.

حَدَّثَنَا ابن فُضَيلٍ، عَنْ بَيانٍ، عَنْ قَيسٍ، قال: ناوَلَ عُمَر رَجُلًا إِناءً إلى جَنبه حِينَ غَرَبَتِ الشَّمسُ، فقال له: اشرَب، ثُمَّ قال: لعلكَ مِنَ الْمُسوِّفين بِفطرِه سَوْفَ سَوْفَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٤٩ كتاب الصيام للفريابي | ٤٩

**مجاهد** دەڵێ: من خۆراکی ڕۆژوو شکاندنی عبدالله بن عمر ـم دەهێنا دام دەپۆشی شەرمم دەکرد لە خەڵکی نەوەک ببینن و بڵێن زوو ڕۆژوو دەشکێنێ.

حَدَّثَنَا أبو مُعَاويةَ، عَنِ الأعمَشِ، عَنْ مُجاهدٍ، قال: إنِّي كُنتُ لآتي ابن عُمرَ بِفطرِه فأُغَطِّيه استحياءً مِن الناسِ أن يروه.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٤١ المصنف لعبدرزاق | ٧٧٢٧ كتاب الصيام للفريابي | ٥٥

**حميد** دەڵێ: ئێمە لای أنس بن مالك بووین رضي الله عنه بەڕۆژوو بوو داوای نانی ئێوارەی کرد، ثابت البناني لای کردەوە سەیری خۆری کرد وای دەبینی خۆر ئاوا نەبووە، أنس وتی: ئەگەر لای عمر بوویتایە، ئەوە تووڕە دەبوو لێت.

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى، حَدَّثَنَا مُعْتَمِرٌ قَالَ سَمِعْتُ حُمَيْدًا الْحَارِثَ، عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: كُنَّا عِنْدَ أَنَسٍ، وَكَانَ صَائِمًا فَدَعَا بِعَشَائِهِ، فَالْتَفَتَ ثَابِتٌ يَنْظُرُ إِلَى الشَّمْسِ وَهُوَ يَرَى أَنَّ الشَّمْسَ لَمْ تَغِبْ، فَقَالَ أَنَسٌ لِثَابِتٍ: لَوْ كُنْتَ عِنْدَ عُمَرَ لَأَحْفَظَكَ.

كتاب الصيام للفريابي ا ٥٠

وتم: شێخی معتمر بن سليمان لە سەنەدەکە بە حميد الحارث هاتووە، والله أعلم ئەمە غەڵەتە، بەڵکو پێم وایە حميد الطويل ـە حميد بن أبي حميد الطويل أبو عبيدة الخزاعي البصري،ساڵی «١٤٣» هیجری وەفاتی کردووە، أنس بن مالك ـی بینیوە و ڕیوایەتی لێوە کردووە، هەروەها حميد الطويل تەلەبەی ثابت البناني ـیە ثابت بن أسلم البناني أبو محمد البصري، «١٢٧» هیجری وەفاتی کردووە، شێخی حميد الطويل ـە. جا وەک لە ئەثەرەکە دەیبینن لە مەتنەکەدا ناوی ثابت هاتووە ئەمە زیاتر

لەگەڵ ئەوە دەگونجێ حميد الطويل ڕاوی خەبەرەکەیە لە أنس ـەوە نەک حميد الحارث، بێجگە لەوە لە کتێبی تهذيب الكمال گەڕاوم حميد الحارث بوونی نەبوو.

**حميد** دەڵێ: أنس بن مالک رضي الله عنه چاوەڕێی بانگ بێژی نەدەکرد لە کاتی ڕۆژوو شکاندندا بەڵکو زوو دەیشکاند.

حَدَّثَنَا وَهْبُ بْنُ بَقِيَّةَ، أَخْبَرَنَا خَالِدٌ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ، أَنَّهُ لَمْ يَكُنْ يَنْتَظِرُ الْمُؤَذِّنَ فِي الْإِفْطَارِ وَكَانَ يُعَجِّلُ الْفِطْرَ.

كتاب الصيام للفريابي | ٥١

**أبو رجاء** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما کەسێکی دەنارد چاودێری خۆر بکات، هەرکات ئاوا دەبوو ڕۆژووی دەشکاند، وە پێش نوێژ ڕۆژووی دەشکاند.

حَدَّثَنَا أَبُو قُدَامَةَ عُبَيْدُاللَّهِ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ سَعِيدٍ، عَنْ عَوْفٍ، حَدَّثَنَا أَبُو رَجَاءٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَبْعَثُ مُرْتَقِبًا يَرْقُبُ الشَّمْسَ، فَإِذَا غَابَتْ أَفْطَرَ، وَكَانَ يُفْطِرُ قَبْلَ الصَّلَاةِ.

كتاب الصيام للفريابي | ٥٣

**عمرو بن ميمون الأودي** دەڵێ: صەحابەی محمد ﷺ خێراترینی خەڵکی بوون لە ڕۆژوو شکاندندا، وە لەسەرخۆترین بوون لە پارشێو کردندا.

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ الْأَوْدِيِّ، قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ أَسْرَعَ النَّاسِ إِفْطَارًا وَأَبْطَأَهُمْ سُحُورًا .

المصنف لعبدرزاق ا ٧٧٢٥ كتاب الصيام للفريابي ا ٥٦



## بەربانگ کردنەوە بۆ کەسی ڕۆژووەوان

زيد بن خالد الجهني رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک بەربانگ بۆ ڕۆژووەوانێک بکاتەوە ئەوە هێندەی ڕۆژووەکەی ئەو پاداشتی دەست دەکەوێ بە بێ ئەوەی هیچ ئەجرێک لە ڕۆژووی ڕۆژووەوانەکە کەم بکات.

عَنْ عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ غَيْرَ أَنَّهُ لاَ يَنْقُصُ مِنْ أَجْرِ الصَّائِمِ شَيْئًا ».

سنن الترمذي ا ٨١٨ سنن ابن ماجه ا ١٧٤٦ سنن الدارمي ا ١٧٢٨ مسند أحمد ا ١٧٠٣٣ المصنف لعبدرزاق ا ٨٠٤٧ صحيح ابن خزيمة ا ٢٠٦٤

أبي هريرة رضي الله عنه دەڵێ: هەرکەسێک بەربانگ بۆ ڕۆژووەوانێک بکاتەوە، خواردن و خواردنەوەی پێشکەش بکات، ئەوە هێندەی ڕۆژووی ڕۆژووەوانەکە پاداشتی دەست دەکەوێ.

أَخْبَرَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ، عَنْ صَالِحٍ مَوْلَى التَّوْءَمَةِ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: مَنْ فَطَّرَ صَائِمًا، أَطْعَمَهُ وَسَقَاهُ، كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِهِ.

المصنف لعبدرزاق | ٨٠٤٨



# بەربانگ کردنەوە بە خورما یاخود ئاو

سلمان بن عامر رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: گەر یەکێک لە ئێوە بەڕۆژوو بوو ئەوە با بە خورما ڕۆژووەکەی بشکێنێ، ئەگەر خورما نەبوو ئەوە با بە ئاو بیشکێنێ، چونکە ئاو پاکە.

عَنِ الرَّبَابِ الضَّبِّيَّةِ، عَنْ عَمِّهَا سَلْمَانَ بْنِ عَامِرٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « إِذَا كَانَ أَحَدُكُمْ صَائِمًا فَلْيُفْطِرْ عَلَى التَّمْرِ، فَإِنْ لَمْ يَجِدِ التَّمْرَ فَعَلَى الْمَاءِ، فَإِنَّ الْمَاءَ طَهُورٌ ».

سنن أبي داود | ٢٣٥٥ سنن الترمذي | ٧٠٤ سنن ابن ماجه | ١٦٩٩ سنن الدارمي | ١٧٢٧ مسند أحمد | ١٦٢٢٦ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٨٨٦ مسند الحميدي | ٨٤٣ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٦٧ كتاب الصيام للفريابي | ٦٣

أنس بن مالك رضي الله عنه دەڵێ: قەت نەبووە ڕەسول الله ﷺ ببینم نوێژ بکات پێش ڕۆژوو شکاندن، ڕۆژووەکەی دەشکاند ئەگەر بە قومە ئاوێکیش بووایە.

حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا حُسَيْنُ بْنُ عَلِيٍّ، عَنْ زَائِدَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ قَطُّ يُصَلِّي حَتَّى يُفْطِرَ، وَلَوْ عَلَى شَرْبَةٍ مِنْ مَاءٍ.

كتاب الصيام للفريابي | ٦٩

**عبدالواحد بن أيمن** لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: چووم بۆ لای أبو سعيد الخدري رضي اللەعنه، بينيم ڕۆژووەکەی بە خورما شکاند.

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَن عبدالواحد بنِ أيمَنَ، عَن أبيه، عَن أبي سعيدٍ، قال: دَخلتُ عليه فأفطَرَ على تمَرٍ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٨٨٨



# نوێژی تەڕاویح و شێوازەکانی ئەنجامدانی

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: پیاوێک پرسیاری کرد لە ڕەسول الله ﷺ دەربارەی شەو نوێژ، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: شەو نوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەگەر کەسێک لە ئێوە ترسا بانگی بەیانی بدات، ئەوە با ڕکاتێک بکات نوێژەکانی تری بۆ تاک دەکات.

عَنْ نَافِعٍ وَعَبْدِالله بنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ عَنْ صَلَاةِ اللَّيْلِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، فَإِذَا خَشِيَ أَحَدُكُمُ الصُّبْحَ صَلَّى رَكْعَةً وَاحِدَةً، تُوتِرُ لَهُ مَا قَدْ صَلَّى** ».

صحيح البخاري ١١٣٧ | صحيح مسلم ١٧٤٩ | سنن أبي داود ١٣٢٦ | سنن الترمذي ٤٣٩ | سنن النسائي ١٦٦٨ | مسند أحمد ٤٥٥٩ | الموطأ لمالك ٢٧٥ | المصنف لعبدرزاق ٤٧٣١ | صحيح ابن خزيمة ١٠٧٢

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای ئەهلی عیلم: شەو نوێژ دوو ڕکات دوو ڕکاتە، ئەمە قەولی

سفيان الثوري و عبدالله بن مبارک و شافعي و أحمد و إسحاق بن راهوية ـشه.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: أَنَّ صَلاَةَ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ، وَالشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ، وَإِسْحَاقَ.

**كريب** خزمەتكاری عبدالله بن عباس دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما بۆی گێڕاوەتەوە شەوێک لە ماڵی دایکی ئیمانداران میمونة ماوەتەوە کە پوریەتی، من سەرم لەسەر پانتایی پشتییەکە بوو، وە ڕەسول الله ﷺ لەگەڵ خێزانی سەریان لەسەر درێژییەکەی بوو، ڕەسول الله ﷺ خەوت کاتێک نیوە شەو بوو یاخود کەمێک پێش نیوە شەو یان کەمێک دوای نیوە شەو، ڕەسول الله ﷺ خەبەری بوویەوە دانیشت بە دەستی ئاسەواری خەوی لە ڕوومەتی دەسڕییەوە، پاشان دە ئایەتی کۆتایی سورەتی آل عمران ـی خوێند، پاشان هەستایەوە بۆ کونەیەکی هەڵواسراو، دەست نوێژی لێ گرت بە جوانترین دەست نوێژ، پاشان هەستایەوە دەستی کرد بە نوێژ کردن، منیش هەستامەوە بە هەمان شێوەی ئەوم کرد، پاشان چووم لە تەنیشتیەوە وەستام، ڕەسول الله ﷺ دەستی ڕاستی خستە سەر سەرم، گوێی ڕاستی دەخوراندم، دوو ڕکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی

کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد، پاشان ڕکاتێک ویتری کرد، پاشان ڕاکشا هەتا بانگ بێژ هات، ئەنجا دوو ڕکاتی کورتی کرد.

عَنْ كُرَيْبٍ مَوْلَى ابنِ عَبَّاسٍ، أَنَّ عَبْدَاللهَ بْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُما، أَخْبَرَهُ أَنَّهُ بَاتَ عِنْدَ مَيْمُونَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَهِيَ خَالَتُهُ، فَاضْطَجَعَ فِي عَرْضِ الْوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَهْلُهُ في طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حَتَّى إِذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ، أَوْ قَبْلَهُ قَلِيلًا أَوْ بَعْدَهُ قَلِيلًا اسْتَيْقَظَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَجَلَسَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ بِيَدِهِ، ثُمَّ قَرَأَ الْعَشْرَ الْآيَاتِ الْخَوَاتِيمَ مِنْ سُورَةِ آلِ عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ إِلَى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ، فَتَوَضَّأَ مِنْهَا فَأَحْسَنَ وُضُوءَهُ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي. قَالَ عَبْدُاللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: فَقُمْتُ فَصَنَعْتُ مِثْلَ مَا صَنَعَ، ثُمَّ ذَهَبْتُ فَقُمْتُ إِلَى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَدَهُ الْيُمْنَى عَلَى رَأْسِي، وَأَخَذَ بِأُذُنِي الْيُمْنَى يَفْتِلُهَا، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ أَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ الْمُؤَذِّنُ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ.

صحيح البخاري | ١٨٣ صحيح مسلم | ١٧٨٩ سنن أبي داود | ١٣٦٧ سنن النسائي | ١٦٢٠ سنن ابن ماجه | ١٣٦٣ مسند أحمد | ٢١٦٤ الموطأ لمالک | ٢٧٣ المصنف لعبدرزاق | ٤٧٥٩

**زيد بن خالد الجهني** رضي الله عنه دەڵێ: ئەمشەو سەیری نوێژی ڕەسول الله ﷺ دەکەم، دوو ڕکاتی کورتی کرد، پاشان دوو ڕکاتی زۆر زۆر زۆر درێژی کرد، پاشان دوو ڕکاتی کرد کە هێندەی ئەوەی پێش خۆی نەبوو، پاشان دوو ڕکاتی کرد کە هێندەی ئەوەی پێش خۆی نەبوو، پاشان دوو ڕکاتی کرد کە هێندەی ئەوەی پێش خۆی نەبوو، پاشان دوو ڕکاتی کرد کە هێندەی ئەوەی پێش خۆی نەبوو، پاشان ڕکاتێک ویتری کرد، ئەمە کردیە سیانزە ڕکات.

عَنْ زَيْدِ بْنِ خَالِدٍ الْجُهَنِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ: لَأَرْمُقَنَّ صَلَاةَ رَسُولِ اللهِ ﷺ اللَّيْلَةَ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ طَوِيلَتَيْنِ، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ وَهُمَا دُونَ اللَّتَيْنِ قَبْلَهُمَا، ثُمَّ أَوْتَرَ، فَذَلِكَ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً.

صحيح مسلم | ١٨٠٤ سنن أبي داود | ١٣٦٦ مسند أحمد | ٢١٦٨٠ الموطأ لمالک | ٢٧٤ المصنف لعبدرزاق | ٤٧٦٣

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: نوێژی ڕەسول الله ﷺ لە شەودا سیانزە ڕکات بوو.

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ صَلاَةُ النَّبِيِّ ﷺ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يَعْنِي بِاللَّيْلِ .

صحيح البخاري | ١١٣٨ صحيح مسلم | ١٨٠٣ مسند أحمد | ٢٠١٩

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ بە شەودا سیانزە ڕکات نوێژی دەکرد، پاشان کە بانگی دەبیست دوو ڕکاتی کورتی دەکرد.

عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ثَلاَثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي إِذَا سَمِعَ النِّدَاءَ بِالصُّبْحِ رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ .

صحيح البخاري | ١١٧٠ صحيح مسلم | ١٦٨١ الموطأ لمالک | ٢٧٢ مسند أحمد | ٢٥٤٤٧

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ بە شەودا سیانزە ڕکات نوێژی دەکرد بە ویترەکە و دوو ڕکات سونەتی نوێژی بەیانییەوە.

عَنِ الْقَاسِمِ بْنِ مُحَمَّدٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً مِنْهَا الْوِتْرُ وَرَكْعَتَا الْفَجْرِ.

صحيح البخاري | ١١٤٠ صحيح مسلم | ١٧٢٧ مسند أحمد | ٢٥٣١٩

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هەرکات هەستایە بۆ شەو نوێژ، نوێژەکەی بە دوو ڕکاتی کورت دەست پێ دەکرد.

عَنْ سَعْدِ بْنِ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا قَامَ مِنَ اللَّيْلِ، لِيُصَلِّيَ افْتَتَحَ صَلَاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ.

صحيح مسلم | ١٨٠٦ مسند أحمد | ٢٤٠١٧

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک لە ئێوە هەستایەوە ئەوە با نوێژەکەی بە دوو ڕکاتی کورت دەست پێ بکات.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: « **إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَفْتَتِحْ صَلَاتَهُ بِرَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ** ».

صحيح مسلم | ١٨٠٧ سنن أبي داود | ١٣٢٣ مسند أحمد | ٧١٧٦

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ بە شەودا سیانزە ڕکات نوێژی دەکرد، پێنج ڕکاتیان ویتر بوو دانەدەنیشت بۆ تەحیات ئیللا لە کۆتا ڕکاتدا نەبێ.

عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ ثَلَاثَ عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُوتِرُ مِنْ ذَلِكَ بِخَمْسٍ، لَا يَجْلِسُ فِي شَيْءٍ إِلَّا فِي آخِرِهَا.

صحيح مسلم | ١٧٢٠ سنن أبي داود | ١٣٣٨ سنن الترمذي | ٤٦٢ سنن النسائي | ١٧١٧ مسند أحمد | ٢٥٧٠٢ المصنف لعبدرزاق | ٤٧١٧ مسند الحميدي | ١٩٥ صحيح ابن خزيمة | ١٠٧٧

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ یانزە ڕکات نوێژی دەکرد، ئەوە نوێژی ئەو بوو سوجدەی دەبرد دەماوەیە هێندەی یەکێک لە ئێوە

پەنجا ئایەت بخوێنێ، وە دوو ڕکاتی دەکرد پێش نوێژی بەیانی، پاشان لەسەر شانی ڕاستی ڕادەکشا هەتا بانگ بێژ بانگی دەدا.

عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عُرْوَةُ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، كَانَتْ تِلْكَ صَلاَتَهُ يَسْجُدُ السَّجْدَةَ مِنْ ذَلِكَ قَدْرَ مَا يَقْرَأُ أَحَدُكُمْ خَمْسِينَ آيَةً قَبْلَ أَنْ يَرْفَعَ رَأْسَهُ، وَيَرْكَعُ رَكْعَتَيْنِ قَبْلَ صَلاَةِ الْفَجْرِ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُنَادِي لِلصَّلاَةِ .

صحيح البخاري | ١١٢٣ صحيح مسلم | ١٧١٨ سنن النسائي | ١٧٤٩ الموطأ لمالک | ٢٧٠ مسند أحمد | ٢٤٥٧٧

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول اللە ﷺ لە شەودا یانزە ڕکات نوێژی دەکرد، یەک ڕکاتیان ویتر بوو، پاشان لەسەر شانی ڕاستی ڕادەکشا هەتا بانگ بێژ بانگی دەدا، ئەنجا دوو ڕکاتی کورتی دەکرد.

عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُوتِرُ مِنْهَا بِوَاحِدَةٍ، ثُمَّ يَضْطَجِعُ عَلَى شِقِّهِ الأَيْمَنِ حَتَّى يَأْتِيَهُ الْمُؤَذِّنُ، فَيُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ خَفِيفَتَيْنِ.

صحيح البخاري | ٩٩٤ صحيح مسلم | ١٧١٧ سنن أبي داود | ١٣٣٥ سنن الترمذي | ٤٤٢ سن النسائي | ١٦٩٦ مسند أحمد | ٢٤٠٧٠ الموطأ لمالك | ٢٧٠ المصنف لعبدرزاق | ٤٧٥٥

**أبي سلمة بن عبدالرحمن** دەڵێ: لە عائشة ـ پرسی نوێژی ڕەسول الله ﷺ چۆن بوو لە ڕەمەزاندا؟ وتی: ڕەسول الله ﷺ لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزان لە یانزە ڕکات زیاتری نەدەکرد، چوار ڕکاتی دەکرد هەر مەپرسە لە جوانی و درێژییان، پاشان چوار ڕکاتی تری دەکرد هەر مەپرسە لە جوانی و درێژییان، پاشان سێ ڕکاتی دەکرد.

عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي سَعِيدٍ الْمَقْبُرِيِّ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ، أَنَّهُ أَخْبَرَهُ أَنَّهُ سَأَلَ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: كَيْفَ كَانَتْ صَلَاةُ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي رَمَضَانَ؟ فَقَالَتْ: « **مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَزِيدُ فِي رَمَضَانَ وَلَا فِي غَيْرِهِ عَلَى إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً، يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي أَرْبَعًا فَلَا تَسَلْ عَنْ حُسْنِهِنَّ وَطُولِهِنَّ، ثُمَّ يُصَلِّي ثَلَاثًا** ».

صحيح البخاري | ١١٤٧ صحيح مسلم | ١٧٢٣ سنن أبي داود | ١٣٤١ سنن الترمذي | ٤٤١ سنن النسائي | ١٦٩٧ الموطأ لمالك | ٢٧١ مسند أحمد | ٢٤٠٧٣ المصنف لعبدرزاق | ٤٧٦٢

**السائب بن يزيد** دەڵێ: عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەمری کرد بە أبي بن کعب و تميم الداري رضي الله عنهما لە تەڕاویحدا ئیمامەت بکەن بۆ خەڵکی بە یانزە ڕکات، قارئ دوو سەد ئایەتی دەخوێند، ئیمام هێندە وەستانی درێژ بوو قورئانی زۆری تێدا دەخوێند ئێمە خۆمان لەسەر گۆچان ڕادەگرت، وە کاتێک تەواو دەبووین و دەچووینەوە کاتی دەرکەوتنی فەجر بوو.

عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يُوسُفَ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ وَتَمِيمًا الدَّارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنْ يَقُومَا لِلنَّاسِ بِإِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً. قَالَ: وَقَدْ كَانَ الْقَارِئُ يَقْرَأُ بِالْمِئِينَ، حَتَّى كُنَّا نَعْتَمِدُ عَلَى الْعِصِيِّ مِنْ طُولِ الْقِيَامِ، وَمَا كُنَّا نَنْصَرِفُ إِلَّا فِي فُرُوعِ الْفَجْرِ.

الموطأ لمالک | ٢٥٨ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٦٨ کتاب الصيام للفريابي | ١٧٤

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هەرکاتێک ویتری بە نۆ ڕکات بکردایە دانەدەنیشت هەتا ڕکاتی هەشتەم، حەمدی الله ﷻ دەکرد و زیکری دەکرد و دوعای دەکرد تەحیاتی دەخوێند، سەلامی نەدەدایەوە و هەڵدەستایەوە، ئەنجا ڕکاتی نۆیەمی دەکرد، دادەنیشت زیکری الله ﷻ دەکرد و دوعای دەکرد تەحیاتی دەخوێند، پاشان سەلامی دەدایەوە سەلامەکەیان دەبیست، پاشان دوو ڕکاتی دەکرد بە دانیشتنەوە، بەڵام کاتێک چوویە تەمەنەوە و بێ هێز بوو ویتری بە حەوت ڕکات دەکرد، دانەدەنیشت هەتا ڕکاتی شەشەم، سەلامی نەدەدایەوە و هەڵدەستایەوە، ئەنجا ڕکاتی حەوتەمی دەکرد، پاشانی سەلامی دەدایەوە، پاشان دوو ڕکاتی دەکرد بە دانیشتنەوە.

عَنْ سَعْدَ بْنَ هِشَامٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَوْتَرَ بِتِسْعِ رَكَعَاتٍ لَمْ يَقْعُدْ إِلَّا فِي الثَّامِنَةِ، فَيَحْمَدُ اللَّهَ وَيَذْكُرُهُ وَيَدْعُو، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يُصَلِّي التَّاسِعَةَ، فَيَجْلِسُ فَيَذْكُرُ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ وَيَدْعُو، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ، فَلَمَّا كَبِرَ وَضَعُفَ أَوْتَرَ بِسَبْعِ رَكَعَاتٍ، لَا يَقْعُدُ إِلَّا فِي السَّادِسَةِ، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، فَيُصَلِّي السَّابِعَةَ، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمَةً، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ وَهُوَ جَالِسٌ.

صحيح مسلم | ١٧٤٠ سنن أبي داود | ١٣٤٣ سنن النسائي واللفظ له | ١٧١٩ مسند أحمد | ٢٤٢٦٩ صحيح ابن خزيمة | ١٠٧٨

**مسروق** دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائشة رضي الله عنها دەربارەی نوێژی ڕەسول الله ﷺ بە شەودا؟ وتی: حەوت ڕكات و نۆ ڕكات، هەروەها یانزە ڕكات بێجگە لە دوو ڕكات سوننەتی نوێژی بەیانی.

عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا عَنْ صَلَاةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ بِاللَّيْلِ، فَقَالَتْ: سَبْعٌ وَتِسْعٌ، وَإِحْدَى عَشْرَةَ، سِوَى رَكْعَتِي الْفَجْرِ.

صحيح البخاري | ١١٣٩

**أبي أيوب الأنصاري** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ویتر حەق و مافە بەسەر هەموو کەسێکی موسڵمانەوە، هەرکەس حەزی لێ بوو دەتوانێ پێنج ڕكات بکات، وە هەرکەس حەزی لێ بوو دەتوانێ سێ ڕكات بکات، وە هەرکەسیش حەزی لێ بوو ئەوە با ڕکاتێک بکات.

عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «**الْوِتْرُ حَقٌّ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ، فَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِخَمْسٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِثَلَاثٍ فَلْيَفْعَلْ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يُوتِرَ بِوَاحِدَةٍ فَلْيَفْعَلْ**».

سنن أبي داود | ١٤٢٢ سنن النسائي | ١٧١٢ سنن ابن ماجه | ١١٩٠
مسند أحمد | ٢٣٥٤٥ المصنف لعبدرزاق | ٤٦٨٣

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: هەرکەسێک شەو نوێژ دەکات ئەوە با کۆتا نوێژی تاک بێ، چونکە ڕەسول الله ﷺ ئەمری بەوە دەکرد.

عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: مَنْ صَلَّى مِنَ اللَّيْلِ فَلْيَجْعَلْ آخِرَ صَلَاتِهِ وِتْرًا، فَإِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يَأْمُرُ بِذَالِكَ.

صحيح البخاري | ٤٧٢ صحيح مسلم | ١٧٥٤ سنن النسائي | ١٦٨٢
مسند أحمد | ٤٩٧١

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: با کۆتا نوێژتان لە شەو نوێژدا تاک بێ.

عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: « **اجْعَلُوا آخِرَ صَلَاتِكُمْ بِاللَّيْلِ وِتْرًا** ».

صحيح البخاري | ٩٩٨ صحيح مسلم | ١٧٥٥ مسند أحمد | ٤٧١٠
صحيح ابن خزيمة | ١٠٨٢

**إبن شهاب الزهري** دەڵێ: سعد بن أبي وقاص رضي الله عنه دوای نوێژی عیشا یەک ڕکات ویتری دەکرد.

عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، كَانَ يُوتِرُ بَعْدَ الْعَتَمَةِ بِوَاحِدَةٍ .

الموطأ لمالک | ٢٨٣ صحيح البخاري | ٦٣٥٦ مسند أحمد | ٢٣٦٦٧

**مالک** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم خەبەرە دەڵێ: عەمەل کردن پێی لای ئێمە بەم جۆرە نییە، بەڵکو کەمترینی ویتر سێ ڕکاتە.

قَالَ مَالِكٌ: وَلَيْسَ عَلَى هَذَا الْعَمَلُ عِنْدَنَا، وَلَكِنْ أَدْنَى الْوِتْرِ ثَلَاثٌ.

**عبيدالله بن أبي يزيد** دەڵێ: معاوية ـم بینی نوێژی عیشای کرد، پاشان بە دوایدا یەک ڕکات ویتری کرد، ئەمەم بۆ عبدالله بن عباس گێڕایەوە، وتی: دروستە و پێکاویەتی.

عَنِ ابن عُيينة، عَن عبيدالله بن أبي يزيد، قال: رأيتُ مُعاوية صلى العشاء، ثُمَّ أوتَرَ بعدها بركعةٍ، فذكرت ذالکَ لابن عبَّاسَ، فقال: أصَابَ.

المصنف لعبدرزاق | ٤٧٠٢

## نوێژی تەڕاویح بە جەماعەت

**عطاء ابن أبي رباح** دەڵێ: نوێژی تەڕاویح لەسەردەمی ڕەسول الله ـدا ﷺ بەو جۆرە بوو هەرکەس بۆ خۆی دەیکرد، وە پیاو هەبوو لە پشت پیاوێکی ترەوە بە جەماعەت دەیکرد، یەکەم کەس خەڵکی کۆ کردەوە لە پشت ئیمامێکەوە عمر بوو رضي الله عنه.

**إبن جريج** دەڵێ: عمرو بن دينار خەبەری دامێ کە عمر رضي الله عنه ئەو خەڵکەی لە پشت ئیمامێکەوە کۆ کردنەوە.

عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، أَنَّ الْقِيَامَ كَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي رَمَضانَ، يَقُومُ النَّفَرُ، وَالرَّجُلُ كَذَالِكَ هَاهُنَا وَالنَّفَرُ وَرَاءَ الرَّجُلِ، فَكَانَ عُمَرُ أَوَّلَ مَنْ جَمَعَ النَّاسَ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ .

قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: وَأَخْبَرَنِي عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، قَالَ: جَمَعَهُمْ عُمَرُ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ.

المصنف لعبدرزاق | ٧٨٧٣

**عروة بن الزبير** دەڵێ: عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەمری کرد بە أبي بن كعب لە مانگی ڕەمەزاندا نوێژی تەڕاویح بە جەماعەت بکات بۆ خەڵکی.

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَمَرَ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ أَنْ يُصَلِّيَ بِالرِّجَالِ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ.

كتاب الصيام للفريابي ا ١٧٣

**السائب بن يزيد** دەڵێ: عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئەمری کرد بە أبي بن كعب و تميم الداري رضي الله عنهما لە تەڕاویحدا ئیمامەت بکەن بۆ خەڵکی بە یانزە ڕکات، قارئ دوو سەد ئایەتی دەخوێند، ئیمام هێندە وەستانی درێژ بوو قورئانی زۆری تێدا دەخوێند ئێمە خۆمان لەسەر گۆچان ڕادەگرت، وە کاتێک تەواو دەبووین و دەچووینەوە کاتی دەرکەوتنی فەجر بوو.

عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يُوسُفَ، عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، أَنَّهُ قَالَ: أَمَرَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ وَتَمِيمًا الدَّارِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنْ

يَقُومَا لِلنَّاسِ بِإِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً. قَالَ: وَقَدْ كَانَ الْقَارِئُ يَقْرَأُ بِالْمِئِينَ، حَتَّى كُنَّا نَعْتَمِدُ عَلَى الْعِصِيِّ مِنْ طُولِ الْقِيَامِ، وَمَا كُنَّا نَنْصَرِفُ إِلَّا فِي فُرُوعِ الْفَجْرِ.

الموطأ لمالک | ٢٥٨ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٦٨ كتاب الصيام للفريابي | ١٧٤

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ حەز و ڕەغبەتی لە تەڕاویح بوو لە ڕەمەزاندا بە جەماعەت، بەڵام ئەمری پێ نەدەکرد، دەیفەرموو: « هەرکەسێک شەوانی ڕەمەزان بە شەو نوێژ زیندوو بکاتەوە، وە باوەڕی پێی هەبێ و چاوەڕێی پاداشتەکەی بێ، ئەوە الله ﷻ لە تاوانەکانی پێشووی خۆش دەبێ ». إبن شهاب دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ وەفاتی کرد بابەتەکە بەو جۆرە بوو هەتا خیلافەتی أبي بکر رضي الله عنه، وە سەرەتای خیلافەتی عمر رضي الله عنه.

عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُرَغِّبُ فِي قِيَامِ رَمَضَانَ مِنْ غَيْرِ أَنْ يَأْمُرَ بِعَزِيمَةٍ، فَيَقُولُ: « **مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ**

**مِنْ ذَنْبِهِ** ». قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَالْأَمْرُ عَلَى ذَالِكَ، ثُمَّ كَانَ الْأَمْرُ عَلَى ذَالِكَ فِي خِلَافَةِ أَبِي بَكْرٍ، وَصَدْرًا مِنْ خِلَافَةِ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ.

الموطأ لمالک ا ٢٥٦ کتاب الصيام للفريابي ا ١٦٠

**عبدالرحمن بن عبدالقارئ** دەڵێ: شەوێکی ڕەمەزان لەگەڵ عمر بن الخطاب رضي الله عنه چووینە مزگەوت، خەڵکی بە جیا و کۆمەڵ کۆمەڵ نوێژیان دەکرد، پیاو هەبوو بە تەنها نوێژی دەکرد، هەبوو نوێژی دەکرد کۆمەڵێک لەگەڵیدا نوێژیان دەکرد، عمر وتی: والله وای دەبینم ئەمانە لە پشتی قارئێکەوە کۆ بکەوە زۆر باش دەبێ، لە پشتی أبي بن کعب کۆی کردنەوە، پاشان شەوێکی تر لەگەڵی چوومە مزگەوت، خەڵکەکەی بینی لە پشتی قارئەکەیانەوە نوێژ دەکەن، وتی: باشترین داهێنراو ئەمەیە، وە ئەوانەی کۆتایی شەو دەیکەن باشترن و خێری زیاتریان بۆ هەیە وەک ئەوانەی ئێستا دەیکەن، ئەوکات خەڵکی زوو دەیانکرد.

عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ عَبْدٍالْقَارِيِّ، أَنَّهُ قَالَ: خَرَجْتُ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فِي رَمَضَانَ إِلَى الْمَسْجِدِ، فَإِذَا النَّاسُ أَوْزَاعٌ مُتَفَرِّقُونَ، يُصَلِّي الرَّجُلُ لِنَفْسِهِ، وَيُصَلِّي الرَّجُلُ فَيُصَلِّي بِصَلَاتِهِ الرَّهْطُ، فَقَالَ عُمَرُ: وَاللهِ إِنِّي لَأَرَانِي لَوْ جَمَعْتُ هَؤُلَاءِ عَلَى قَارِئٍ وَاحِدٍ لَكَانَ أَمْثَلَ، فَجَمَعَهُمْ عَلَى أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، قَالَ: ثُمَّ خَرَجْتُ مَعَهُ لَيْلَةً أُخْرَى، وَالنَّاسُ يُصَلُّونَ بِصَلَاةِ قَارِئِهِمْ، فَقَالَ عُمَرُ: نِعْمَتِ الْبِدْعَةُ هَذِهِ، وَالَّتِي تَنَامُونَ عَنْهَا أَفْضَلُ مِنَ الَّتِي تَقُومُونَ: يَعْنِي آخِرَ اللَّيْلِ، وَكَانَ النَّاسُ يَقُومُونَ أَوَّلَهُ .

الموطأ لمالك | ٢٥٧ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٦٠ كتاب الصيام للفريابي | ١٦٤

ئەگەر هاتوو کەسێک بڵێ: « نوێژی تەڕاویح بە جەماعەت وەک ئەوەی ئێستا مەشهورە بیدعەیە، سەیر بکەن عمر وتوویەتی: باشترین بیدعە ئەمەیە ».

لە وەڵامدا دەڵێین ئەو قەولەی ئیمامی عمر رضي الله عنه بە مەفهومی ئەو بیدعەیە نایەت کە خەڵکی لێی تێ دەگەن، چونکە بیدعە لە شەرعدا بەو عیبادەتە دەوترێ کە پێشتر وجوودی نەبووبێ، ئەمما نوێژی تەڕاویح

به جەماعەت وجوودی هەبووە، هەتا ئەو کاتەش عمر رضي الله عنه خەڵکی کۆ کردنەوە لە پشت أبي بن كعب و تميم الداري رضي الله عنهما، خەڵکانێک هەبوون بە جەماعەت کردوویانە، بەڵام بە شێوازێکی مولتەزیم نەبووە وەک پێشتر ڕیوایەتەکانمان هێنا، جا ئەمە بە هیچ جۆرێک ناچێتە قاڵبی بیدعەوە.

زیاد لەمەش نوێژی تەڕاویح لەسەردەمی ڕەسول الله ـدا ﷺ وجوودی هەبووە، ڕەسول الله ﷺ سێ شەو نوێژی تەڕاویحی بە جەماعەت کردووە بۆ صەحابە، جا ئەوانەی دەڵێن نوێژی تەڕاویح بە جەماعەت بیدعەیە نازانم چۆن جورئەت دەکەن قسەی وا دەکەن؟! لەکاتێکدا ڕەسول الله ﷺ بە جەماعەت کردوویەتی.

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە شەودا نوێژی دەکرد لە حوجرەکەیدا، دیواری حوجرەکە نزم بوو، هەندێک لە هاوەڵان ڕەسول الله ـیان ﷺ بینی، ئیتر هەستان نوێژیان دابەست لە پشتیەوە بە نوێژەکەی ئەو نوێژیان کرد، کە ڕۆژ بوویەوە باسی ئەوەیان کرد، شەوی دووەم هەستایەوە بۆ نوێژ کردن، هەندێک لە هاوەڵان هەستانەوە لە پشتیەوە نوێژیان دابەست، دوو شەو یان سێ شەو بەو جۆرەیان کرد، هەتا

شەوی دوای ئەو شەوە ڕەسول الله ﷺ دانیشت نەچوویە دەرێ بۆ حوجرەکەی، کاتێک ڕۆژ بوویەوە خەڵکی باسی شەویان دەکرد فەرمووی: «بۆیە نەهاتمە دەرەوە ترسام شەو نوێژ فەرز بکرێ لەسەرتان».

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهَ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُصَلِّي مِنَ اللَّيْلِ فِي حُجْرَتِهِ، وَجِدَارُ الْحُجْرَةِ قَصِيرٌ، فَرَأَى النَّاسُ شَخْصَ النَّبِيِّ ﷺ، فَقَامَ أُنَاسٌ يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ، فَأَصْبَحُوا فَتَحَدَّثُوا بِذَالِكَ، فَقَامَ لَيْلَةَ الثَّانِيَةَ، فَقَامَ مَعَهُ أُنَاسٌ يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ، صَنَعُوا ذَالِكَ لَيْلَتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا، حَتَّى إِذَا كَانَ بَعْدَ ذَالِكَ جَلَسَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَلَمْ يَخْرُجْ، فَلَمَّا أَصْبَحَ ذَكَرَ ذَالِكَ النَّاسُ، فَقَالَ: « **إِنِّي خَشِيتُ أَنْ تُكْتَبَ عَلَيْكُمْ صَلَاةُ اللَّيْلِ** ».

صحيح البخاري | ٧٢٩ صحيح مسلم | ١٧٨٤ سنن أبي داود | ١٣٧٣ سنن النسائي | ١٦٠٤ مسند أحمد | ٢٤٠١٦ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٨٥

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ حەسیرێکی هەبوو بە ڕوژدا ڕایدەخست، بە شەودا دەیکردە بەربەست لە نێوان خۆی و کەسانی تردا، هەندێک لە هاوەڵان زانییان شەو نوێژ دەکات هاتن لە پشتیەوە نوێژیان کرد.

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهَ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ لَهُ حَصِيرٌ يَبْسُطُهُ بِالنَّهَارِ، وَيَحْتَجِرُهُ بِاللَّيْلِ، فَثَابَ إِلَيْهِ نَاسٌ فَصَلَّوْا وَرَاءَهُ.

صحيح البخاري ا ٧٣٠ صحيح مسلم ا ١٨٢٧ مسند أحمد ا ٢٤١٢٤

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ شەوێکیان لە مزگەوتدا نوێژی کرد، هەندێک کەس هاتن لە پشتیەوە لەگەڵ نوێژەکەی ئەو نوێژیان کرد، وە شەوی دوای ئەویش کردی ئیتر خەڵکێکی زۆرتر کۆبوونەوە، پاشان شەوی سێهەم یان چوارەم کۆبوونەوە چاوەڕێیان دەکرد، بەڵام ڕەسول الله ﷺ نەچووە دەرەوە بۆ لایان، کاتێک ڕۆژ بوویەوە فەرمووی: « شەو بینیمن کۆبوونەوە، هیچ شتێک ڕێگر نەبوو لەوەی بێمە دەرەوە بۆ لاتان، تەنها ئەوە نەبێ ترسم هەبوو لەوەی فەڕز بێ لەسەرتان ». وە ئەمەش لە ڕەمەزاندا بوو.

عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللهَ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَلَّى ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي الْمَسْجِدِ فَصَلَّى بِصَلَاتِهِ نَاسٌ، ثُمَّ صَلَّى مِنَ الْقَابِلَةِ فَكَثُرَ النَّاسُ، ثُمَّ اجْتَمَعُوا مِنَ اللَّيْلَةِ الثَّالِثَةِ أَوِ الرَّابِعَةِ، فَلَمْ يَخْرُجْ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ،

فَلَمَّا أَصْبَحَ قَالَ: « قَدْ رَأَيْتُ الَّذِي صَنَعْتُمْ، وَلَمْ يَمْنَعْنِي مِنَ الْخُرُوجِ إِلَيْكُمْ إِلَّا أَنِّي خَشِيتُ أَنْ تُفْرَضَ عَلَيْكُمْ ». وَذَالِكَ فِي رَمَضَانَ.

صحيح البخاري | ١١٢٩ صحيح مسلم | ١٧٨٣ مسند أحمد | ٢٥٤٤٦
كتاب الصيام للفريابي | ١٦٢

أبو ذر رضي الله عنه دەڵێ: لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ ڕۆژووی ڕەمەزانمان گرت، هیچ شەوێک شەو نوێژی بۆ نەکردین هەتا حەوت ڕۆژی مابوو ئیتر هات نویژی بۆ کردین هەتا سێبەشی شەو تێپەڕی، وە کاتێک شەش ڕۆژی مابوو نوێژی بۆ نەکردین، کاتێک پێنجی مابوو نوێژی بۆ کردین هەتا نیوەی شەو تێپەڕی، وتم: ئەی ڕەسولی الله خۆزگە هەموو شەوەکەت بۆ زیندوو دەکردینەوە، فەرمووی: « هەرکەسێک لەگەڵ ئیمامدا نوێژی کرد هەتا دەڕوات. ئەوە شەو نویژی هەموو شەوەکەی بۆ نوسراوە ». کاتێک چواری مابوو نوێژی بۆ نەکردین، وە کاتێک سێی مابوو ئەهل و خێزانەکانی و خەڵکی کۆکردەوە، نوێژی بۆ کردین هەتا ترسان لێ نیشت فەلاحمان لە دەست بچێ، وتم: فەلاح چییە؟ وتی: پارشێو. پاشان باقی مانگەکە نوێژی بۆ نەکردین.

عَنْ جُبَيْر بْن نُفَيْر، عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهَ عَنْهُ، قَالَ: صُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَقُمْ بِنَا شَيْئًا مِنَ الشَّهْرِ، حَتَّى بَقِيَ سَبْعٌ، فَقَامَ بِنَا حَتَّى ذَهَبَ ثُلُثُ اللَّيْلِ، فَلَمَّا كَانَتِ السَّادِسَةُ لَمْ يَقُمْ بِنَا، فَلَمَّا كَانَتِ الْخَامِسَةُ قَامَ بِنَا، حَتَّى ذَهَبَ شَطْرُ اللَّيْلِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ لَوْ نَفَّلْتَنَا قِيَامَ هَذِهِ اللَّيْلَةِ؟ قَال: فَقَالَ: « **إِنَّ الرَّجُلَ إِذَا صَلَّى مَعَ الْإِمَامِ حَتَّى يَنْصَرِفَ حُسِبَ لَهُ قِيَامُ لَيْلَةٍ** ». قَالَ: فَلَمَّا كَانَتِ الرَّابِعَةُ لَمْ يَقُمْ، فَلَمَّا كَانَتِ الثَّالِثَةُ جَمَعَ أَهْلَهُ وَنِسَاءَهُ وَالنَّاسَ، فَقَامَ بِنَا حَتَّى خَشِينَا أَنْ يَفُوتَنَا الْفَلَاحُ. قَالَ: قُلْتُ: وَمَا الْفَلَاحُ؟ قَالَ: السُّحُورُ. ثُمَّ لَمْ يَقُمْ بِنَا بَقِيَّةَ الشَّهْرِ.

سنن أبي داود | ١٣٧٥ سنن الترمذي | ٨١٧ سنن النسائي | ١٦٠٥ سنن ابن ماجه | ١٣٢٧ سنن الدارمي | ١٨٠٣ مسند أحمد | ٢١٤٤٧ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٤٢ كتاب الصيام للفريابي | ١٥٢

**نعيم بن زياد** دەڵێ, بیستم نعمان بن بشير رضي الله عنه لەسەر میمبەری حمص دەیوت: مانگی ڕەمەزان لەگەڵ ڕەسول الله ـدا ﷺ شەوی بیست و سێ شەو نوێژمان کرد هەتا بەشی یەکەمی شەو، پاشان شەوی بیست و پێنج شەو نوێژمان کرد هەتا نیوەی شەو، پاشان شەوی بیست و حەوت

شو نوێژمان کرد هەتا گومانمان برد فریای فەلاح نەکەوین. ئەوان بە پارشێو ناویان دەهێنا.

حَدَّثَنِي نُعَيْمُ بْنُ زِيَادٍ أَبُو طَلْحَةَ، قَالَ: سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ عَلَى مِنْبَرِ حِمْصَ، يَقُولُ: قُمْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ إِلَى ثُلُثِ اللَّيْلِ الْأَوَّلِ، ثُمَّ قُمْنَا مَعَهُ لَيْلَةَ خَمْسٍ وَعِشْرِينَ إِلَى نِصْفِ اللَّيْلِ، ثُمَّ قُمْنَا مَعَهُ لَيْلَةَ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنْ لَا نُدْرِكَ الْفَلَاحَ. وَكَانُوا يُسَمُّونَهُ السُّحُورَ.

سنن النسائي | ١٦٠٦ مسند أحمد | ١٨٤٠٢ كتاب الصيام للفريابي | ١٥٥



# قورئان خوێندن لە نوێژی ویتردا

أبي بن كعب رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە نوێژە ویترەكاندا ئەم سورەتانەی دەخوێند: ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأعْلَى ﴾ وَ ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾ وَ ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾.

عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُوتِرُ بِـ ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأعْلَى﴾ وَ ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾.

سنن أبي داود | ١٤٢٣ سنن النسائي | ١٧٣٠ سنن ابن ماجه | ١١٧١ مسند أحمد | ٢١١٤١ سنن الدارقطني ما يقرأ في ركعات الوتر والقنوت فيه | ١

إبن عباس رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە نوێژە ویترەكاندا ئەم سورەتانەی دەخوێند: ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأعْلَى ﴾ وَ ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾ وَ ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾.

عَنِ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُوتِرُ بِـ ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ﴾ وَ ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾ وَ ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾.

سنن الترمذي | ٤٦٦ سنن النسائي | ١٧٠٢ سنن ابن ماجه | ١١٧٢ سنن الدارمي | ١٦١٢ مسند أحمد | ٢٧٢٠

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: ئەوە هەڵبژاردەی زۆربەی ئەهلی عیلمە لە صەحابەی ڕەسول اللە ﷺ وە دوای ئەوانیشە ئەوەیە لە هەر ڕکاتێکدا یەکێک لەم سورەتانە بخوێنێ: ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ﴾. وَ ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾. وَ ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾.

وَالَّذِي اخْتَارَهُ أَكْثَرُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَمَنْ بَعْدَهُمْ أَنْ يَقْرَأَ بِـ ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ﴾. وَ ﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ﴾. وَ ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾. يَقْرَأُ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ مِنْ ذَلِكَ بِسُورَةٍ.

**حسن بن علي** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول اللە ﷺ هەندێک کەلیماتی فێر کردم لە ویتردا بیانڵێم: اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ

عَافَيْتَ، وَتولَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ.

عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ بُرَيْدِ بْنِ أَبِي مَرْيَمَ، عَنْ أَبِي الْحَوْرَاءِ، قَالَ: قَالَ الْحَسَنُ بْنُ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: عَلَّمَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ كَلِمَاتٍ أَقُولُهُنَّ فِي الْوِتْرِ: اللَّهُمَّ اهْدِنِي فِيمَنْ هَدَيْتَ، وَعَافِنِي فِيمَنْ عَافَيْتَ، وَتَوَلَّنِي فِيمَنْ تَوَلَّيْتَ، وَبَارِكْ لِي فِيمَا أَعْطَيْتَ، وَقِنِي شَرَّ مَا قَضَيْتَ، فَإِنَّكَ تَقْضِي وَلَا يُقْضَى عَلَيْكَ، وَإِنَّهُ لَا يَذِلُّ مَنْ وَالَيْتَ، تَبَارَكْتَ رَبَّنَا وَتَعَالَيْتَ.

سنن أبي داود | ١٤٢٥ سنن الترمذي | ٤٦٨ سنن النسائي | ١٧٤٥
سنن ابن ماجه | ١١٧٨ سنن الدارمي | ١٦١٩ مسند أحمد | ١٧١٨
صحيح ابن خزيمة | ١٠٩٥

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: خیلاف هەیە لای ئەهلی عیلم لە قنوت لە ویتردا، عبدالله بن مسعود وای دەبینێ قنوت لە ویتردا لە هەموو ساڵەکەدا، وە پێش ڕکوع هەڵبژاردەی ئەوە، ئەمە قەولی هەندێکە لە ئەهلی عیلم، وە ئەمە قەولی سفیان الثوري و عبدالله بن المبارک و إسحاق بن راهوية و ئەهلی کوفەیە. وە ڕیوایەت کراوە لە علي

بن أبي طالب قونتی نەخوێندووە ئیللا لە نیوەی کۆتایی ڕەمەزان نەبێ، وە دوای ڕکوع قنوتی دەخوێند، وە هەندێک لە ئەهلی عیلم بۆ ئەمە چوون، ئەمە قەولی شافعي و أحمد ـیشە.

وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي الْقُنُوتِ فِي الْوِتْرِ، فَرَأَى عَبْدُاللَّهِ بْنُ مَسْعُودٍ الْقُنُوتَ فِي الْوِتْرِ فِي السَّنَةِ كُلِّهَا، وَاخْتَارَ الْقُنُوتَ قَبْلَ الرُّكُوعِ، وَهُوَ: قَوْلُ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَابْنُ الْمُبَارَكِ، وَإِسْحَاقُ، وَأَهْلُ الْكُوفَةِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ أَنَّهُ كَانَ لَا يَقْنُتُ إِلَّا فِي النِّصْفِ الْآخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، وَكَانَ يَقْنُتُ بَعْدَ الرُّكُوعِ، وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ إِلَى هَذَا، وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ.

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: عبدالله بن مسعود رضي الله عنه لە هەموو ساڵدا لە ویتردا قنوتی دەخوێند.

عَن معمَرٍ، عَن أبانٍ، عَنِ النّخعي، أنَّ ابن مسعودٍ كانَ يَقنُت السَّنَة كُلها في الوتر.

المصنف لعبدرزاق | ٥٠٤٤

**إبن شهاب الزهري** دەڵێ: أبي بن كعب رضي الله عنه لە نیوەی کۆتایی ڕەمەزان قنوتی دەخوێند دوای ڕکوع.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، أَنَّ أُبَيَّ كَعْبٍ كَانَ يَقْنُتُ فِي النِّصفِ الْآخِرِ مِنْ رَمَضَانَ بَعْدَ الرُّكُوعِ.

المصنف لعبدرزاق | ٧٨٦٦

**الحكم** دەڵێ: إبراهيم النخعي لە هەموو ساڵدا لە ویتردا قنوتی دەخوێند پێش ڕکوع.

عَنِ الثوري، عَنِ الأشعث، عَنِ الحكمِ، عَن إبراهيمَ، قال: القنوت في الوتر مِنَ السَّنَة كُلها قبل الركعة.

المصنف لعبدرزاق | ٥٠٤٦

**إبن شهاب الزهري** دەڵێ: لە هەموو ساڵدا قنوت نییە ئیللا لە نیوەی کۆتایی ڕەمەزاندا نەبێ.

**معمر** دەڵێ: من لە هەموو ساڵدا قنوت دەخوێنم، ئیللا لە نیوەی یەکەمی ڕەمەزاندا نەبێ، قنوتی تێدا ناخوێنم.

عَن مَعمر، عَنِ الزُّهري، قال: لا قنوتَ في السّنة كلها إلا النصف الآخر مِن رمضان. قال مَعمَر: وإني لأقنت السّنَة كلها، إلا النصف الأول مِن رمضان، فإني لا أُقنته.

المصنف لعبدرزاق | ٥٠٤٨

**أبي داود** دەڵێ: بە أحمد بن حنبل ـم وت: ئەگەر قنوت خوێنرا لە کەیەوە دەست پێ بکرێ؟ وتی: کاتێک ڕۆژی پانزە تێپەڕی لە شەوی شانزەدا.

قلت لأحمد: إذا كانت يقنتُ النصف الآخر متى يبتديء؟ قال: إذا مضى خمس عشرة ليلة سادسة عشرة.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٤٧١

بیستم پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەست بەرز بکرێتەوە لە قنوتدا؟ وتی: بەڵێ پێم باشە. أحمد ـم بینی لە قنوتدا دەستی بەرز دەکردەوە.

سمعت أحمد سُئل: يرفع يده في القنوت؟ قال: نعم يُعجبني. فرأيت أحمد يرفع يده في القنوت.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٤٧٢

# خێر و قورئان خوێندن لە مانگی ڕەمەزاندا

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە خێر کردندا بەخشندەترینی خەڵکی بوو، وە لە ڕەمەزاندا بەخشندەتر دەبوو کاتێک جبریل ئەهاتە خزمەتی، جبريل عليه السلام هەموو شەوێکی ڕەمەزان دەهات بۆ خزمەتی هەتا مانگەکە تەواو دەبوو قورئانی دەور دەکردەوە بە ڕەسول الله ﷺ، هەرکات جبریلی پێ دەگەیشت هێندە بەخشندە دەبوو لە هەوای هەڵکردوو خێراتر دەبوو.

عَنْ عُبَيْدِاللَّه بْنِ عَبْدِالله بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ أَجْوَدَ النَّاسِ بِالْخَيْرِ، وَكَانَ أَجْوَدُ مَا يَكُونُ فِي رَمَضَانَ حِينَ يَلْقَاهُ جِبْرِيلُ، وَكَانَ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ يَلْقَاهُ كُلَّ لَيْلَةٍ فِي رَمَضَانَ حَتَّى يَنْسَلِخَ، يَعْرِضُ عَلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ الْقُرْآنَ، فَإِذَا لَقِيَهُ جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَامُ كَانَ أَجْوَدَ بِالْخَيْرِ مِنَ الرِّيحِ الْمُرْسَلَةِ.

صحيح البخاري | ١٩٠٢ صحيح مسلم | ٦٠٠٩ سنن النسائي | ٢٠٩٥ مسند أحمد | ٣٤٢٥ صحيح ابن خزيمة | ١٨٨٩



# خەتم کردنی قورئان لە مانگی ڕەمەزاندا

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هەموو ڕەمەزانێک دە ڕۆژ ئیعتکافی دەکرد، بەڵام ڕەمەزانی ئەو ساڵەی وەفاتی کرد بیست ڕۆژ ئیعتکافی کرد، وە هەموو ڕەمەزانێک یەک جار قورئانی پێ دەور دەکرایەوە، بەڵام ڕەمەزانی ئەو ساڵەی وەفاتی کرد دوو جار قورئانی پێ دەور کرایەوە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعْتَكِفُ كُلَّ عَامٍ عَشْرَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا، وَكَانَ يُعْرَضُ عَلَيْهِ الْقُرْآنُ فِي كُلِّ عَامٍ مَرَّةً، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ عُرِضَ عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ.

صحيح البخاري | ٢٠٤٤ سنن ابن ماجه واللفظ له | ١٧٦٩ مسند أحمد | ٨٤٣٥

**العوام بن حوشب** دەڵێ: إبراهيم النخعي لە مانگی ڕەمەزاندا لە سێ ڕۆژدا خەتمێکی دەکرد، هەرکات بگەیشتایەتە دە شەوی کۆتایی هەموو دوو شەوێک خەتمێکی دەکرد، وە هەموو شەوێک خۆی دەشووشت.

عَنْ هُشَيْمٍ، عَنِ الْعَوَّامِ بْنِ حَوْشَبٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ النَّخَعِيِّ أَنَّهُ كَانَ يَخْتِمُ الْقُرْآنَ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ فِي كُلِّ ثَلَاثٍ، فَإِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ خَتَمَ فِي لَيْلَتَيْنِ، وَاغْتَسَلَ كُلَّ لَيْلَةٍ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٨٤١

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: شافعي لە مانگی ڕەمەزاندا شەست خەتمی دەکرد، هەمووشی لە نوێژدا دەکرد.

حَدَّثنا الرَّبيعُ بنُ سليمانَ المُرادي المصريُّ، قال: كانَ الشافعيُّ يَختِمُ القُرآنَ في شهرِ رَمضان سِتِّنَ مَرَّة، كُلُّ ذالكَ في صلاةٍ.

آداب الشافعي ومناقبه لابن أبي حاتم | ٩٧ حلية الأولياء لأبي نعيم | ١٣٤٧٠

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: شافعي هەموو مانگێک سی خەتمی دەکرد، وە لە مانگی ڕەمەزاندا شەست خەتمی دەکرد، بێجگە لەوەشی لە نوێژدا دەیخوێند.

أخبرنا أبو عبدالرحمن السُلّمي، قال: سمعتُ علي بن عمر الحافظ، يقول: سمعتُ أبا بكر النيسابوري، قال: سمعتُ الرَّبيعُ بنُ سليمانَ، قال:

كانَ الشافعيُّ يَختِمُ في كُلِّ شَهرٍ ثلاثينَ ختمة، وَكانَ يَختِم في شهرِ رَمضان سِتِّنَ خَتمة، سوى ما يَقرأ في الصلاة.

مناقب الشافعي للبيهقي ا صـ: ١٦٧

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: شافعي لە مانگی ڕەمەزاندا شەست خەتمی دەکرد، لە ڕۆژدا خەتمێک، لە شەودا خەتمێک.

وأخبرنا أبو عبدالله الحافظ، قال: أخبرنا الزبير بن عبدالواحد الحافظ بأَسَدَآباد، قال: سمعتُ أبا الحسين أحمد بن محمد بن جعفر الحَداد، يقول: سمعتُ الرَّبيعُ بنُ سليمانَ، قال: كانَ الشافعيُّ يَختِمُ ستينَ ختمة في شهرِ رَمضان، خَتمة بالنَّهار، وَخَتمة بالليل.

مناقب الشافعي للبيهقي ا صـ: ١٦٧

**الربيع بن سليمان** دەڵێ: شافعي وتی: من لە مانگی ڕەمەزاندا شەست خەتم دەکەم.

حَدَّثنا أبو محمد بنُ حَيّان، حَدَّثنا إبراهيم بنُ محمد بنِ الحَسَن، قال: قال الربيع: سمعت الشافعي يقول: كُنتُ أَختِمُ في رمضانَ ستينَ مَرَّةً.

حلية الأولياء لأبي نعيم ا ١٣٤٧٢

## موصحەف گرتن بە دەستەوە لە کاتی نوێژدا

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئەمیری باوەڕداران عمر رضي الله عنه نەهی لێ کردین بەرنوێژی بۆ خەڵکی بکەین لە موصحەفدا، وە نەهی لێ دەکردین کەسی نا باڵغ بەرنوێژیمان بۆ بکات.

حَدَّثَنَا محمد بن عامر بن إبراهيم، عَن أبيه عامر بن إبراهيم، قال: سمعتُ نَهشَل بن سعيد، يحدِّث عَنِ الضَّحاك، عَنِ ابن عباس، قال: نهانا أمير المؤمنين عمر رضي الله عنه: أن نؤم الناس في المصحف، ونهانا أن يؤمنا إلا المحتلم.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٧٢

**سعيد ابن المسيب** دەڵێ: ئەگەر هێندە قورئانی لەبەربێ نوێژی شەوەکەی پێ بکات با ئەوە بلێتەوە، با لە موصحەفدا نەخوێنێ.

حَدَّثَنَا عبدالله بن سعيد، حَدَّثَنَا أبو خالد، عَن ابن أبي عروبة، عَن قتادة، عَنِ ابن المُسَيب، قال: إذا كانَ معه ما يقوم به ليله ردَّده، ولا يقرأ في المصحف.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٧٣

**قتادة** دەڵێ: سعید بن المسیب و حسن البصري دەربارەی قورئان خوێندن لە نوێژدا لە ڕەمەزاندا دەڵێن: ئەوەی لەبەرتە لە قورئان بیخوێنە، لە موصحەفدا مەخوێنە ئەگەر ئەوەندەت لەبەرە لە شەودا بیخوێنی.

حَدَّثَنَا محمد بن يحيى، حَدَّثَنَا وَهب بن جرير، عَن هِشام، عَن قتادة، عَن سعيد وَالحَسن أنهما قالا في الصلاة في رمضان: تردَّد ما معك مِنَ القرآن، ولا تقرأ في المصحف، إذا كانَ معكَ ما تقرأ به في ليلة.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٧٥

**ليث** دەڵێ: مجاهد و الأعمش و إبراهيم النخعي بە کەراهەتیان دادەنا بەرنوێژی کردن لە موصحەفدا.

حَدَّثَنَا يعقوب بن سفيان، حَدَّثَنَا أبو نعيم، حَدَّثَنَا سفيان، عَن ليث، عَن مجاهد وَالأعمش وَإبراهيم: أنهما كَرها أن يؤم في المصحف.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٧٩

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: ئەوان بە کەراهەتیان دادەنا پیاو بەرنوێژی بکات لە موصحەفدا زۆر بە توندی بە کەراهەتیان دادەنا خۆ چوواندن بە ئەهلی کیتاب.

حَدَّثَنَا أحمد بن سنان، قال: حَدَّثنا أبو مُعاوية، عَنِ الأعمش، عَن إبراهيم: كانوا يكرهون أن يؤم الرجل في المصحف كراهية شديدة، أن يتشبهوا بأهل الكتاب.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٨٢

**مغيرة** دەڵێ: إبراهيم النخعي بە کەراهەتی دادەنا بەرنوێژی کردن لە موصحەفدا، دەیوت: خۆ چوواندنە بە ئەهلی کیتاب.

حَدَّثَنَا أسيد بن عاصم، حَدَّثَنَا سعيد بن عامر، عَن شُعبة، عَن مُغيرة، عَن إبراهيم أنه كانَ يكره الإمامة في المصحف، ويقول: تتشبهون بأهل الكتاب.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٨٥

**عياش العامري** دەڵێ: سويد بن حنظلة تێپەڕی بەلای پیاوێکدا بەرنوێژی دەکرد بۆ کەسانێک لە موصحەفدا، سويد شەقێکی هەڵدایە پیاوەکە.

حَدَّثَنَا علي بن محمد بن أبي الخصيب، حَدَّثَنَا وَكيع، عَن سفيان، عَن عياش العامري، عَن سويد بن حنظلة البكري: أنه مَرَّ على رجل يؤم قومًا في مصحف فضربه برِّجله.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٨٦

**عطاء بن السائب** دەڵێ: أبي عبدالرحمن السلمي بە کەراهەتی دادەنا بەرنوێژی کردن لە موصحەفدا.

حَدَّثَنَا علي بن أبي الخصيب، أَخبَرَنا وَكيع، عَن سفيان، عَن عطاء بن السائب، عن أبي عبدالرحمن السلمي: أنه كَره أن يؤم في المصحف.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٨٨

**قتادة** دەڵێ: حسن البصري بە کەراهەتی دادەنا بەرنوێژی کرن لە موصحەفدا، دەیوت: وەک کردەوەی نەصارا.

حَدَّثَنَا علي بن أبي الخصيب، حَدَّثَنَا وَكيع، عَن هِشام الدستوائي، عَن قتادة، عَنِ الحَسَن: أنّه كَره أن يؤم الرجل في المصحف، قال: كما تفعل النصارى.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٨٩

**الربيع** دەڵێ: ئەوان بە کەراهەتیان دادەنا بەرنوێژی کردن لە موصحەفدا، دەیانوت دوو ئیمام.

حَدَّثَنَا محمد بن مَدويَة الترمذي، قالنا عبدالرحمن بن عبدالله الرازي -يعني: الدشتكي- قال: حَدَّثَنَا أبو جعفر، عَنِ الربيع، قال: كانوا يكرهون أن يؤم أحد في المصحف، وَيقولون إمامين.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٧٩٠

لە بەرامبەردا هەندێک لە سەلەف ڕێیان داوە لە موصحەفدا پێش نوێژی بکرێ ئەوانەی لەسەر ئەم ڕەئیەن: « قەولی دووەمی حسن البصري، عطاء ابن أبي الرباح، يحيى بن سعيد الأنصاري، إبن شهاب الزهري، مالک بن أنس ». وە هەروەها ذکوان ئیمامەتی کردووە بۆ دایە عائشة رضي الله عنها لە موصحەفدا.

وَكَانت عائشةُ يؤمُّها عبدها ذَكوان مِنَ المصحفِ.

صحيح البخاري | كتاب الأذان ٥٤- باب إمامة العبد والمولى.

ئەم ئەثەرە موعەلەقە، بەڵام غیری ئەو بە موتەصیلی هێناویانە، وەک إبن أبي شيبة لە المصنف ـدا بە ژمارە | ٦١٦٣ هێناویەتی دەڵێ: حدثنا وكيع، قال: حدثنا هشام بن عروة، عن أبي بكر بن أبي مليكة، عن عائشة، أنها كانَ يؤمها مُدَّبَّرٌ لها.

وە **إبن أبي داود** ـیش لە كتاب المصاحف بە ژمارە | ٧٩٧ هێناویەتی دەڵێ: أخبرنا أحمد بن سعيد بن بشر، حدثنا عبدالله بن وهب، قال: أخبرني جرير بن حازم، عن أيوب السختياني، عن ابن أبي مليكة: أن عائشة رضي الله عنها زوج النبي ﷺ كان يؤمها غلامها ذكوان في المصحف.

**حسن البصري** دەڵێ: كێشەی تێدا نییە بەرنوێژی كردن لە موصحەفدا ئەگەر كەس نەبوو بەرنوێژییان بۆ بكات.

حَدَّثَنَا علي بن أبي الخصيب، حَدَّثنَا وَكيع، عَنِ الربيع، عَنِ الحَسَن، قال: لا بأس أن يؤم في المصحف إذا لم يَجِد -يعني من يقرأ بهم-.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٨٠٠

**حسن البصري** دەڵێ: كێشەی تێدا نییە بەرنوێژی كردن لە موصحەفدا.

حَدَّثَنَا هارون بن إسماعيل، حَدَّثَنَا ابن فُضيل، عَن إسماعيل بن مسلم، عنِ الحَسَن، قال: لا بأس أن يقرأ في المصحف ويؤم به.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٨٠٢

رباح دەڵێ: عطاء بە کێشەی نەدەبینی قورئان خوێندن لە موصحەفدا لە کاتی نوێژدا.

حَدَّثَنَا هارون بن سليمان، حَدَّثنَا أبو عامر، حَدَّثنَا رباح، عَن عطاء: أنّه كانَ لا يرى بأسًا أن يقرأ في المصحف في الصلاة.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٨٠٤

يحيى بن سعيد دەڵێ: هیچ کێشەی نییە قورئان خوێندن لە موصحەفدا لە کاتی نوێژدا لە ڕەمەزاندا.

حَدَّثَنَا أحمد بن سعيد الهمداني، حَدَّثَنَا عبدالله بن وَهب، حَدَّثنَا مُعاوية بن صالح، عن يحيى بن سعيد الأنصاري، قال: لا أرى بالقراءة مِنَ المصحف في رمضان بأسًا.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٨٠٥

عبدالعزيز بن محمد دەڵێ: پرسیارم کرد لە إبن شهاب الزهري دەربارەی بەرنوێژی کردن بۆ خەڵکی لە موصحەفدا؟ وتی: لەوەتەی ئیسلام هەیە بەردەوام خەڵکی بەو جۆرەیان کردووە.

حَدَّثَنَا إبراهيم بن مروان بن محمد الطاطري، حَدَّثَنَا أبي، حَدَّثَنَا عبدالعزيز بن محمد بن عبدالله ابن أخي ابن شهاب، قال: سألت ابن شهاب عَنِ القراءة في المصحف يؤم الناس؟ قال: لم يَزل الناس منذ كانَ الإسلام يفعلون ذالک.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٨٠٦

**إبن وهب** دەڵێ: بیستم مالک پرسیاری لێکرا دەربارەی بەرنوێژی کردن بۆ خەڵکی لە ڕەمەزاند لە موصحەفدا؟ وتی: کێشەی تێدا نییە ئەگەر ناچار بن.

حَدَّثَنَا أبو الربيع، أنبأنا ابن وَهب، قال: سمعت مالكًا سُئل عَمّن يؤم الناس في رمضان في المصحف؟ فقال: لا بأس بذالکَ إذا اضطروا إلى ذالک.

كتاب المصاحف لابن أبي داود | ٨٠٨

**أبي داود** دەڵێ: بیستم پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەربارەی پیاوێک بەرنوێژی دەکات لە موصحەفدا لە مانگی ڕەمەزاندا؟ ڕێگەی پێدا. وترا:

لە نوێژی فەڕزدا؟ وتی: جا شتی وا دەکرێ؟! أبي داود دەڵێ: وەک ئینکاری کردن لێی وای وت.

سمعتُ أحمد سُئل عَنِ الرَجُل يَؤم في شهر رمضان في المُصحَف؟ فُرُخِصَ فيه، قيل: في الفريضة؟ قال: يَكونُ هذا؟! قال أبو داود: على الإنكار.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود ا ٤٤٣

**إبن هانئ** دەڵێ: پرسیارم لێکرد دەربارەی پیاوێک بەرنوێژی دەکات لە موصحەفدا لە مانگی ڕەمەزاندا؟ وتی: کێشەی تێدا نییە، عائشة فەرمانی دەکرد بە خزمەتکارێکی بەرنوێژی بۆ بکات لە مانگی ڕەمەزاندا لە موصحەفدا، وە هەندێک لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ وایان دەکرد، وە حسن البصري و محمد بن سيرين و عطاء ابن أبي رباح نەیان دەبینی کێشەی تێدا بێ.

سألته عَن الرجل يؤم في شهر رمضان في المصحف؟ فقال: لا بأسَ به، قد كانت عائشة تأمر مولًى لها يؤمها في شهر رمضان في المصحف، وعدة

مِن أصحاب النبي ﷺ، والحسن، ومحمد بن سيرين، وعطاء، لم يكونوا يرون به بأۡسًا.

مسائل أحمد بن حنبل رواية ابن هانئ | ٤٨٥

**إبن هانئ** دەڵێ: أبو عبدالله أحمد بن حنبل فەرمانی پێکردم بەرنوێژی بۆ خەڵکی بکەم لە موصحەفدا، منیش کردم.

أمرني أبو عبدالله أن أؤم النَّاس في المصحف، ففعلته.

مسائل أحمد بن حنبل رواية ابن هانئ | ٤٨٧



# ڕۆژوو قەڵغانە و پاداشتی خێرکردن لە مانگی ڕەمەزاندا

مطرف دەڵێ: عثمان بن أبي العاص هەندێک شیری داوا کرد بۆم هەتا بیخۆم، منیش وتم: بەڕۆژووم. عثمان وتی: لە ڕەسول الله ﷺ ـم بیست فەرمووی: « ڕۆژوو قەڵغانە وەک قەڵغانی هەریەک لە ئێوە لە کاتی جەنگدا ».

عَنْ سَعِيدِ بْنِ أَبِي هِنْدٍ، أَنَّ مُطَرِّفًا -رَجُلًا مِنْ بَنِي عَامِرِ بْنِ صَعْصَعَةَ- حَدَّثَهُ أَنَّ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي الْعَاصِ دَعَا لَهُ بِلَبَنٍ لِيَسْقِيَهُ، فَقَالَ مُطَرِّفٌ: إِنِّي صَائِمٌ. فَقَالَ عُثْمَانُ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: « الصِّيَامُ جُنَّةٌ كَجُنَّةِ أَحَدِكُمْ مِنَ الْقِتَالِ ».

سنن النسائي | ٢٢٣٠ سنن ابن ماجه | ١٦٣٩ مسند أحمد | ١٦٢٧٨ صحيح ابن خزيمة | ١٨٩١

أبي هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەموویەتی: الله ﷻ دەفەرموێ: هەموو عەمەلی بەنی آدم بۆ خۆیەتی بێجگە لە ڕۆژوو، ڕۆژوو بۆ منە وە من پاداشتی دەدەمەوە، ڕۆژوو قەڵغانە، وە ئەگەر یەکێک لە ئێوە بەڕۆژوو بوو با جنێو نەدات و دەمە قاڵێ نەکات، ئەگەر یەکێک

جنێوی پێ بدات یاخود شەڕی لەگەڵ کرد، ئەوە با بڵێ: من بەڕۆژووم. سوێند بەو زاتەی نەفسی محمد ـی بە دەستە، بۆنی دەمی ڕۆژووەوان لای الله ﷻ لە بۆنی میسک خۆشترە. ڕۆژووەوان دوو خۆشی هەیە دڵ خۆشە پێیان: کاتێک بەربانگ دەکاتەوە دڵ خۆشە، وە کاتێکیش دەگاتەوە خزمەت پەروەردگاری دڵ خۆشە بە ڕۆژووەکەی.

عَنْ عَطَاءُ، عَنْ أَبِي صَالِحِ الزَّيَّاتِ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، يَقُولُ: قَالَ رَسولُ اللهِ ﷺ: « **قالَ اللَّهُ ﷻ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ له، إلَّا الصِّيَامَ، فإنَّه لي وأَنَا أجْزِي به، والصِّيَامُ جُنَّةٌ، وإذَاكَانَ يَوْمُ صَوْمِ أحَدِكُمْ فلا يَرْفُثْ ولَا يَصْخَبْ، فإنْ سَابَّهُ أحَدٌ أوْ قَاتَلَهُ، فَلْيَقُلْ: إنِّي امْرُؤٌ صَائِمٌ. والذي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بيَدِهِ، لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِن رِيحِ المِسْكِ. لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا: إذَا أفْطَرَ فَرِحَ، وإذَا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بصَوْمِهِ** ».

صحيح البخاري | ١٩٠٤ صحيح مسلم | ٢٧٠٦ سنن النسائي | ٢٢١٦ سنن ابن ماجه | ١٦٨٩ سنن الدارمي | ١٧٩٥ مسند أحمد | ٧٦٩٣ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٨٤ صحيح ابن خزيمة | ١٨٩٦

هەمان حدیثی سەرەوە لە ڕێگەی الأعرج عبدالرحمن بن هرمز ـەوە هاتووە وەک هەمان ڕیوایەتی ذکوان أبو صالح السمان الزيات، تەنها ئەوەی جیاوازە لە کۆتاییەکەیدا فەرموویەتی: « وە خێر و چاکە لە ڕەمەزاندا یەک بە دەیە ».

عَنْ أَبِي الزِّنَادِ، عَنِ الْأَعْرَجِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: « **الصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَلَا يَرْفُثْ وَلَا يَجْهَلْ، وَإِنِ امْرُؤٌ قَاتَلَهُ أَوْ شَاتَمَهُ فَلْيَقُلْ: إِنِّي صَائِمٌ مَرَّتَيْنِ. وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ تَعَالَى مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، يَتْرُكُ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَشَهْوَتَهُ مِنْ أَجْلِي، الصِّيَامُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، وَالْحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثَالِهَا** ».

صحيح البخاري | ١٨٩٤ صحيح مسلم | ٢٧٠٣ الموطأ لمالك | ٧٠٧ مسند أحمد | ٩٩٩٩

بە هەمان شێوەی حدیثی پێشوو لە ڕێگەی سليمان بن مهران الأعمش ـەوە هاتووە، وەک لەفظی حدیثی عطاء بن أبي الرباح لە ذکوان أبي صالح ـەوە تەنها ئەوەی جیاوازە لە سەرەتاوە فەرموویەتی: « چاکە کردن یەک بە دەیە هەتا دەگاتە یەک بە حەوت سەد ».

حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ، عَنْ أَبِي صَالِحٍ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «**كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ يُضَاعَفُ الْحَسَنَةُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا إِلَى سَبْعِمِائَةِ ضِعْفٍ، قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: إِلَّا الصَّوْمَ، فَإِنَّهُ لِي وَأَنَا أَجْزِي بِهِ، يَدَعُ شَهْوَتَهُ، وَطَعَامَهُ مِنْ أَجْلِي، لِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ: فَرْحَةٌ عِنْدَ فِطْرِهِ، وَفَرْحَةٌ عِنْدَ لِقَاءِ رَبِّهِ، وَلَخُلُوفُ فِيهِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ**».

صحيح مسلم | ٢٧٠٧ سنن الترمذي | ٧٧٤-٧٧٦ سنن النسائي | ٢٢١٥ سنن ابن ماجه | ١٦٣٨ سنن الدارمي | ١٧٩٦ مسند أحمد | ٩٧١٤ المصنف لعبدرزاق | ٨٠٣٥ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٨٥ صحيح ابن خزيمة | ١٨٩٧



# ڕۆژوو گرتن لە کاتی سەفەردا

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: حمزة بن عمرو الأسلمي بە ڕەسول الله ﷺ ـی وت: لە سەفەردا بەڕۆژوو بم؟ جا حمزە زۆر بەڕۆژوو دەبوو، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « ئەگەر ویستت ئەوە بەڕۆژووبە ئەگەر نەتویست ئەوە مەیگرە ».

عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ حَمْزَةَ بْنَ عَمْرٍو الْأَسْلَمِيَّ قَالَ لِلنَّبِيِّ ﷺ: أَأَصُومُ فِي السَّفَرِ؟ وَكَانَ كَثِيرَ الصِّيَامِ، فَقَالَ: « **إِنْ شِئْتَ فَصُمْ وَإِنْ شِئْتَ فَأَفْطِرْ** ».

صحيح البخاري | ١٩٤٣ صحيح مسلم | ٢٦٢٥ سنن أبي داود | ٢٤٠٢ سنن الترمذي | ٧٢٠ سنن النسائي | ٢٣٠٦ سنن ابن ماجه | ١٦٦٢ سنن الدارمي | ١٧٣٣ الموطأ لمالک | ٦٧١ مسند أحمد | ٢٤١٩٦ كتاب الأم للشافعي | ٩٢٨ مسند الشافعي | ٣٨٣ المصنف لعبدرزاق | ٤٥٥٠ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٧٦ مسند الحميدي | ٢٠١ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٢٦ كتاب الصيام للفريابي | ١٠٩

**شافعي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: نەهی کراوە لە ڕۆژوو گرتن لە کاتی سەفەردا، ئەم نەهییە لای ئێمە والله أعلم بۆ نەرمی و پاراستنی خەڵکییە لە ناڕەحەتی نەک بۆ حەڕام بوونی بێ، وە نەک مەبەست لێی ئەوە بێ ئەگەر بیگرێ دروست نەبێ و لەسەر لا نەچێ، لەوانەیە هەندێک لە خەڵکی گوێ بیستی نەهی بێ، بەڵام ئەوە نابیستێ کە دەلالەت لە واتای نەهی دەکات، بۆیە بە گشتی نەهی لێ دەکات.

قال الشافعي: وقد نُهِيَ عَن صِيامِ السَّفَر، وإنَّما نُهِيَ عَنه عندنا والله أعلم على الرفق بالناسِ لا على التحريم، ولا على أنَّه لا يجزي، وقد يسمع بعض النَّاس النُهِيَ، ولا يسمع ما يَدُلُّ على معنى النُهِيَ، فيقول بالنُهِيَ جُملةً.

كتاب الأم للشافعي | **(٦٥٦/١)**

**حمزة بن عمرو** رضي الله عنه دەڵێ: بە ڕەسول الله ﷺ م وت: من هێز لە خۆمدا دەبینم توانام هەیە لە سەفەردا ڕۆژوو بگرم، ئایا کێشەی تێدایە بەڕۆژوو بم؟ فەرمووی: « ئەوە ڕوخصەیەکە لە الله ـەوە ﷻ،

هەرکەسێک ڕوخصەکە وەربگرێ ئەوە چاکە، ئەوەشی بەڕۆژوو دەبێ ئەوە کێشەی تێدا نییە ».

عَنْ أَبِي مُرَاوِحٍ، عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: أَجِدُ فِيَّ قُوَّةً عَلَى الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ، فَهَلْ عَلَيَّ جُنَاحٌ؟ قَالَ: « **هِيَ رُخْصَةٌ مِنَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ، فَمَنْ أَخَذَ بِهَا فَحَسَنٌ، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَصُومَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ** ».

صحيح مسلم | ٢٦٢٩ سنن النسائي | ٢٣٠٣

**أبي الدرداء** رضي الله عنه دەڵێ: لە یەکێک لە سەفەرەکاندا لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ بووین ڕۆژێکی گەرم بوو، بە جۆرێک پیاو دەستی دەخستە سەر سەری هێندە گەرم بوو، هیچ کەسێک لە ئێمە بەڕۆژوو نەبوو بێجگە لە ڕەسول الله ﷺ و عبدالله بن رواحة.

عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ فِي يَوْمٍ حَارٍّ، حَتَّى يَضَعَ الرَّجُلُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، وَمَا فِينَا صَائِمٌ إِلَّا مَا كَانَ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ وَابْنِ رَوَاحَةَ.

صحيح البخاري | ١٩٤٥ صحيح مسلم | ٢٦٣٠ سنن أبي داود | ٢٤٠٩ سنن ابن ماجه | ١٦٦٣ مسند أحمد | ٢١٦٩٦

**أنس بن مالک** رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لە سەفەردا بووین لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ هەندێک بەڕۆژوو بوون، هەندێکیش بەڕۆژوو نەبوون، نەڕۆژووەوانان لۆمەی ئەوانەیان دەکرد کە بەڕۆژوو نین، نە ئەوانەشی بەڕۆژوو نین لۆمەی ئەوانەیان دەکرد کە بەڕۆژوون.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلَا الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ.

صحيح البخاري | ١٩٤٧ صحيح مسلم | ٢٦٢٠ سنن أبي داود | ٢٤٠٥ الموطأ لمالک | ٦٧٠ كتاب الأم للشافعي | ٩٢٩ مسند الشافعي | ٣٨٤ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٨٢ كتاب الصيام للفريابي | ١١٠

**أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ سەفەرمان دەکرد هەمان بوو بەڕۆژوو بوو، هەمان بوو بەڕۆژوو نەبوو، ئەوەی بەڕۆژوو نەبوو لۆمەی ڕۆژووەوانی نەدەکرد، وە ئەوەشی بەڕۆژوو بوو لۆمەی ئەوەی نەدەکرد کە بەڕۆژوو نییە، وایان دەبینی هەرکەسێک

هێزی تێدایە بەڕۆژوو بێ ئەوە چاکە، ئەوەشی بێ هێزە ئەوە بەڕۆژوو نەبێ چاکە.

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ، قَالَ: كُنَّا نُسَافِرُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَمِنَّا الصَّائِمُ، وَمِنَّا الْمُفْطِرُ فَلَا يَجِدُ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ، وَلَا الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، فَكَانُوا يَرَوْنَ أَنَّهُ مَنْ وَجَدَ قُوَّةً فَصَامَ فَحَسَنٌ، وَمَنْ وَجَدَ ضَعْفًا فَأَفْطَرَ فَحَسَنٌ .

صحيح مسلم ا ٢٦١٨ سنن الترمذي ا ٧٢٢ سنن النسائي ا ٢٣٠٩ مسند أحمد ا ١١٠٨٣ المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٠٨١ صحيح ابن خزيمة ا ٢٠٣٠ كتاب الصيام للفريابي ا ٩٧ تفسير الطبري ا **(٧٣٥/٣)**

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئەوەی بەڕۆژوو دەبێ لۆمەی ناکرێ، ئەوەشی بەڕۆژوو نابێ لۆمەی ناکرێ، ڕەسول الله ﷺ لە سەفەردا جار هەبوو بەڕۆژوو بوو، جاریش هەبوو بەڕۆژوو نەبوو.

عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: لَا تَعِبْ عَلَى مَنْ صَامَ، وَلَا عَلَى مَنْ أَفْطَرَ، قَدْ صَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي السَّفَرِ، وَأَفْطَرَ.

صحيح مسلم ا ٢٦٠٨ ا سنن ابن ماجه ا ١٦٦١ مسند أحمد ا ٣١٦٢

**أنس بن مالك** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لەسەفەر بوو، هەندێک لە خەڵکی بەڕۆژوو بوون، هەندێکیشیان شکاندیان، ئەوانەی شکاندبوویان ئیشی باشیان کرد، ئەوانەشی بەڕۆژوو بوون بێ هێزبوون لە ئیشدا، دەربارەی ئەمە فەرمووی: « ئەوانەی بەڕۆژوو نەبوون ئەجرەکەیان بە دەست هێنا ».

عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَصَامَ بَعْضٌ وَأَفْطَرَ بَعْضٌ، فَتَحَزَّمَ الْمُفْطِرُونَ وَعَمِلُوا، وَضَعُفَ الصُّوَّامُ عَنْ بَعْضِ الْعَمَلِ. قَالَ: فَقَالَ فِي ذَالِكَ: « **ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالْأَجْرِ** ».

صحيح البخاري ا ٢٨٩٠ صحيح مسلم ا ٢٦٢٢ سنن النسائي ا ٢٢٨٣ المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٠٥٢

**أبي أمية الضمري** دەڵێ: لە سەفەرێکمدا هاتمە خزمەت ڕەسول الله ﷺ سەلامم لێی کرد، کاتێک هەستامەوە بڕۆم، فەرمووی: « ئەی أبا أمية چاوەڕێبە خواردنم لەگەڵ بخۆ ». وتم: ئەی ڕەسولی الله من بەڕۆژووم. فەرمووی: « وەرە هەواڵت بدەمێ دەربارەی موسافر: الله ﷻ لەسەر ڕۆژووەوانی هەڵگرتووە ڕۆژوو لەگەڵ نیوەی نوێژەکەی ».

عَنْ أَبِي أُمَيَّةَ الضَّمْرِيِّ، قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ مِنْ سَفَرٍ، فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ، فَلَمَّا ذَهَبْتُ لِأَخْرُجَ قَالَ: « انْتَظِرِ الْغَدَاءَ يَا أَبَا أُمَيَّةَ ». قَالَ: فَقُلْتُ: إِنِّي صَائِمٌ يَا نَبِيَّ اللَّهِ. فَقَالَ: « تَعَالَ أُخْبِرْكَ عَنِ الْمُسَافِرِ: إِنَّ اللَّهَ وَضَعَ عَنْهُ الصِّيَامَ وَنِصْفَ الصَّلَاةِ ».

سنن النسائي | ٢٢٦٩ سنن الدارمي | ١٧٣٨

**الدارمي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: ئەگەر ویستی لێ بوو بەڕۆژوو دەبێ، ئەگەر ویستی لێ نەبوو بەڕۆژوو نابێ.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: إِنْ شَاءَ صَامَ، وَإِنْ شَاءَ أَفْطَرَ.

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول اللە ﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا لە مەدینەوە کەوتەڕێ بەرەو مەککە دە هەزار جەنگاوەری لەگەڵ بوو، ئەمەش دوای هەشت ساڵ و نیو بوو لە کۆچ کردنی بۆ مەدینە، بەڕۆژوو بوون هەتا گەیشتنە کدید -ئاوێکە لە نێوان عسفان و قدید- ئەوکات ڕۆژووەکەی شکاند و صەحابەش شکاندیان.

عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ عُبَيْدِاللَّهِ بْنِ عَبْدِاللَّهِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ فِي رَمَضَانَ مِنَ الْمَدِينَةِ وَمَعَهُ عَشَرَةُ آلَافٍ، وَذَالِكَ عَلَى

رَأْسِ ثَمَانِ سِنِينَ وَنِصْفٍ مِنْ مَقْدَمِهِ الْمَدِينَةَ، فَسَارَ هُوَ وَمَنْ مَعَهُ مِنَ الْمُسْلِمِينَ إِلَى مَكَّةَ يَصُومُ وَيَصُومُونَ حَتَّى بَلَغَ الْكَدِيدَ -وَهُوَ: مَاءٌ بَيْنَ عُسْفَانَ وَقُدَيْدٍ- أَفْطَرَ وَأَفْطَرُوا.

صحيح البخاري | ١٩٤٤-٤٢٧٦ صحيح مسلم | ٢٦٠٦ سنن النسائي | ٢٢٩١ سنن الدارمي | ١٧٣٤ الموطأ لمالك | ٦٦٨ مسند أحمد | ٣٠٨٩ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٥٩ المصنف لعبدرزاق | ٤٥١٨ كتاب الصيام للفريابي | ٨٩ تفسير الطبري | **(٧٣٣/٣)**

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە مەدینە بەرەو مەککە بەڕێکەوت، بەڕۆژوو بوو هەتا گەیشتە عسفان، ئەنجا داوای ئاوی کرد بۆیان هێنا ئەویش بە هەردوو دەستی بەرزی کردەوە هەتا خەڵکی ببینێ، ئیتر ڕۆژووەکەی شکاند، ئەمە لە ڕەمەزاندا بوو، وە إبن عباس دەیوت: ڕەسول الله ﷺ بەڕۆژوو دەبوو، وە دەشی شکاند، کێ ویستی لێیەتی بیگرێ، کێ ویستی لێیەتی بیشکێنێ.

عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنَ الْمَدِينَةِ إِلَى مَكَّةَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ، ثُمَّ دَعَا بِمَاءٍ فَرَفَعَهُ إِلَى يَدَيْهِ

لِيُرِيَهُ النَّاسَ، فَأَفْطَرَ حَتَّى قَدِمَ مَكَّةَ، وَذَالِكَ فِي رَمَضَانَ، فَكَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ، يَقُولُ: قَدْ صَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَفْطَرَ ، فَمَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ.

صحيح البخاري | ١٩٤٨ صحيح مسلم | ٢٦٠٨ سنن أبي داود | ٢٤٠٤ سنن النسائي | ٢٣١٤ مسند الشافعي | ٣٠٩ مسند أحمد | ٢٦٥٢ مسند إسحاق بن راهوية | ٧٥٠ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٣٦ تفسير الطبري | **(٣/٧٣٠)**

**أنس بن مالک** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە سەفەرێکدا بوو لە ڕەمەزاندا، بەڕۆژوو بوو داوای قاپێک ئاوی کرد بۆیان هێنا، خستیە سەر دەستی و خواردی خەڵکی سەیریان کرد و ئەوانیش خواردیان.

حَدَّثَنَا عَبْدُ الْأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثَنَا حَمَّادُ بْنُ سَلَمَةَ، عَنْ حُمَيْدٍ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ فِي سَفَرٍ فِي رَمَضَانَ، وَهُوَ صَائِمٌ فَأُتِيَ بِإِنَاءٍ مِنْ مَاءٍ، فَوَضَعَهُ عَلَى يَدِهِ فَشَرِبَهُ، وَالنَّاسُ يَنْظُرُونَ فَشَرِبُوا.

كتاب الصيام للفريابي | ٩٦

**أبو بكر بن عبدالرحمن** دەڵێ: لە یەکێک صەحابەی ڕەسول الله ﷺ بیستم وتی: ڕەسول الله ﷺ بینی لە سەفەرەکەی فەتحی مەککە ئەمری

کرد بە خەڵکی ڕۆژووەکەیان بشکێنن، وە فەرمووی: « خۆتان بەهێز بکەن بۆ دوژمنەکەتان ». ڕەسول الله ﷺ بەڕۆژوو بوو بینم لە عرج وەستابوو ئاوی دەکرد بە سەریدا هێندە تینووی بوو یاخود هێندە گەرمای بوو، پاشان بە ڕەسول الله ﷺ وترا: ئەی ڕەسولی الله، کۆمەڵێک لە خەڵکی بەڕۆژوون کاتێک تۆیان بینی بەڕۆژووی، کاتێک ڕەسول الله ﷺ گەیشتە الکدید داوای قاپێک ئاوی کرد، بۆیان هێنا و خواردی، ئیتر خەڵکیش ڕۆژووەکەیان شکاند.

عَنْ سُمَيٍّ مَوْلَى أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَمَرَ النَّاسَ فِي سَفَرِهِ عَامَ الْفَتْحِ بِالْفِطْرِ، وَقَالَ: « تَقَوَّوْا لِعَدُوِّكُمْ ». وَصَامَ رَسُولُ اللهِ ﷺ. قَالَ أَبُو بَكْرٍ: قَالَ الَّذِي حَدَّثَنِي: لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ بِالْعَرْجِ يَصُبُّ الْمَاءَ عَلَى رَأْسِهِ مِنَ الْعَطَشِ أَوْ مِنَ الْحَرِّ، ثُمَّ قِيلَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ طَائِفَةً مِنَ النَّاسِ قَدْ صَامُوا حِينَ صُمْتَ، قَالَ: فَلَمَّا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْكَدِيدِ دَعَا بِالْقَدَحِ، فَشَرِبَ، فَأَفْطَرَ النَّاسُ .

الموطأ لمالک | ٦٦٩ سنن أبي داود | ٢٣٦٥ مسند أحمد | ١٥٩٠٣ کتاب الصيام للفريابي | ٩٠

**قزعة** دەڵێ: هاتم بۆ لای أبو سعيد الخدري رضي الله عنه خەڵک دەوریان لێدابوو، کاتێک خەڵکی جێیان هێشت، پێم وت: من ئەو پرسیارانەت لێناکەم کە ئەمانە لێتی دەکەن، پرسیارم لێکرد دەربارەی بەڕۆژوو بوون لە سەفەردا؟ وتی: لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ سەفەرمان کرد بەرەو مەککە لەکاتێکدا بەڕۆژوو بووین، لە شوێنێک وەستاین، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « وا نزیک بوونەتەوە لە دوژمنەکانتان، بەڕۆژوو نەبوون هێزە بۆتان ». ئەمە ڕوخصە بوو، هەمان بوو بەڕۆژوو بوو، هەشمان بوو شکاندبووی، پاشان لە شوێنێک وەستاین، فەرمووی: « وا خەریکە ڕووبەڕووی دوژمنەکەتان دەبنەوە، بەڕۆژوو نەبوون هێزە بۆتان بیشکێنن ». ئەمەیان ئەمر و تەئکید کردنەوە بوو لەسەرمان، ئیتر شکاندمان، پاشان وتی: وە دوای ئەوە ئێمە لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ لە سەفەردا بووین لەکاتێکدا بەڕۆژوو بووین.

عن قَزَعَةُ، قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا سَعِيدِ الْخُدْرِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، وَهُوَ مَكْثُورٌ عَلَيْه، فَلَمَّا تَفرَّقَ النَّاسُ عَنْهُ، قُلْتُ: إِنِّي لَا أَسْأَلُكَ عَمَّا يَسْأَلُكَ هَؤُلَاءِ عَنْهُ، سَأَلْتُهُ عَنِ الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ؟ فَقَالَ: سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى مَكَّةَ وَنَحْنُ صِيَامٌ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلًا، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِنَّكُمْ قَدْ دَنَوْتُمْ مِنْ**

عَدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ ». فَكَانَتْ رُخْصَةً، فَمِنَّا مَنْ صَامَ، وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ، ثُمَّ نَزَلْنَا مَنْزِلًا آخَرَ، فَقَالَ: « إِنَّكُمْ مُصَبِّحُو عَدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ ، فَأَفْطِرُوا ». وَكَانَتْ عَزْمَةً، فَأَفْطَرْنَا، ثُمَّ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا نَصُومُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ بَعْدَ ذَالِكَ فِي السَّفَرِ.

صحيح مسلم | ٢٦٢٤ سنن أبي داود | ٢٤٠٦ مسند أحمد | ١١٣٠٧ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٢٣ كتاب الصيام للفريابي | ٩٥

**جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە ڕەمەزاندا دەرچوو بۆ فەتحی مەککە بەڕۆژوو بوو هەتا گەیشتە كراع غميم خەڵکەکەش بەڕۆژوو بوون، لەوێدا داوای جامێک ئاوی کرد، بە دەست بەرزی کردەوە هەتا خەڵکی تەماشای کرد، پاشان خواردی، دوای ئەوە پێی وترا: هەندێک خەڵک هێشتا بەڕۆژوون، فەرمووی: « ئەوانە سەرپێچی کارن، ئەوانە سەرپێچی کارن ».

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَرَجَ عَامَ الْفَتْحِ إِلَى مَكَّةَ فِي رَمَضَانَ، فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ كُرَاعَ الْغَمِيمِ، فَصَامَ النَّاسُ، ثُمَّ دَعَا

بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ، فَرَفَعَهُ حَتَّى نَظَرَ النَّاسُ إِلَيْهِ، ثُمَّ شَرِبَ، فَقِيلَ لَهُ: بَعْدَ ذَالِكَ إِنَّ بَعْضَ النَّاسِ قَدْ صَامَ، فَقَالَ: « أُولَئِكَ الْعُصَاةُ، أُولَئِكَ الْعُصَاةُ ».

صحيح مسلم | ٢٦١٠ سنن الترمذي | ٧١٩ سنن النسائي | ٢٢٦٣ مسند أحمد | ١٤٥٩٢ صحيح ابن خزيمة | ٢٠١٩ كتاب الصيام للفريابي | ٩٣

الترمذي دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: خیلاف هەیە لە نێوان ئەهلی عیلمدا دەربارەی ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا: هەندێک لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ و غەیری ئەوانیش وای دەبینن ڕۆژوو شکاندن لە سەفەردا باشترە. هەتا هەندێکیان وای دەبینن ئەگەر بەڕۆژوو بوو لە سەفەردا ئەوە دەبێ قەزای بکاتەوە. وە ئەمە هەڵبژاردەی أحمد و إسحاق بن راهوية ڕۆژوو شکاندن لە سەفەردا. وە هەندێکی تر لە ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ وە غەیری ئەوانیش دەڵێن: ئەگەر هێزی لە خۆیدا بینی بەڕۆژوو بوو ئەوە چاکە، وە ئەمە باشترە، ئەمە قەولی سفیان الثوري و مالک بن أنس و عبدالله بن المبارک ـە. وە شافعي دەڵێ: مانای قەولی ڕەسول الله ﷺ: « لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ ». وە ئەو قەولەشی کە پێی دەگات کۆمەڵێک بە ڕۆژوو بوون: « أُولَئِكَ الْعُصَاةُ ». وەجهی ئەم قەولە ئەوەیە ئیحتمال دەکات لە دڵەوە ئەو ڕوخصەی الله ی

قبوڵ نەبێ، ئەمما ئەوەی پێی وایە ڕۆژوو شکاندن ڕێ پێدراوە، بەڵام بەڕۆژوو دەبێ، وە هێزی ڕۆژوو گرتنی هەیە ئەوە پێم خۆشە و بەلامەوە باشە بەڕۆژوو بێ.

وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي الصَّوْمِ فِي السَّفَرِ: فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ أَنَّ الْفِطْرَ فِي السَّفَرِ أَفْضَلُ. حَتَّى رَأَى بَعْضُهُمْ عَلَيْهِ الْإِعَادَةَ إِذَا صَامَ فِي السَّفَرِ. وَاخْتَارَ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ الْفِطْرَ فِي السَّفَرِ. وَقَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: إِنْ وَجَدَ قُوَّةً فَصَامَ فَحَسَنٌ، وَهُوَ أَفْضَلُ، وَإِنْ أَفْطَرَ فَحَسَنٌ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَعَبْدِاللهِ بْنِ الْمُبَارَكِ. وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: وَإِنَّمَا مَعْنَى قَوْلِ النَّبِيِّ ﷺ: « **لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ** ». وَقَوْلِهِ حِينَ بَلَغَهُ أَنَّ نَاسًا صَامُوا، فَقَالَ: « **أُولَئِكَ الْعُصَاةُ** ». فَوَجْهُ هَذَا إِذَا لَمْ يَحْتَمِلْ قَلْبُهُ قَبُولَ رُخْصَةِ اللَّهِ، فَأَمَّا مَنْ رَأَى الْفِطْرَ مُبَاحًا، وَصَامَ، وَقَوِيَ عَلَى ذَلِكَ فَهُوَ أَعْجَبُ إِلَيَّ.

**جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە سەفەرێکدا بوو، سەیری کرد قەرەباڵغییەک دروست بوو لەسەر سەری پیاوێک،

فەرمووی: « ئەوە چییە؟ ». وتیان: کەسێکە بەڕۆژووە. فەرمووی: « لە چاکە نییە ڕۆژوو گرتن لەسەفەردا ».

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، فَرَأَى زِحَامًا وَرَجُلًا قَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ، فَقَالَ: « **مَا هَذَا؟** ». فَقَالُوا: صَائِمٌ. فَقَالَ: « **لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصَّوْمُ فِي السَّفَرِ** ».

صحيح البخاري ا ١٩٤٦ صحيح مسلم ا ٢٦١٢ سنن أبي داود ا ٢٤٠٧ سنن النسائي ا ٢٢٦٢ سنن الدارمي ا ١٧٣٥ مسند أحمد ا ١٤٤٢٦ مسند أبي داود الطيالسي ا ١٨٢٧ المصنف لعبدرزاق ا ٤٥١٧ المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٠٥١ صحيح ابن خزيمة ا ٢٠١٧ كتاب الصيام للفريابي ا ٧٥

**كعب بن عاصم** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: «لە چاکە نییە ڕۆژوو گرتن لەسەفەردا».

عَنْ كَعْبِ بْنِ عَاصِمٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ** ».

سنن النسائي ا ٢٢٥٥ سنن ابن ماجه ا ١٦٦٤ سنن الدارمي ا ١٧٣٧ مسند أحمد ا ٢٣٦٨٠ المصنف لعبدرزاق ا ٤٥١٤ المصنف لابن أبي شيبة

| ٩٠٥٠ مسند الحميدي | ٨٨٧ صحيح ابن خزيمة | ٢٠١٦ كتاب الصيام للفريابي | ٧٠

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: «لە چاکە نییە ڕۆژوو گرتن لەسەفەردا».

عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «**لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ**».

سنن ابن ماجه | ١٦٦٥ كتاب الصيام للفريابي | ٨١

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما لە سەفەردا ڕۆژووی نەدەگرت.

عَنْ نَافِعٍ أَنَّ عَبْدَاللَّهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ لَا يَصُومُ فِي السَّفَرِ .

الموطأ لمالك | ٦٧٢ كتاب الصيام للفريابي | ١٠٢

**أبي حمزة** دەڵێ: پرسیارم کرد لە عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەرباری ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا؟ وتی: ناڕەحەتی و ئاسانکاری، دەست بگرە بە ئاسانکارییەکەی الله ﷻ.

حَدَّثَنَا غُندَرٌ، عَنْ شُعبَةَ، عَنْ أَبِي حَمزَة، قال: سألتُ ابنَ عَبَّاسٍ، عَن الصَّومِ في السَّفر، فقال: عُسْرٌ وَيُسرٌ خُذ بِيُسرِ اللهِ عليك.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٥٤

**عاصم** دەڵێ: پرسیار کرا لە أنس بن مالک رضي الله عنه دەرباری ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا؟ وتی: هەرکەسێک بیشکێنێ ئەوە ڕوخصەت دراوە، وە هەرکەسێک بەڕۆژوو بێ ئەوە ڕۆژوو گرتنەکە باشترە.

حَدَّثَنَا أَبو مُعاوية ومَروان بْنُ مُعاوية، عَنْ عاصِمٍ، سُئِل أَنسُ عَنِ الصَّومِ في السَّفر، فقال: مَن أَفطَرَ فَرُخصَةٌ ومَن صامَ فالصَّومُ أَفضل.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٠٦٥

**نافع** دەڵێ: هیچ کات عبدالله بن عمر رضي الله عنهما نەدیوە لە سەفەردا بەڕۆژوو بێ تەنها یەک ڕۆژ نەبێ، بینیم ئێوارە ڕۆژووەکەی شکاند، پێیان وت: تۆ بەڕۆژوو بووی؟ وتی: بەڵێ، من وام دەبینی ئەمڕۆ دەچمە ناو مەککە، پێم ناخۆش بوو خەڵکی بەڕۆژوو بن، بەڵام من بەڕۆژوو نەبم، وە ئەمە لە ڕەمەزاندا بوو.

عَن مَعمر، عَن أيوب، عَنْ نافعٍ، قال: ما رأيت ابنُ عمر صامَ في السَفرِ قَطُّ إلّا يومًا واحدًا، فإني رأيته أَفطَرَ حينَ أمسى، فقلنا: كُنتَ صائمًا؟ قال:

نعم، كُنتُ أرى أني سأدخُل مَكّةَ اليوم، فكرهتُ أن يكونَ النّاسُ صيامًا وأنَّ مُفطِر، وَذالک في رمضان.

المصنف لعبدرزاق | ٤٥٢٣

**هشام بن عروة** دەڵێ: لە ڕەمەزاندا لەگەڵ باوكمدا سەفەرمان دەكرد، ئەو بەڕۆژوو دەبوو، ئێمە بەۆژوو نەدەبووین، فەرمانی پێ نەدەكردین بەڕۆژوو بین.

عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ أَنَّهُ كَانَ يُسَافِرُ فِي رَمَضَانَ، وَنُسَافِرُ مَعَهُ، فَيَصُومُ عُرْوَةُ، وَنُفْطِرُ نَحْنُ، فَلَا يَأْمُرُنَا بِالصِّيَامِ .

الموطأ لمالک | ٦٧٣ كتاب الصيام للفريابي | ١١٦

**معن بن عيسى** دەڵێ: مالک بن أنس دەڵێ: فراوانی تێدایە، وە من بەڕۆژوو بوونم پێ خۆشە لە سەفەردا بۆ ئەوانەی كە بەهێزن و توانای ڕۆژوویان هەیە.

حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ، حَدَّثَنَا مَعْنٌ قَالَ: قَالَ مَالِكٌ: وَذَلِكَ وَاسِعٌ وَأَحَبُّ ذَلِكَ إِلَيَّ الصِّيَامُ فِي السَّفَرِ لِمَنْ قَوِيَ عَلَيْهِ.

كتاب الصيام للفريابي | ١١٢

**الوليد بن مسلم** دەڵێ: پرسیارم کرد لە الأوزاعي وتم: کامیانت بەلاوە پێ خۆشتر و باشترە ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا یاخود ڕۆژوو شکاندن؟ وتی: ئاسانکاری ڕۆژوو شکاندنم بەلاوە پێ خۆشترە.

حَدَّثَنَا صَفْوَانُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، قَالَ سَأَلْتُ الْأَوْزَاعِيَّ، قُلْتُ: أَيُّ ذَلِكَ أَحَبُّ إِلَيْكَ فِي السَّفَرِ تَصُومُ أَوْ تُفْطِرُ؟ قَالَ: الْيُسْرُ وَالْفِطْرُ أَحَبُّ إِلَيَّ.

كتاب الصيام للفريابي | ١١٤

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارى ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا؟ وتی: پێیان باشە بەڕۆژوو نەبێ، وە ئەگەر بەڕۆژووش بێ، ئەوە ڕۆژووەکەی قەزا ناکاتەوە.

سألْتُ أَبي عَنِ الصيام في السفر؟ فقال: يُعجبنا أن يفطر، فإن صام لم يعد صومه.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٦٩٥

**أبي داود** دەڵێ: پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەربارى ڕۆژوو گرتن لە سەفەردا؟ وتی: پێم باش نییە لە ڕەمەزان و غەیری ڕەمەزانیشدا، لە سەفەردا بەڕۆژوو نەبوون هەڵبژاردەی منە، وە ئەگەر بەڕۆژووش بێ ئەوە لەسەری لا دەچێ و قەزا کردنەوەی پێویست نییە.

سمعت أحمد بن حنبل سُئِل عَمَن صامَ رمضان في السفر؟ قال: لا يُعجبني رمضان وَغير رمضان، في السفر أَختارُ الافطار، وإن صامَ يجزئه.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٥١



# عەمرە کردن لە مانگی ڕەمەزاندا

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ بە ئافرەتێک لە ئەنصارییەکانی وت: ئەگەر ڕەمەزان هات ئەوە عەمرەی تێدا ئەنجام بدە، چونکە عەمرە کردن لە ڕەمەزاندا خێری حەجێکی هەیە.

عَنْ ابْنُ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُخْبِرُنَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِامْرَأَةٍ مِنَ الْأَنْصَارِ: « **إِذَا كَانَ رَمَضَانُ فَاعْتَمِرِي فِيهِ، فَإِنَّ عُمْرَةً فِيهِ تَعْدِلُ حَجَّةً** ».

صحيح البخاري | ١٧٨٢ صحيح مسلم | ٣٠٣٨ سنن النسائي | ٢١١٠ مسند أحمد | ٢٠٢٥



## خواردن و خواردنەوە کاتێک بیرت نییە

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێک بەڕۆژوو بوو بیری نەبوو خواردن یان خواردنەوەیەکی خوارد، ئەوە با درێژە بەڕۆژووەکەی بدات، الله ﷻ ئەو خواردن و خواردنەوەی پێشکەش کردووە.

عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: «**إِذَا نَسِيَ فَأَكَلَ وَشَرِبَ فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ**».

صحيح البخاري | ١٩٣٣ صحيح مسلم | ٢٧١٦ سنن أبي داود | ٢٣٩٨ سنن الترمذي | ٧٣٠ سنن ابن ماجه | ١٦٧٣ سنن الدارمي | ١٧٥٢ مسند أحمد | ٩٤٨٩ كتاب الأم للشافعي | ٩١٩ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٠٣ مسند إسحاق بن راهوية | ١١٩ صحيح ابن خزيمة | ١٩٨٩

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای زۆربەی ئەهلی عیلم، وە ئەمە قەولی سفيان الثوري و شافعي و أحمد و إسحاق بن راهوية ـشە. وە مالک بن أنس دەڵێ: ئەگەر

لە ڕەمەزاندا خواردنی خوارد و بیری نەبوو ئەوە دەبێ قەزای بکاتەوە. قەولی یەکەم صەحیح و دروستە.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَكْثَرِ أَهْلِ الْعِلْمِ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَالَ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ: إِذَا أَكَلَ فِي رَمَضَانَ نَاسِيًا فَعَلَيْهِ الْقَضَاءُ. وَالْقَوْلُ الْأَوَّلُ أَصَحُّ.

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر کەسێک بەڕۆژوو بوو بیری نەبوو خواردن یان خواردنەوەیەکی خوارد، پاشان بیری کەوتەوە ئەوە با درێژە بەڕۆژووەکەی بدات، الله ﷻ ئەو خواردن و خواردنەوەی پێشکەش کردووە.

عَنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي ذُبَابٍ، عَنْ عَمِّهِ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **إِذَا أَكَلَ أَحَدُكُمْ أَوْ شَرِبَ نَاسِيًا وَهُوَ صَائِمٌ ثُمَّ ذَكَرَ فَلْيُتِمَّ صِيَامَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ** ».

سنن الدارمي | ١٧٥٣

**الدارمي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: ئەهلی حجاز دەڵێن: دەبێ قەزای بکاتەوە، وە من ئەڵێم: قەزای ناکاتەوە.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: أَهْلُ الْحِجَازِ يَقُولُونَ: يَقْضِي. وَأَنَا أَقُولُ: لَا يَقْضِي.

**عطاء ابن أبي رباح** دەڵێ: ئەگەر ئینسان بیری چوو شتێکی خوارد، ئەوە با درێژە بەڕۆژووەکەی بدات، الله ﷻ ئەو خواردن و خواردنەوەی پێشکەش کردووە.

عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: إِنْ طَعِمَ إِنْسَانٌ نَاسِيًا، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ وَلَا يَقْضِهِ، فَإِنَّ اللَّهَ أَطْعَمَهُ وَسَقَاهُ.

المصنف لعبدرزاق | ٧٥٠٤

**طاوس** دەڵێ: درێژە بەڕۆژووەکەی دەدات، الله ﷻ ئەو خواردن و خواردنەوەی پێشکەش کردووە.

وعن مَعْمَرٍ، عَنِ ابْنِ طَاوُسٍ، عَنْ أَبِيهِ، قَالَ: يُتِمُّ صَوْمَهُ وَلَا يَقْضِي، اللَّهُ أَطْعَمَهُ وَسَقَاهُ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٥٠٥

**شافعي** دەڵێ: هەرکەسێک خواردن و خواردنەوەی خوارد بیری نەبوو ئەوە با درێژە بدات بە ڕۆژووەکەی، قەزا کردنەوەی نییە، وە هەندێک لە هاوڕێیانم دەڵێن: دەبێ قەزای بکاتەوە، ئێمە قەولەکەی وەرناگرین.

ومَن أكَلَ أو شَربَ ناسيًا فليتم صومه، ولا قضاء، وقد قال بعض أصحابنا: يقضي، ولَسنا نأخذُ بقوله.

كتاب الأم للشافعي | **(٦٤٩/١)**

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی کەسێک لە ڕەمەزاندا بیری نییە شتێک دەخوات؟ وتی: قەزای ناکاتەوە، وە هیچ کەفارەتێکیشی لەسەر نییە، حدیثی أبي هريرة دەلیلە.

سألْتُ أبي عَمَن أفطَرَ يومًا في رمضان ناسيًا؟ قال: ليس عليه قضاء وَلا كفارة وَلا شيء، أذهبُ إلى حديث أبي هريرة.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٧١٩

**أبي داود** دەڵێ: بە أحمد بن حنبل ـم وت ئەگەر بیری نەبێ شتێک بخوات قەزا کردنەوەی لەسەرە؟ وتی: نەخێر.

قلت لأحمد الصائم إذا أكَلَ ناسيًا عليه القضاء؟ قال: لا.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٣٨

**إسحاق بن منصور الكوسج** دەڵێ: بە أحمد بن حنبل ـم وت ئەگەر بیری نەبوو خواردن و خواردنەوە بخوات؟ وتی: هیچی لەسەر نییە.

**إسحاق بن راهوية** دەڵێ: بەو جۆرەیە کە وتوویەتی.

قلت إذا أَكَلَ أو شَرِبَ ناسيًا؟ قال: ليس عليه شيء.

قال إسحاق: كما قال.

مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية الكوسج | ٧٧٥



## شكاندنی ڕۆژوو ئەگەر هەور بوو خۆر دیار نەبوو

**أسماء بنت أبي بكر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕۆژێكی ڕەمەزان لە سەردەمی ڕەسول الله ﷺ بەربانگمان كردەوە لە ڕۆژێكی هەوردا، دوای ئەوە خۆر دەركەوت. أبو أسامةدەڵێ: بە هشام ـم وت: ئایا ئەمریان پێكرا ڕۆژووەكە قەزا بكەنەوە؟ وتی: شتێكی حەتمییە مەگەر دەكرێ نەیگرنەوە؟.!

حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ، حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ الْمُنْذِرِ، عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بَكْرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَفْطَرْنَا يَوْمًا فِي رَمَضَانَ فِي غَيْمٍ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، ثُمَّ طَلَعَتِ الشَّمْسُ .

قَالَ أَبُو أُسَامَةَ: قُلْتُ لِهِشَامٍ: أُمِرُوا بِالْقَضَاءِ؟ قَالَ: وَبُدٌّ مِنْ ذَالِكَ؟!

صحيح البخاري | ١٩٥٩ سنن أبي داود | ٢٣٥٩ سنن ابن ماجه | ١٦٧٤ مسند أحمد | ٢٦٩٢٧ المصنف لابن أبي شيبة | ٩١٣٩ صحيح ابن خزيمة | ١٩٩١ سنن الدارقطني باب طلوع الشمس بعد الإفطار | ١

**خالد بن أسلم** دەڵێ: عمر بن الخطاب رضي الله عنه ڕۆژێكی ڕەمەزان كە هەور بوو ڕۆژووەكەی شكاند، پێی وابوو ئێوارەیە و خۆر نیشتووە،

پیاوێک هات وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران وا خۆر دەرکەوت، عمر وتی: بابەتەکە ئاسانە، ئێمە هەوڵ و تێکۆشانی خۆمانماندا.

عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ أَخِيهِ خَالِدِ بْنِ أَسْلَمَ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَفْطَرَ ذَاتَ يَوْمٍ فِي رَمَضَانَ فِي يَوْمٍ ذِي غَيْمٍ، وَرَأَى أَنَّهُ قَدْ أَمْسَى، وَغَابَتِ الشَّمْسُ، فَجَاءَهُ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، طَلَعَتِ الشَّمْسُ، فَقَالَ عُمَرُ: الْخَطْبُ يَسِيرٌ، وَقَدِ اجْتَهَدْنَا.

الموطأ لمالک ا ٦٩٢ کتاب الأم للشافعي ا ٩١١ مسند الشافعي ا ٣٧٣

**مالک** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم خەبەرە دەڵێ: مەبەستی لە « الْخَطْبُ يَسِيرٌ » والله أعلم وای دەبینین واتە قەزا کردنەوەی، وە ئاسانی قەرەبوو کردنەوەی، دەڵێ: لە جیاتیدا ڕۆژێک بەڕۆژوو دەبین.

قَالَ مَالِكٌ: يُرِيدُ بِقَوْلِهِ: الْخَطْبُ يَسِيرٌ الْقَضَاءَ فِيمَا نُرَى، وَاللَّهُ أَعْلَمُ وَخِفَّةَ مَئُونَتِهِ وَيَسَارَتِهِ، يَقُولُ: نَصُومُ يَوْمًا مَكَانَهُ .

**شافعي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم خەبەرە دەڵێ: مەبەستی ئەوەیە والله أعلم لە جیاتیدا ڕۆژێک قەزا دەکرێتەوە.

قَالَ الشَّافِعِيُّ: كَأَنَّه يُرِيدُ بِذالکَ وَاللَّهُ أَعْلَمُ قَضَاءَ يَومٍ مَكَانَهُ.

ئەم ڕیوایەتە کە ئیمامی مالک هێناویەتی، عبدالرزاق ـیش ڕیوایەتی کردووە لە کۆتاییەکەیدا ئەوەی تێدایە کە ئیمامی عمر رضي الله عنه وتوویەتی: بابەتەکە ئاسانە، ئێمە هەوڵ و تێکۆشانی خۆمانمانداوە، لە جیاتیدا ڕۆژێک قەزا دەکەینەوە.

عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: حَدَّثَنِي زَيْدُ بْنُ أَسْلَمَ، عَنْ أَبِيهِ قَالَ: أَفْطَرَ النَّاسُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ فِي يَوْمٍ مُغَيَّمٍ، ثُمَّ نَظَرَ نَاظِرٌ فَإِذَا الشَّمْسُ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: الْخَطْبُ يَسِيرٌ، وَقَدِ اجْتَهَدْنَا، نَقْضِي يَوْمًا .

المصنف لعبدرزاق | ٧٥٢٣

**ابن جريج** دەڵێ: بە عطاء ابن أبي رباح ـم وت: ڕۆژووەکەمم شکاند لە ڕۆژێکی هەوردا پێم وابوو شەو داهاتووە، پاشان خۆر دەرکەوتەوە، ئایا ئەو ڕۆژە قەزا بکەمەوە و فیدیەی نەدەم؟ وتی: بەڵێ.

حَدَّثَنَا مُحمد بْنُ بَكرٍ، عَنْ ابنِ جُرَيجٍ، عَنْ عَطاءٍ، قال: قلت : أفطَرت في يوم مُغَيِّم في شهرِ رَمضان وأنا أَحسِبُهُ اللَّيل، ثُمَّ بَدَتِ الشَّمسُ، أفأَقضي ذالكَ اليومَ قَطُّ ولا أُكَفِّرُ؟ قال: نعم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩١٤٥ المصنف لعبدرزاق | ٧٥١٨

# کەڵەشاخ کردن کاتێک بەڕۆژووی

**ثوبان** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول اللە ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کەڵەشاخ دەکات و ئەوەشی بۆی دەکرێ ڕۆژووەکەیان شکاوە.

عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ -يَعْنِي الرَّحَبِيَّ- عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « **أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ** ».

سنن أبي داود ا ٢٣٦٧ سنن ابن ماجه ا ١٦٨٠ سنن الدارمي ا ١٧٥٧ مسند أحمد ا ٢٢٣٨٢ مسند أبي داود الطيالسي ا ١٠٨٢ المصنف لعبدرزاق ا ٧٦٥٤ المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٣٨٨

**الدارمي** دیوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: من خۆم دەپارێزم لە کەڵەشاخ کردن لە ڕەمەزاندا کاتێک بەڕۆژووم.

قَالَ أَبُو مُحَمَّدٍ: أَنَا أَتَّقِي الْحِجَامَةَ فِي الصَّوْمِ فِي رَمَضَانَ.

**شداد بن أوس** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول اللە ﷺ دەستی گرتبووم لە بقیع دامان بە لای کەسێکدا کەڵەشاخی دەکرد هەژدە ڕۆژ لە ڕەمەزان تێپەڕی بوو، فەرمووی: « ئەو کەسەی کەڵەشاخ دەکات و ئەوەشی بۆی دەکرێ ڕۆژووەکەیان شکاوە ».

عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ أَبِي الْأَشْعَثِ، عَنْ شَدَّادِ بْنِ أَوْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَتَى عَلَى رَجُلٍ بِالْبَقِيعِ وَهُوَ يَحْتَجِمُ وَهُوَ آخِذٌ بِيَدِي لِثَمَانِ عَشْرَةَ خَلَتْ مِنْ رَمَضَانَ، فَقَالَ: « أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ ».

سنن أبي داود | ٢٣٦٩ سنن ابن ماجه | ١٦٨١ سنن الدارمي | ١٧٥٦ مسند أحمد ١٧١١٧ المصنف لعبدرزاق | ٧٦٥٢ صحيح ابن خزيمة | ١٩٦٢ كتاب ناسخ الحديث ومنسوخه لابن شاهين | ٣٩٦

رافع بن خديج رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: ئەو کەسەی کەڵەشاخ دەکات و ئەوەشی بۆی دەکرێ ڕۆژووەکەیان شکاوە.

عَنِ السَّائِبِ بْنِ يَزِيدَ، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ ».

سنن الترمذي | ٧٨٤ مسند أحمد | ١٥٨٢٨ المصنف لعبدرزاق | ٧٦٥٥ صحيح ابن خزيمة | ١٩٦٤

الترمذي دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: هەندێک لە ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ وە غەیری ئەوانیش دەڵێن کەڵەشاخ کردن بۆ ڕۆژووەوان کەراهەتی هەیە، هەتا هەندێک لە صەحابەی ڕەسول

الله ﷺ بە شەودا کەڵەشاخیان کردووە، لەوانە أبو موسى الأشعري و عبدالله بن عمر رضي الله عنهما، وە ئەمە قەولی عبدالله بن المبارک ـیشە دەڵێ: بیستم إسحاق بن منصور الكوسج دەیوت: عبدالرحمن بن مهدي وتی: هەرکەسێک بەڕۆژوو بێ کەڵەشاخ بکات دەبێ ئەو ڕۆژە قەزا بکاتەوە. إسحاق بن منصور دەڵێ: ئەمە قەولی أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهوية ـشە. الزعفراني بۆی گێڕاینەوە دەڵێ: شافعي وتی: لە ڕەسول الله ـوە ﷺ ڕیوایەت کراوە کەڵەشاخی کردووە کاتێک بەڕۆژوو بووە، وە ڕیوایەت کراوە ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: «أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ». وە پێم وانییە هیچ کام لەم دوو حدیثە سابت بوو بن. وە ئینسان ئەگەر خۆی بپارێزێ لە کەڵەشاخ کردن کاتێک بەڕۆژووە ئەوەم پێ باشترە خۆ ئەگەر کەڵەشاخیش بکات وای نابینم ڕۆژووەکەی بشکێ. ئەمە قەولی شافعي بوو لە بەغداد، ئەمما لە میصر ئەوە مەیلی بۆ ڕوخصە دەچوو، وە کەڵەشاخ کردنی بۆ ڕۆژووەوان پێ ئاسایی بوو، ئیحتجاجی بەو حدیثە دەکرد کە ڕەسول الله ﷺ لە حەجیماڵئاواییدا کەڵەشاخی کردوە لەکاتێکدا بەڕۆژوو بووە و لە ئیحرامدا بووە.

وَقَدْ كَرِهَ قَوْمٌ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَغَيْرِهِمُ الْحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ، حَتَّى إِنَّ بَعْضَ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ احْتَجَمَ بِاللَّيْلِ، مِنْهُمْ أَبُو مُوسَى الْأَشْعَرِيُّ، وَابْنُ عُمَرَ، وَبِهَذَا يَقُولُ ابْنُ الْمُبَارَكِ: سَمِعْت إِسْحَاقَ بْنَ مَنْصُورٍ، يَقُولُ: قَالَ عَبْدُالرَّحْمَنِ بْنُ مَهْدِيٍّ: مَنِ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ فَعَلَيْهِ الْقَضَاءُ. قَالَ إِسْحَاقُ بْنُ مَنْصُورٍ: وَهَكَذَا قَالَ أَحْمَدُ وَإِسْحَاقُ. حَدَّثَنَا الزَّعْفَرَانِيُّ قَالَ: وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: قَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ، وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: « **أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ** ». وَلَا أَعْلَمُ وَاحِدًا مِنْ هَذَيْنِ الْحَدِيثَيْنِ ثَابِتًا. وَلَوْ تَوَقَّى رَجُلٌ الْحِجَامَةَ وَهُوَ صَائِمٌ كَانَ أَحَبَّ إِلَيَّ وَلَوِ احْتَجَمَ صَائِمٌ لَمْ أَرَ ذَالِكَ أَنْ يُفْطِرَهُ. هَكَذَا كَانَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ بِبَغْدَادَ، وَأَمَّا بِمِصْرَ فَمَالَ إِلَى الرُّخْصَةِ، وَلَمْ يَرَ بِالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ بَأْسًا، وَاحْتَجَّ بِأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ فِي حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَهُوَ مُحْرِمٌ صَائِمٌ.

**أبي العالية** دەڵێ: چووم بۆ لای أبي موسى الأشعري رضي الله عنه کاتێک والی بەصرە بوو، ئێوارە بوو سەیرم کرد کەڵەشاخی کردووە و خەریکی خواردنی خورمایە لەگەڵ پێخۆرێکی سوێر کراو خۆش کراو، پێم وت: بۆچی بە ڕۆژدا کەڵەشاخ ناکەی، وتی: داوام لێ دەکەی کاتێک بەڕۆژووم خوێنی خۆم بڕژێنم؟!

حَدَّثَنَا محمد بن أبي عَدِيٍّ، عَن حُمَيدٍ، عَن بَكرٍ، عن أبي العاليةِ، قال: دَخلتُ على أبي موسى وهو أمير البصرة مُمسِيًا فوجدته يأكُلُ تمرًا وكَامِخًا وقد احتَجَم، فقلت له: ألا تحتجم بنهارٍ، فقال: أتأمرني أن أُهريقَ دَمي وأنا صائمُ؟

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٣٩٧

**مسروق** دەڵێ: ڕۆژووەوان نابێ کەڵەشاخ بکات.

حَدَّثَنَا أبو مُعاوية، عَنِ الأعمشِ، عَن أبي الضُحى، عَن مَسروقٍ، قال: لا يحتجمُ الصَّائم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٣٩٩

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی ڕۆژووەوان کەڵەشاخ دەکات؟ وتی: ڕۆژووەکەی دەشکێ.

سألت أبي عَنِ الصائم يَحتجم في رمضان؟ فقال: يُفطِر.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٦٧٧

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: بیستم باوکم دەیوت: ڕۆژووەوان نابێ کەڵەشاخ بکات، ئەگەر کردی ئەوە دەبێ لە جیاتیدا ڕۆژێک بەڕۆژوو بێ، ئەگەر هاتوو کەسێک ئینکاری کرد پێی دەوترێ: چی دەڵێی دەربارەی ڕشانەوە؟ ئەگەر وتی: دەبێ قەزای بکاتەوە. کەڵەشاخ و ڕشانەوە بە عەمدی یەک مانایان هەیە: هیچیان نەخواردووە، بەڵکو شتیان لێوە دەرچووە.

سمعتُ أَبي يقول: الصائم لا يَحتَجم، فإِن احتَجَم أَعادَ يومًا مكانه، فإن أنكره الإنسان يقال له: ما تقول إن تَقَيأ؟ فإن قال: يُعيد. فأمر الحِجامة والمُتقيء عامدًا في معنى واحد: لم يأكلا شيئًا وَإنما أخرجا.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٦٧٩

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی کەڵەشاخ بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: ئەگەر کەڵەشاخی کرد لە ڕەمەزاندا ڕۆژووەکەی شکاوە، لە جیاتیدا ڕۆژێک دەگرێتەوە کەفارەتی لەسەر نییە.

سألت أَبي عَنِ الحِجامة للصائم؟ قال: إذا احتَجَم في رمضان فقد أفطر يقضي يومًا مكانه ولا كفارة عليه.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٦٨٠

**إبن هانئ** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أبا عبدالله أحمد بن حنبل دەربارەی کەسێک کەڵەشاخ دەکات لە مانگی ڕەمەزاندا؟ وتی: لە جیاتیدا ڕۆژێک دەگرێتەوە.

وە پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەو کەسەی کەڵەشاخ دەکات لە ڕەمەزاندا؟ وتی: پێم باش نییە، قەزای دەکاتەوە ڕۆژێک دەگرێتەوە.

پێی وترا: کام حدیث بەلاتەو بەهێزە لە کەڵەشاخدا؟ وتی: حدیثەکەی ثوبان.

پێی وترا: ڕۆژووەوان کەڵەشاخ دەکات؟ وتی: نابێ کەڵەشاخ بکات.

وترا: ئەی ئەگەر کەڵەشاخی کرد؟ وتی: دەبێ قەزای بکاتەوە ڕۆژێک بەڕۆژوو بێ.

پرسیام لێکرد دەبارەی کەسێک لە ڕەمەزاندا کەڵەشاخ دەکات لە ساقدا یاخود لەسەر دەستی یاخود هەر بەشێک لێی؟ وتی: ڕۆژووەکەی شکاوە لە هەر جێگایەک بیکات کە پێی بوترێ کەڵەشاخ.

سألت أبا عبدالله عن رَجُلٍ احتجم شهر رمضان؟ قال: يصوم يومًا مكانه.

وسُئل عَنِ الذي يَحتجم في رمضان؟ قال: لا يعجبني، يقضي يومًا مكانه.

قيل له: وأي حديثٍ أقوى عندك في الحجامة؟ قال: حديث ثَوبان.

قيل له: يَحتجِم الصَّائم؟ قال: لا يَحتَجِم.

قيل: فإنِ احتجم؟ قال: عليه القضاء يوم مكانه.

سألته عَنِ الرَّجُل يَحتَجم على ساقه أو على يده أو شيءٍ مِنه في رمضان؟ قال: قد أفطَر إذا كانَ فيه ذِكر الحِجَامة.

مسائل أحمد بن حنبل رواية إبن هانئ | صـ : ١٦١

**أبي داود** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی کەڵەشاخ کردن لە ڕەمەزاندا؟ وتی: دەبێ قەزای بکاتەوە ڕۆژێک بەڕۆژوو بێ.

سألت أحمد عَمّن احتَجَمَ في رمضان؟ قال: يقضي يومًا مكانه.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٢٤

**أبي داود** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی کەڵەشاخ کردن لە ڕەمەزاندا؟ وتی: لە ڕەمەزاندا پێم باش نیە، وتم: ئەگەر کردی؟ وتی: دەبێ قەزای بکاتەوە ڕۆژێک بەڕۆژوو بێ.

وتم بە أحمد بن حنبل ئەو کەسەی کەڵەشاخەکە دەکات لە ڕەمەزاندا دەبێ ڕۆژێک قەزا بکاتەوە و بەڕۆژوو بێ؟ وتی: بەڵێ.

سألت أحمد عَنِ الحِجَامة للصائم؟ قال: في رمضان لا يُعجبني، قلت: فإن احتجم؟ قال: يقضي يومًا مكانه.

قلت لأحمد الحُجام إذا حَجَمَ في رمضان أيقضي يومًا مكانه؟ قال: نعم.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٢٥

**إبن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ کەڵەشاخی کرد لەکاتێکدا ئیحرامی بەست بوو، وە کەڵەشاخی کرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو.

حَدَّثَنَا وُهَيْبٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ احْتَجَمَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، وَاحْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ.

صحيح البخاري | ١٩٣٨ سنن الترمذي | ٧٨٥

**الترمذي** دوڵی ڕیوایەت کردنی حدیثی ژمارە «٧٨٧» لە سونەنەکەیدا دەڵێ: هەندێک لە ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ وە غەیری

ئەوانیش وای دەبینن کەڵەشاخ کردن بۆ ڕۆژووەوان کێشەی نییە. وە ئەمە قەولی سفیان الثوري و مالک بن أنس و شافعي ـیە.

وَقَدْ ذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَغَيْرِهِمْ إِلَى هَذَا الْحَدِيثِ، وَلَمْ يَرَوْا بِالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ بَأْسًا. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيِّ.

**إبن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ کەڵەشاخی کرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو.

حَدَّثَنَا عَبْدُ الْوَارِثِ، حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: احْتَجَمَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ صَائِمٌ.

صحيح البخاري | ١٩٣٩ سنن أبي داود | ٢٣٧٢ مسند أبي داود الطيالسي | ٢٧٧٩

**شعبة** دەڵێ: بیستم ثابت البناني پرسیاری کرد لە أنس بن مالک رضي الله عنه: ئایا ئێوەی صەحابە کەڵەشاخ بەلاتانەوە مەکروه بوو؟ وتی: نەخێر، تەنها ترسمان هەبوو کەسەکە لاواز ببێ.

عَنْ شُعْبَةُ، قَالَ: سَمِعْتُ ثَابِتً الْبُنَانِيَّ يَسْأَلُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: أَكُنْتُمْ تَكْرَهُونَ الْحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ؟ قَالَ: لَا، إِلَّا مِنْ أَجْلِ الضَّعْفِ.

صحيح البخاري | ١٩٤٠ سنن أبي داود | ٢٣٧٥ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٠٨

**إبن شهاب الزهري** دەڵێ: سعد بن أبي وقاص و عبدالله بن عمر رضي الله عنهما کەڵەشاخیان دەکرد بەڕۆژووش بوون.

عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ وَعَبْدَاللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَا يَحْتَجِمَانِ، وَهُمَا صَائِمَانِ .

الموطأ لمالک | ٦٧٨

**أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: کەڵەشاخ کردن بۆ ڕۆژووەوان ئاساییە.

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَحْيَى، نا مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْأَنْصَارِيُّ، عَنْ أَبِي الْمُتَوَكِّلِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: لَا بَأْسَ بِالْحِجَامَةِ لِلصَّائِمِ.

صحيح ابن خزيمة | ١٩٧٩

**أبي المتوكل** دەڵێ: أبي سعيد الخدري رضي الله عنه کەڵەشاخ کردن بۆ ڕۆژووەوان بەلایەوە کەراهەتی هەبوو لەبەر ئەوەی کەسەکە بێ هێز دەکات.

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ شُعْبَةَ، عَن قتادة، عن أبي المتوَكل، عَن أبي سَعيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّه كَرِهَ الحِجَامَة للصَّائم مِن أجلِ الضَّعف.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٤١٣ صحيح ابن خزيمة ا ١٩٧١

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما کەڵەشاخی دەکرد کاتێک بەڕۆژوو بوو، دواتر تەرکی کرد هەرکات بەڕۆژوو بووایە کەڵەشاخی نەدەکرد هەتا بەربانگی دەکردەوە.

عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِاللَّه بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا أَنَّهُ كَانَ يَحْتَجِمُ، وَهُوَ صَائِمٌ، قَالَ: ثُمَّ تَرَكَ ذَالِكَ بَعْدُ، فَكَانَ إِذَا صَامَ لَمْ يَحْتَجِمْ حَتَّى يُفْطِرَ.

الموطأ لمالك ا ٦٧٧ كتاب الأم للشافعي ا ٩١٤ المصنف لعبدرزاق ا ٧٦٦٣ المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٤١٠

**عامر الشعبي** دەڵێ: حسين بن علي کەڵەشاخی کرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو.

حَدَّثَنَا مروان بن مُعاوية، عَنْ أَبي أُسامة، عَنِ الشَّعبيِّ، قال: احتَجَمَ الحُسين بن علي وهو صائم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤١٥

**عبدالرحمن بن أبي ليلى** دەڵێ: لە صەحابەی ڕەسول الله ـوە ﷺ وتیان: ڕەسول الله ﷺ نەهی کرد لە کەڵەشاخ کردن بۆ ڕۆژووەوان، وە ڕۆژوو بەستنەوە بە ڕۆژووەوە بۆ پاراستنی گیانی صەحابەکانی.

حَدَّثَنَا وَكيعٌ، عَنْ سُفيانَ، عَن عبدالرحمن بن عابس، عَن عبدالرحمن بن أبي ليلى، عن أصحاب محمد ﷺ قالوا: نهى رسول اللهِ ﷺ عَنِ الحِجَامة للصَّائم والوِصال في الصِّيام إبقاءً على أصحابه.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤١٨ المصنف لعبدرزاق | ٧٦٦٧ سنن أبي داود | ٢٣٧٤

**بزيع** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أبا وائل دەربارەی کەڵەشاخ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: بۆیە کەراهەتی هەیە لەبەرئەوەی هۆکارێکە بۆ بێ هێز بوونی کەسەکە.

حَدَّثَنَا عَبدةُ بن سليمانَ، عَن مِسعَرٍ، عَن بَزيع، قال: سألتُ أبا وائلٍ عَنِ الحِجَامة للصَّائمِ، فقال: إنَّما يُكره ذالكَ للضَّعف.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٤١٩

**عبدالله بن عثمان** دەڵێ: عطاء ابن أبي رباح و سعيد بن جبير وتيان: کێشەی تێدا نییە کەڵەشاخ کردن بۆ کەسی ڕۆژووەوان مادام ترسی نەبێ لەسەر بێ هێز بوونی.

حَدَّثَنَا إسماعيل بن عَيَّاش، عَن عبدالله بن عثمانَ، عَن عطاءٍ وسعيد بن جُبيرٍ، قالا: لا بأسَ بالحِجَامة الصَّائم ما لم يَخفَ ضَعفًا.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٤٩٢١

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: بۆیە کەڵەشاخ کردن بەلایانەوە کەراهەتی هەبوو لەبەرئەوەی هۆکارێکە بۆ بێ هێز بوونی کەسەکە.

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ قَالَ: مَا كَانُوا يَكْرَهُونَ الْحِجَامَةَ لِلصَّائِمِ إِلَّا مِنْ أَجْلِ الضَّعْفِ.

المصنف لعبدرزاق ا ٧٦٦٠

**هشام بن عروة** دەڵێ: باوکم کەڵەشاخی دەکرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو، پاشان ڕۆژووەکەشی نەدەشکاند، قەت ئەمدیوە کەڵەشاخ بکات بەڕۆژوو نەبێ.

**يحيى بن يحيى الليثي** دەڵێ: مالک وتی: کەڵەشاخ کردن بۆ ڕۆژووەوان کەراهەتی نییە ئەگەر ترس لەسەر بێ هێزی کەسەکە دروست نەکات، ئەگەر ئەوە نەبێ ئەوە هیچ کەراهەتێکی نییە، ئەگەر پیاوێک لە ڕەمەزاندا کەڵەشاخی کرد، پاشان سەلامەت بوو لە بێ هێزی و شکاندنی ئەوە هیچی لەسەر نییە، کەڵەشاخ بۆیە بە کەراهەت بینراوە لە ترسی ئەوەی ببێتە مایەی زەرەر دان لە ڕۆژووەکە، هەرکەسێک کەڵەشاخ بکات وە سەلامەت بێ لە شکاندن هەتا ئێوارە دادێ، ئەوە هیچی لەسەر نییە، وە پێویست ناکات ڕۆژووی ئەو ڕۆژە قەزا بکاتەوە.

عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَحْتَجِمُ وَهُوَ صَائِمٌ، ثُمَّ لَا يُفْطِرُ، قَالَ: وَمَا رَأَيْتُهُ احْتَجَمَ قَطُّ، إِلَّا وَهُوَ صَائِمٌ.

قَالَ يَحْيَى: قَالَ مَالِكٌ: لَا تُكْرَهُ الْحِجَامَةُ لِلصَّائِمِ إِلَّا خَشْيَةً مِنْ أَنْ يَضْعُفَ، وَلَوْلَا ذَالِكَ لَمْ تُكْرَهْ، وَلَوْ أَنَّ رَجُلًا احْتَجَمَ فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ سَلِمَ مِنْ أَنْ

يُفْطِرَ لَمْ أَرَ عَلَيْهِ شَيْئًا، وَلَمْ آمُرْهُ بِالْقَضَاءِ لِذَالِكَ الْيَوْمِ الَّذِي احْتَجَمَ فِيهِ، لِأَنَّ الْحِجَامَةَ إِنَّمَا تُكْرَهُ لِلصَّائِمِ لِمَوْضِعِ التَّغْرِيرِ بِالصِّيَامِ، فَمَنِ احْتَجَمَ وَسَلِمَ مِنْ أَنْ يُفْطِرَ حَتَّى يُمْسِيَ، فَلَا أَرَى عَلَيْهِ شَيْئًا، وَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءُ ذَالِكَ الْيَوْمِ.

الموطأ لمالك | ٦٧٩

**شافعي** دەڵێ: وە ئەمە فەتوای زۆرێک لە فوقەهایە کە پێیان گەیشتووم.

وە لە ڕەسول الله ـوە ﷺ ڕیوایەت کراوە: «**أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ**». وە ڕیوایەت کراوە کەڵەشاخی کردووە کاتێک بەڕۆژوو بووە، وە پێم وانییە هیچ کامیان سابت بوو بن، ئەگەر یەکێک لەم دوو حدیثە لە ڕەسول الله ـوە ﷺ سابت بووایە فەتوام پێ دەدا، چونکە حوجە لە قەولی ئەودایە، وە ئینسان ئەگەر تەرکی کەڵەشاخ بکات کاتێک بەڕۆژووە بۆ خۆ پیارێزی ئەوەم پێ باشترە خۆ ئەگەر کەڵەشاخیش بکات وای نابینم ڕۆژووەکەی بشکێ.

قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَهذَا فُتيَا كَثِيرُ مِمَن لَقِيتُ مِنَ الفُقَهَاءِ.

قَدْ رُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ « **أَفْطَرَ الْحَاجِمُ وَالْمَحْجُومُ** ». وَرُوِيَ عَنْهُ أَنَّهُ احْتَجَمَ وَهُوَ صَائِمٌ، وَلَا أَعْلَمُ وَاحِدًا مِنْهُمَا ثَابِتًا، وَلَو ثَبَتَ وَاحِدٌ مِنهُما عَنِ النَّبِي ﷺ قُلتُ بِه، فَكَانَتِ الحُجَةُ في قَولِهِ، وَلَوْ تَرَكَ رَجُلٌ الْحِجَامَةَ صَائِمًا للتَّوَقِّي كَانَ أَحَبَّ إِلَيَّ وَلَو احْتَجَمَ لَمْ أَرَه يُفْطِرَهُ.

كتاب الأم للشافعي | **(١/٦٤٨)**



# ڕشانەوەی کەسی ڕۆژووەوان

أبي هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ئەگەر ڕۆژووەوان ڕشایەوە ڕۆژووەکەی ناشکێ، چونکە لێوەی هاتووەتە دەرەوە نەک چووبێتە ژوورەوە.

وَقَالَ لِي يَحْيَى بْنُ صَالِحٍ: حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ سَلَّامٍ، حَدَّثَنَا يَحْيَى، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْحَكَمِ بْنِ ثَوْبَانَ، سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: إِذَا قَاءَ فَلَا يُفْطِرُ، إِنَّمَا يُخْرِجُ وَلَا يُولِجُ.

صحيح البخاري | ١٩٣٧مـ/١

وتم: ئەمە بە نسبەت ڕشانەوەیەک کە بێ ویستی کەسەکە بێ، ئەما ئەگەر هاتوو بە ئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە، ئەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە، وە دەبێ قەزای بکاتەوە، ئەمە عەمەلی ئەهلی عیلمی لەسەرە.

هەریەک لە: « أحمد بن حنبل، أبي داود، الترمذي، إبن ماجه، الدارمي، إبن خزيمة » لە ڕێگەی عيسى بن يونس حدیثی ڕشانەوەی ڕۆژووەوان ڕیوایەت دەکەن، سەنەدی هەموویان دەچێتەوە سەر ئەم ڕێگەیە: حَدَّثَنَا عِيسَى بْنُ يُونُسَ، عَنْ هِشَامِ بْنِ حَسَّانَ، عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي

هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: « مَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ فَلَيْسَ عَلَيْهِ قَضَاءٌ، وَمَنِ اسْتَقَاءَ عَمْدًا فَلْيَقْضِ ».

سنن أبي داود | ٢٣٨٠ سنن الترمذي | ٧٢٩ سنن ابن ماجه | ١٦٧٦ سنن الدارمي | ١٧٥٥ مسند أحمد | ١٠٤٦٣ صحيح ابن خزيمة | ١٩٦٠

**الدارمي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عیسى دەڵێ: ئەهلی بەصرە پێیان وایە هشام بن حسان تووشی وەهم بووە لەم حدیثەدا، بابەتی خیلافەکە لەوەدایە.

قَالَ عِيسَى: زَعَمَ أَهْلُ الْبَصْرَةِ أَنَّ هِشَامًا أَوْهَمَ فِيهِ، فَمَوْضِعُ الْخِلَافِ هَاهُنَا.

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: لەم بابەدا هەمان حديث دەربارەی ڕشانەوە لە غەیری أبي هريرة ـشەوە ڕیوایەت کراوە لە أبو الدرداء، ثوبان، فضالة بن عبيد.

ئەمما حدیثی أبي هريرة حدیثێکی باش و غەریبە، ئەم حدیثە نایناسین و نازانین لە حدیثی هشام، لە محمد بن سيرين، لە أبي هريرة، لە ڕەسول الله ﷺ ئیللا لە ڕیوایەتی عیسى بن یونس ـەوە نەبێ. محمد بن إسماعيل البخاري وتی: وای نابینم مەحفوظ بێ.

ئەم حدیثە لە غەیری أبو هريرة ـشەوە ڕیوایەت کراوە، بەڵام سەنەدەکەی صەحیح نییە.

وە ڕیوایەت کراوە لە أبي الدرداء، ثوبان، فضالة بن عبيد کە ڕەسول الله ﷺ ڕشاوەتەوە ڕۆژووەکەی شکاندووە، واتای ئەمە بەو جۆرەیە: ڕەسول الله ﷺ بەڕۆژوو بووە ڕۆژووی سوننەت، ڕشاوەتەوە بێ هێز بووە، ئیتر شکاندوویەتی، بەم جۆرە لە هەندێک حدیثدا بە درێژی و تەفسیر کراوی هاتووە.

عەمەل کردن لای ئەهلی عیلم دەربارەی حدیثی أبي هريرة لە ڕەسول الله ـوە ﷺ ئەوەیە ڕۆژووەوان ئەگەر بڕشێتەوە قەزا کردنەوەی لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر خۆی بڕشێنێتەوە ئەوە دەبێ قەزای بکاتەوە، ئەمە قەولی هەریەک لە سفيان الثوري، شافعي، أحمد، إسحاق بن راهوية ـشە.

وَفِي الْبَابِ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَثَوْبَانَ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ.

حَدِيثُ أَبِي هُرَيْرَةَ حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، لَا نَعْرِفُهُ مِنْ حَدِيثِ هِشَامٍ عَنِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ إِلَّا مِنْ حَدِيثِ عِيسَى بْنِ يُونُسَ. وَقَالَ مُحَمَّدٌ: لَا أُرَاهُ مَحْفُوظًا.

وَقَدْ رُوِيَ هَذَا الْحَدِيثُ مِنْ غَيْرِ وَجْهٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ وَلَا يَصِحُّ إِسْنَادُهُ.

وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، وَثَوْبَانَ، وَفَضَالَةَ بْنِ عُبَيْدٍ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَاءَ فَأَفْطَرَ، وَإِنَّمَا مَعْنَى هَذَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ صَائِمًا مُتَطَوِّعًا، فَقَاءَ، فَضَعُفَ، فَأَفْطَرَ لِذَلِكَ هَكَذَا رُوِيَ فِي بَعْضِ الْحَدِيثِ مُفَسَّرًا.

وَالْعَمَلُ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ عَلَى حَدِيثِ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّ الصَّائِمَ إِذَا ذَرَعَهُ الْقَيْءُ فَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِ، وَإِذَا اسْتَقَاءَ عَمْدًا فَلْيَقْضِ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ.

**فضالة بن عبيد** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هاتە ناومان لە ڕۆژێکدا کە بەڕۆژوو دەبوو تیایدا، داوای قاپێک ئاوی کرد و خواردی، وتمان: ئەی ڕەسولی الله، ئەمە ڕۆژێکە تۆ تیایدا ڕۆژووت دەگرت. فەرمووی: « بەڵێ، بەڵام ڕشامەوە ».

عَنْ أَبِي مَرْزُوقٍ، قَالَ: سَمِعْتُ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ الْأَنْصَارِيَّ يُحَدِّثُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ عَلَيْهِمْ فِي يَوْمٍ كَانَ يَصُومُهُ، فَدَعَا بِإِنَاءٍ فَشَرِبَ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ هَذَا يَوْمٌ كُنْتَ تَصُومُهُ. قَالَ: « **أَجَلْ، وَلَكِنِّي قِئْتُ** ».

سنن ابن ماجه | ١٦٧٥ مسند أحمد | ٢٣٩٣٦

**معدان بن طلحة** دەڵێ: أبا الدرداء رضي الله عنه بۆی گێڕامەوە: ڕەسول الله ﷺ ڕشایەوە ڕۆژووەکەی شکاند، لە مزگەوتی دیمەشق گەیشتم بە ثوبان خزمەتکاری ڕەسول الله ﷺ، وتم: أبا الدرداء رضي الله عنه بۆی گێڕامەوە: ڕەسول الله ﷺ ڕشایەوە ڕۆژووەکەی شکاند. وتی: ڕاست دەکات، وە من ئاوم دەکرد بە دەستیدا دەست نوێژی گرت.

عَنْ مَعْدَانُ بْنُ طَلْحَةَ، أَنَّ أَبَا الدَّرْدَاءِ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَاءَ فَأَفْطَرَ، فَلَقِيتُ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي مَسْجِدِ دِمَشْقَ فَقُلْتُ: إِنَّ أَبَا الدَّرْدَاءِ حَدَّثَنِي أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَاءَ فَأَفْطَرَ. قَالَ: صَدَقَ، وَأَنَا صَبَبْتُ لَهُ وَضُوءَهُ ﷺ.

سنن أبي داود ا ٢٣٨١ سنن الترمذي ا ٨٧ سنن الدارمي ا ١٧٥٤ مسند أحمد ا ٢٧٥٠٢ المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٢٩٠ صحيح ابن خزيمة ا ١٩٥٦ سنن الدارقطني باب القبلة للصائم ا ٥

لای الترمذي لە جیاتی لەفظي « قَاءَ فَأَفْطَرَ » ئەم لەفظە هاتووە: « قَاءَ فَتَوَضَّأَ ».

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: هەرکەسێک بەڕۆژوو بوو خۆی ڕشاندەوە، ئەوە دەبێ قەزای بکاتەوە، وە هەرکەسێک ڕشایەوە، ئەوە قەزا کردنەوەی لەسەر نییە.

عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِاللَّه بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: مَنِ اسْتَقَاءَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَعَلَيْهِ الْقَضَاءُ، وَمَنْ ذَرَعَهُ الْقَيْءُ، فَلَيْسَ عَلَيْهِ الْقَضَاءُ .

الموطأ لمالک | ٦٩٥ کتاب الأم للشافعي | ٩١٨ مسند الشافعي | ٣٧٦ المصنف لعبدرزاق | ٧٦٨٣ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٧٧

**شافعي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم ئەثەرە دەڵێ: هەرکەسێک بەڕۆژوو بوو خۆی ڕشاندەوە ئەوە واجبە قەزای بکاتەوە، وە هەرکەسێک ڕشایەوە ئەوە قەزا کردنەوەی لەسەر نییە.

وَمَن تَقَيَّأَ وَهو صَائِمٌ وَجَبَ عليهِ القضاءُ، وَمَن ذَرَعه القَيءُ فلا قضاءَ عليه.

**إبن جريج** دەڵێ: بە عطاء ابن أبي رباح ــم وت: کەسێک خۆی دەڕشێنێتەوە بیری نییە یاخود نازانێ، وتی: درێژە بە ڕۆژووەکەی دەدات و قەزا کردنەوەی لەسەر نییە، وە وتی: ئەگەر ئینسان لە ڕەمەزاندا خۆی

بڕشێنێتەوە ئەوە ڕۆژووەکەی شکاوە، بەڵام ئەگەر نەیزانی سەهوی کرد ئەوە ناشکێ.

**إبن جريج** دەڵێ: عمرو بن دينار ـيش هەمان شتی دەوت.

عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ اسْتَقَاءَ إِنْسَانٌ نَاسِيًا أَوْ جَاهِلًا قَالَ: لَا يُبْدِلُ ذَالِكَ الْيَوْمَ، وَيُتِمُّهُ، قَالَ: وَقَالَ عَطَاءٌ: إِنِ اسْتَقَاءَ إِنْسَانٌ عَامِدًا فِي رَمَضَان فقد أفطرَ، وإن سَهَا فَلَمْ يُمطِرْ .

قَالَ ابْنُ جُرَيْجٍ: وَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٧٩

**حفص** و **حسن البصري** دەڵێن: هەرکەسێک خۆی بڕشێنێتەوە ئەوە ڕۆژووەکەی شکاوە، وە دەبێ قەزای بکاتەوە، وە هەرکەسێک ڕشایەوە ئەوە ڕۆژووەکەی نەشکاوە.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ. وَعَنْ حَفْصٍ، عَنِ الْحَسَنِ قَالَا: مَنِ اسْتَقَاءَ فَقَدْ أَفْطَرَ، وَعَلَيهِ الْقَضَاءُ، وَمَنْ ذَرَعَهُ قَيءٌ فَلَم يُفْطِرْ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٨٢

**حسن البصري** و **محمد بن سيرين** دەڵێن: ئەگەر ڕۆژووەوان ڕشایەوە ئەوە ڕۆژووەکەی نەشکاوە، بەڵام ئەگەر خۆی بڕشێنێتەوە ئەوە شکاوە.

حَدَّثَنَا أَزهَرُ السَّمان، عَنِ ابن عَونٍ، عَن الحَسنِ، وابن سيرينَ قالا: إذا ذَرعَ الصَّائمَ القَيء لم يُفطِر، وإذا تَقَيَّأ أُفطَرَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٧٩

**قاسم بن محمد** دەڵێ: ڕۆژووەوان ئەگەر ڕشایەوە قەزا کردنەوەی لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر خۆی بڕشێنێتەوە دەبێ قەزای بکاتەوە.

حَدَّثَنَا عبدالرحمن بن مهدي، عَنْ حماد بن سلمةَ، عَن حَبَّان السُّلمي، عن القاسم بن محمدٍ، قال: الصَّائمَ إذا ذَرَعَه القَيء فليسَ عليه القضاء، وإذا قاءَ مُتَعمِّدًا فعليه القضاء.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٨٢

**يعقوب بن قيس** دەڵێ: پرسیارم کرد لە سعيد بن جبير دەربارەی کەسێک بەڕۆژووە دەڕشێتەوە ئایا قەزای دەکاتەوە؟ وتی: نەخێر.

حَدَّثَنَا محمد بن عبيد، عَن يعقوب بن قيسٍ، قال: سألتُ سعيد بن جُبَيرٍ، عَنِ الرَّجُلِ يَسبِقُه القَيء وهو صائمٌ أَيَقضي ذالک اليوم؟ قال: لا.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٨٣

**علقمة بن قيس** دەڵێ: ئەگەر کەسێک بەڕۆژوو بوو خۆی ڕشاندەوە ئەوە دەبێ قەزای بکاتەوە، بەڵام ئەگەر ڕشایەوە ئەوە قەزا کردنەوەی لەسەر نییە.

حَدَّثَنَا أبو مُعاوية، عَنْ الأعمشِ، عَن إبراهيمَ، عَن عَلقَمَة، قال: إذا تَقَيَّأَ الرَّجُل وهو صائمٌ فعليه القضاء، وإن ذَرَعَه القَيء فليسَ عليه القضاء.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٨٦

**عامر الشعبي** دەڵێ: ئەگەر بە ئەنقەست خۆی ڕشاندەوە ئەوە ڕۆژووەکەی شکاوە.

حَدَّثَنَا أسباطُ بنُ محمدٍ، عَنْ مُطرِّفٍ، عَن عامرٍ، قال: إذا تَقَيَّأَ مُتَعمِّدًا فقد أفطَرَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٨٤

**مطرف** دەڵێ: پرسیار کرا لە عامر الشعبي دەربارەی ڕۆژووەوان بڕشێتەوە، وتی: ئەگەر ڕشایەوە ئەوە قەزا کردنەوەی لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە ئەوە ڕۆژووەکەی شکاوە.

حَدَّثَنَا ابن فُضَيلٍ، عَنْ مُطَرِّفٍ، قال: سُئِلَ عامرُ عَنِ الصَّائمِ يَقِيء، قال: إذا فَجَأَهُ القَيء فلا يقضي، وإن كان تَقَيَّأَ عمدًا فقد أفطَرَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٢٩٢

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی کەسێک لە ڕەمەزاندا دەڕشێتەوە بە ئەنقەست نەبووە؟ وتی: قەزا کردنەوەی ڕۆژووەکەی لەسەر نییە.

وە بە باوکم وت: ئەگەر بە ئەنقەست خۆی بڕشێنێتەوە؟ وتی: وای دەبینم ڕۆژووەکە قەزا بکاتەوە، بەڵام کەفارەتی لەسەر نییە.

سمعت أبي يقول في رَجل تقيأ لم يتعمد ذالک في رمضان؟ قال أبي: أرى أن لا يعيد صوم ذالک.

فقلتُ لأبي: فإن هو تَقيأ، تعمد ذالک؟ قال: أرى أن يعيد صوم ذالک، وليس عليه كفارة.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٦٨٨

**أبي داود** دەڵێ: پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەربارەی ڕشانەوە لە ڕەمەزاندا؟ وتی: ئەگەر بە ئەنقەست خۆی بڕشێنێنەوە ئەوە قەزای دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر ڕشایەوە ئەوە قەزا کردنەوەی لەسەر نییە.

سمعت أحمد بن سُئل عَمّن قاء في رمضان؟ قال: إن كانَ متعمدًا قضى، وَإن ذَرَعَه فليس عليه قضاء.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٢٣

**إسحاق بن منصور الكوسج** دەڵێ: بە أحمد بن حنبل ـم وت ئەگەر ڕۆژووەوان خۆی ڕشاندەوە؟ وتی: دەبێ قەزای بکاتەوە.

**إسحاق بن راهوية** دەڵێ: بەو جۆرەیە کە وتی.

قلت: فمن استقاء وهو صائم؟ قال: عليه القضاء.

قال إسحاق: كَما قال.

مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية الكوسج | ٧٨١



## الوصال ڕۆژووی چەند ڕۆژ و شەوێک بێ شکاندن

وصال ئەوەیە لە دوو ڕۆژ یان زیاتر بەسەر یەکەوە بەڕۆژوو بی، ئەمە عیبادەتێکی زۆر قورسە نەهیمان لێکراوە بەو جۆرە ڕۆژوو بگرین، بەڵام پێغەمبەر ﷺ گرتوویەتی.

أنس بن مالک رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « ڕۆژوو مەبەستنەوە بە ڕۆژی دوای خۆیەوە ». پێیان وت : تۆ بەو جۆرە بەڕۆژوو دەبی. فەرمووی: « من وەک ئێوە نیم، بە شەودا خواردن و خواردنەوەم پێشکەش دەکرێ ».

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: « لَا تُوَاصِلُوا ». قَالُوا: إِنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: « لَسْتُ كَأَحَدٍ مِنْكُمْ، إِنِّي أُطْعَمُ وَأُسْقَى. أَوْ: إِنِّي أَبِيتُ أُطْعَمُ وَأُسْقَى ».

صحيح البخاري ا ١٩٦١ صحيح مسلم ا ٢٥٧١ سنن الترمذي ا ٧٨٨ سنن الدارمي ا ١٧٣٠ مسند أحمد ا ١٢٧٧٦ المصنف لعبدرزاق ا ٧٨٩٣ صحيح ابن خزيمة ا ٢٠٦٩ كتاب الصيام للفريابي ا ٢٦

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای ئەهلی عیلم کەراهەتی هەیە الوصال لە ڕۆژوودا.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ كَرِهُوا الْوِصَالَ فِي الصِّيَامِ .

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ نەهی کرد لە الوصال. وتیان: تۆ بەو جۆرە بەڕۆژوو دەبی. فەرمووی: « من وەک ئێوە نیم، خواردن و خواردنەوەم پێشکەش دەکرێ ».

عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْوِصَالِ . قَالُوا: إِنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: « **إِنِّي لَسْتُ مِثْلَكُمْ، إِنِّي أُطْعَمُ وَأُسْقَى** ».

صحيح البخاري | ١٩٦٢ صحيح مسلم | ٢٥٦٣ سنن أبي داود | ٢٣٦٠ الموطأ لمالك | ٦٨٥ مسند أحمد | ٦١٢٥ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٧٧ كتاب الصيام للفريابي | ٢٠

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ نەهی کرد لە الوصال وەک ڕەحمەت و بەزەییەک بۆیان، وتیان: تۆ بەو جۆرە بەڕۆژوو دەبی.

فەرمووی: « من وەک ئێوە نیم، پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم پێشکەش دەکات ».

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْوِصَالِ، رَحْمَةً لَهُمْ، فَقَالُوا: إِنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: « إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ، إِنِّي يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ ».

صحيح البخاري | ١٩٦٤ صحيح مسلم | ٢٥٧٢ مسند أحمد | ٢٦٠٥٤ كتاب الصيام للفريابي | ٢٩

أبي هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ دوو جار فەرمووی: « ئاگادار بن لە الوصال ». وتیان: تۆ بەو جۆرە بەڕۆژوو دەبی. فەرمووی: « من بە شەودا دەمێنمەوە پەروەردگارم خواردن و خواردنەوەم پێشکەش دەکات، تەکلیفی عەمەلێک لە خۆتان بکەن کە توانایتان هەبێ ».

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ هَمَّامٍ، أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « إِيَّاكُمْ وَالْوِصَالَ ». مَرَّتَيْنِ، قِيلَ: إِنَّكَ تُوَاصِلُ. قَالَ: « إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ، فَاكْلَفُوا مِنَ الْعَمَلِ مَا تُطِيقُونَ ».

صحيح البخاري | ١٩٦٦ صحيح مسلم | ٢٥٦٧ الموطأ لمالك | ٦٨٦ سنن الدارمي | ١٧٢٩ مسند أحمد | ٨١٨١ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٩٢ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٨٥ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٦٨ كتاب الصيام للفريابي | ١٧

**أبو سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « ڕۆژوو مەبەستنەوە بەڕۆژووەوە، هەریەکێک لە ئێوە ویستی وابکات ئەوە با هەتا بەرەبەیان ئەنجامی بدات ». وتیان: تۆ بەو جۆرە بەڕۆژوو دەبی. فەرمووی: « من وەک ئێوە نیم، من کە ئەمێنمەوە بە شەو خواردن و خواردنەوەم پێشکەش دەکرێ ».

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ، يَقُولُ: « **لَا تُوَاصِلُوا، فَأَيُّكُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يُوَاصِلَ فَلْيُوَاصِلْ حَتَّى السَّحَرِ** ». قَالُوا: فَإِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: « **إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ ، إِنِّي أَبِيتُ لِي مُطْعِمٌ يُطْعِمُنِي، وَسَاقٍ يَسْقِينِ** ».

صحيح البخاري | ١٩٦٣ سنن أبي داود | ٢٣٦١ سنن الدارمي | ١٧٣١ مسند أحمد | ١١٠٥٥

أبي هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ نەهی کرد لە الوصال، پیاوێک لە موسڵمانەکان پێی وت: ئەی ڕەسولی الله تۆ بەو جۆرە بەڕۆژوو دەبی. فەرمووی: « کێ لە ئێوە وەک منە؟ من کە شەوان دەمێنمەوە پەروەردگار خواردن و خواردنەوەم پێشکەش دەکات ». کاتێک ئینکاریان کرد لەوەی واز بهێنن لە وصال، ڕەسول الله ﷺ وصالی پێکردن ڕۆژێک پاشان ڕۆژێکی تر لە دوای، پاشان مانگیان بینی، فەرمووی: « ئەگەر مانگ نەبینرایە، ئەوە بۆتانم زیاد دەکرد ». ئەمە وەک سزادانیان پێی کردن کە ئینکارییان کرد لە وازهێنان لە وصال.

عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: حَدَّثَنِي أَبُو سَلَمَةَ بْنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنِ الْوِصَالِ فِي الصَّوْمِ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: إِنَّكَ تُوَاصِلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: « وَأَيُّكُمْ مِثْلِي؟ إِنِّي أَبِيتُ يُطْعِمُنِي رَبِّي وَيَسْقِينِ ». فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلَالَ فَقَالَ: « لَوْ تَأَخَّرَ لَزِدْتُكُمْ ». كَالتَّنْكِيلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا.

صحيح البخاري | ١٩٦٥ صحيح مسلم | ٢٥٦٦ سنن الدارمي | ١٧٣٢ مسند أحمد | ٧٧٨٦ مسند الحميدي | ١٠٣٩

## ئەو کەسەی دەمرێ و ڕۆژوو قەرزارە

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێک مرد ڕۆژوو قەرزار بێ، ئەوە دەبێ کەسەکانی ڕۆژووەکەی بۆ بگرنەوە.

عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: « **مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ** ».

صحيح البخاري | ١٩٥٢ صحيح مسلم | ٢٦٩٢ سنن أبي داود | ٢٤٠٠ مسند أحمد | ٢٤٤٠١ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٥٢ سنن الدارقطني باب القبلة للصائم | ٧٩

**أبو داود** دوای ڕیوایەت کردنی حدیثەکە دەڵێ: ئەمە بۆ ڕۆژووی نەزرە، وە ئەمە قەولی أحمد بن حنبل ـه.

قَالَ أَبُو دَاوُدَ: هَذَا فِي النَّذْرِ، وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ بْنِ حَنْبَلٍ.

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئافرەتێک هاتە خزمەت ڕەسول الله ﷺ وتی: ئەی ڕەسوی الله، دایکم مردووە ڕۆژووی مانگێک قەرزارە، فەرمووی « سەیرکە ئەگەر دایکت قەرزار بووایە، تۆ قەرزەکەت

دەدایەوە؟ ». وتی: بەڵێ. فەرمووی: « دەی قەرزی الله لە پێشترە بە دانەوەی ».

عَنْ عِيسَى بْنُ يُونُسَ، حَدَّثَنَا الْأَعْمَشُ، عَنْ مُسْلِمٍ الْبَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ امْرَأَةً أَتَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَقَالَتْ: إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، فَقَالَ: « أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَيْهَا دَيْنٌ، أَكُنْتِ تَقْضِينَهُ؟ ». قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: « فَدَيْنُ اللهِ أَحَقُّ بِالْقَضَاءِ ».

صحيح مسلم | ٢٦٩٣

عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەڵێ: پیاوێک هاتە خزمەتی ڕەسول الله ﷺ وتی: ئەی ڕەسولی الله، دایکم مردووە ڕۆژووی مانگێک قەرزارە، ڕۆژووەکەی بۆ بگرمەوە؟ فەرمووی: « ئەگەر دایکت قەرزار بووایە، قەرزەکەت بۆ دەدایەوە؟ ». وتی: بەڵێ. فەرمووی: « دەی قەرزی الله لە پێشترە بە دانەوەی ».

حَدَّثَنَا زَائِدَةُ، عَنِ الْأَعْمَشِ، عَنْ مُسْلِمٍ الْبَطِينِ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ، أَفَأَقْضِيهِ عَنْهَا؟ قَالَ: « لَوْ كَانَ عَلَى

أُمِّكَ دَيْنٌ، أَكُنْتَ قَاضِيَهُ عَنْهَا؟ ». قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: « فَدَيْنُ اللَّهِ أَحَقُّ أَنْ يُقْضَى ».

صحيح البخاري | ١٩٥٣ صحيح مسلم | ٢٦٩٤ سنن أبي داود | ٣٣١٠ سنن النسائي | ٣٨١٦ سنن ابن ماجه | ١٧٥٨ سنن الدارمي | ١٧٩٤ مسند أحمد | ٢٣٣٦ مسند إسحاق بن راهوية | ٩١٢ صحيح ابن خزيمة | ١٩٥٣ سنن الدارقطني باب القبلة للصائم | ٨٤

**الترمذي** لە ژێر بابی ٣٢- باب ما جاء في الكفارة، حديثي ژمارە «٧٢٧» دەڵێ: ئەهلی عیلم لەم بابەدا خیلاف هەیە لە نێوانیاندا هەندێکیان دەڵێن: ڕۆژوو لەبری مردوو دەگیرێ. ئەمە قەولی أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهوية ـیە دەڵێن: ئەگەر مردووەکە ڕۆژووی نەزری لەسەر بوو ئەوە ڕۆژووەکەی بۆ دەگیرێتەوە، وە ئەگەر ڕۆژووی ڕەمەزان بوو ئەوە فیدیەی دەدرێ. وە مالک و سفيان الثوري و شافعي دەڵێن: هیچ کەسێک لەبری کەسێکی تر ڕۆژوو ناگرێ.

وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي هَذَا الْبَابِ فَقَالَ بَعْضُهُمْ: يُصَامُ عَنِ الْمَيِّتِ. وَبِهِ يَقُولُ أَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ قَالاَ: إِذَا كَانَ عَلَى الْمَيِّتِ نَذْرُ صِيَامٍ يَصُومُ عَنْهُ، وَإِذَا

كَانَ عَلَيْهِ قَضَاءُ رَمَضَانَ أَطْعَمَ عَنْهُ. وَقَالَ مَالِكٌ وَسُفْيَانُ وَالشَّافِعِيُّ: لَا يَصُومُ أَحَدٌ عَنْ أَحَدٍ.

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئافرەتێک هاتە خزمەت ڕەسول الله ﷺ وتی: ئەی ڕەسولی الله، دایکم مردووە ڕۆژووی نەزر قەرزارە، ڕۆژووەکەی بۆ بگرم؟ فەرمووی « سەیرکە ئەگەر دایکت قەرزار بووایە، تۆ قەرزەکەت بدایەتەوە جێگای ئەوەی ئەوی دەگرتەوە؟ ». وتی: بەڵێ. فەرمووی: « کەواتە ڕۆژووەکە بگرەوە بۆ دایکت ».

عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِي أُنَيْسَةَ، حَدَّثَنَا الْحَكَمُ بْنُ عُتَيْبَةَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّ أُمِّي مَاتَتْ وَعَلَيْهَا صَوْمُ نَذْرٍ، أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟ قَالَ: « **أَرَأَيْتِ لَوْ كَانَ عَلَى أُمِّكِ دَيْنٌ فَقَضَيْتِيهِ، أَكَانَ يُؤَدِّي ذَالِكِ عَنْهَا؟** ». قَالَتْ: نَعَمْ. قَالَ: « **فَصُومِي عَنْ أُمِّكِ** ».

صحيح مسلم | ٢٦٩٦ مسند أحمد | ١٨٦١

**حسن البصري** دەڵێ: ئەگەر سی کەس لەجێی ئەو هەرکەسە ڕۆژێکی گرتەوە ئەوە جائزە.

وَقَالَ الْحَسَنُ: إِنْ صَامَ عَنْهُ ثَلَاثُونَ رَجُلًا يَوْمًا وَاحِدًا جَازَ.

صحيح البخاري ٤٢- باب من مات وعليه صوم.



# ڕۆژووی کەسانی پیر و نەخۆشی درێژ خایەن لەگەڵ ئافرەتانی حامیلە و شیردەر

سلمة بن الأكوع رضي الله عنه دەڵێ: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ﴾. هەرکەسێک ویستبای ڕۆژووی نەدەگرت فیدیەی دەدا، هەتا ئایەتی دوای خۆی دابەزی نەسخی کردەوە.

عَنْ يَزِيدَ مَوْلَى سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ عَنْ سَلَمَةَ، قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. كَانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ، حَتَّى نَزَلَتِ الْآيَةُ الَّتِي بَعْدَهَا، فَنَسَخَتْهَا.

صحيح البخاري | ٤٥٠٧ صحيح مسلم | ٢٦٨٥ سنن أبي داود | ٢٣١٥ سنن الترمذي | ٨٠٩ سنن النسائي | ٢٣١٦ سنن الدارمي | ١٧٦٠

سلمة بن الأكوع رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لەسەردەمی ڕەسول الله ﷺ هەرکەسێک ویستبای بەڕۆژوو دەبوو، هەرکەسیش ویستبای بەڕۆژوو نەدەبوو، فیدیەی دەدا بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾.

عَنْ يَزِيدَ مَوْلَى سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ، عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الْأَكْوَعِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ أَنَّهُ قَالَ: كُنَّا فِي رَمَضَانَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ مَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ، فَافْتَدَى بِطَعَامِ مِسْكِينٍ حَتَّى أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾.

صحيح مسلم | ٢٦٨٦ تفسير الطبري | **(٦٢٥/٣)**

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما ئەو ئایەتەی خوێندەوە: فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ. وتی: نەسخ بووەتەوە.

عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ قَرَأَ: فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ. قَالَ : هِيَ مَنْسُوخَةٌ.

صحيح البخاري | ٤٥٠٦ تفسير الطبري | **(٦١٨/٣)**

حَدَّثنا كُرَيب، حَدَّثَنَا ابن إدريس، قال: سمعتُ الأعمَش، عَن إبراهيم، عَن عَلقَمة، في قوله: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. قال: نسختها: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾.

تفسير الطبري | **(٦١٩/٣)**

**عامر الشعبي** دەڵێ: کاتێک ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. پیاو هەبوو بەڕۆژوو نەدەبوو فیدیەی دەدا بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک، پاشان ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾. ئیتر ڕوخصە بەس نەخۆش و موسافری دەگرتەوە.

حَدَّثَنَا الوليد بن شُجاع أبو هَمام، قال: حَدَّثَنَا علي بن مُسهَر، عَن عاصِم، عَنِ الشّعبي، قال: نَزَلت هذه الآية: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. كانَ الرّجُل يُفطِر فَيَتصدَّق عَن كُلّ يومٍ على مسكينٍ طعامًا، ثُمّ نَزلت هذه الآية: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾. فلم تَنزِل الرُّخصةُ إلاّ للمريض، والمُسافر.

تفسير الطبري | **(٦٢٠/٣)**

**إبن أبي ليلى** دەڵێ: ڕەمەزان بوو چووم بۆ لای عطاء ابن أبي رباح سەیرم کرد نان دەخوات، وتی: من کەسێکی پیرم، ئایەتی ڕۆژوو کاتێک

دابەزی هەرکەسێک ویستبای بەڕۆژوو دەبوو، هەرکەسیش ویستبای بەڕۆژوو نەدەبوو، فیدیەی دەدا خواردنی هەژارێک، هەتا ئەم ئایەتە دابەزی: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾. ڕۆژووی واجب کرد لەسەر هەموو کەسێک بێجگە لە نەخۆش و موسافر، یاخود کەسێکی پیری وەک من.

حَدَّثَنَا هَنّاد، قال: حَدَّثَنَا وَكيع، عَن ابن أبي ليلى، قال: دَخلتُ على عطاءٍ وَهوَ يأكُل في شهر رمضان، فقال: إني شَيخٌ كبيرٌ، إنّ الصّومَ نَزَلَ فكانَ مَن شاءَ صام وَمَن شاءَ أفطَر، وَأَطعَمَ مِسكينًا، حتى نَزَلت: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾. فَوَجَبَ الصّوم على كُلِّ أحدٍ إلا مريضًا، أو مُسافرًا، أو شيخًا كبيرًا مِثلي يفتدي.

تفسير الطبري | **(٦٢٢/٣)**

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: قەولی الله ﷻ: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. ئەم ئایەتەی دوای خۆی نەسخی کردەوە: ﴿ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ .

حَدَّثَنَا هنّاد، قال: حَدَّثَنَا علي بن مُسهرٍ، عَنِ الأعمش، عَن إبراهيم في قوله: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. قال: نسختها الآية التي بعدها: ﴿ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾.

تفسير الطبري | **(٦٢٧/٣)**

**عكرمة** دەڵێ: ئینسانی پیر و بە تەمەن ڕوخصەیان بۆ هەبوو ڕۆژوو نەگرن و فیدیەی بدەن لەبەر قەولی الله ﷻ: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. پاشان نەسخ بوویەوە بەم ئایەتە: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾. ڕوخصەکە نەسخ بوویەوە بۆ پیر و بە تەمەن ئەگەر توانایان هەبێ ڕۆژوو بگرن، بەڵام بۆ ئافرەتی حامله و شیردەر ڕوخصەیان بۆ هەبوو ڕۆژوو نەگرن و فیدیەی بدەن.

حَدَّثَنَا محمد بن بشار، قال: حَدَّثَنَا مُعاذ بن هِشام، قال: حَدَّثَنِي أَبي، عَن قتادَة، عَن عِكرمة، قال: كانَ الشيخ وَالعجوز لهُما الرُخصة أن يُفطرا وَيُطعِما بقوله: ﴿ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾. قال: فكانَت لهمُ الرُّخصة، ثُمّ نُسِخَت بهذه الآية: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ

فَلْيَصُمْهُ ﴾. فنُسِخت الرُخصة عَنِ الشيخ وَالعجوز إذا كانَا يُطيقانِ الصّوم، وَبَقِيَت للحاملِ وَالْمُرضع أن يُفطرا وَيُطعِما.

تفسير الطبري | **(٦٣٢/٣)**

**ثابت البناني** دەڵێ: کاتێک أنس بن مالک رضي الله عنه پیر بوو توانای نەما ڕۆژوو بگرێ نەیدەگرت فیدیەی دەدا.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ ثَابِتٍ الْبُنَانِيِّ، قَالَ: كَبُرَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ حَتَّى كَانَ لَا يُطِيقُ الصِّيَامَ، فَكَانَ يُفْطِرُ وَيُطْعِمُ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٧٠٣

**عكرمة** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەیوت: ئەو ئایەتە نەسخ نەبووەتەوە، بەم جۆرە دەیخوێندەوە: ﴿ يُطَوَّقُونَهُ ﴾. دەیوت: ئەمە بۆ پیرێکە تەکلیفی ڕۆژووی لەسەرە، بەڵام ناتوانێ بیگرێ، ئەمە ڕۆژوو ناگرێ فیدەیەی دەدات.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، قَالَ: سَمِعْتُ عِكْرِمَةَ يُحَدِّثُ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهَا لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ، وَكَانَ يَقْرَؤُهَا: ﴿ يُطَوَّقُونَهُ ﴾. هِيَ فِي الشَّيْخِ الَّذِي كُلِّفَ الصِّيَامَ، وَلَا يُطِيقُهُ، فَيُفْطِرُ وَيُطْعِمُ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٧٠٧ سنن الدارقطني باب طلوع الشمس بعد الإفطار | ١٣

**عطاء ابن أبي رباح** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. وتی: نەسخ نەبووەتەوە، ئەمە بۆ ژن و پیاوی پیرە کە ناتوانن بەڕۆژوو بن، فیدیەی دەدەن بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک.

حَدَّثَنَا زَكَرِيَّاءُ بْنُ إِسْحَاقَ، حَدَّثَنَا عَمْرُو بْنُ دِينَارٍ، عَنْ عَطَاءٍ ، سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقْرَأُ: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ، هُوَ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ، وَالْمَرْأَةُ الْكَبِيرَةُ لَا يَسْتَطِيعَانِ أَنْ يَصُومَا، فَيُطْعِمَانِ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا.

رواه البخاري | ٤٥٠٥ سنن الدارقطني باب طلوع الشمس بعد الإفطار | ٧

**مجاهد** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما بەم جۆرە دەیخوێندەوە: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطَوَّقُونَهُ ﴾. دەیوت: ئەمە بۆ پیر و بە تەمەنە ناتوانێ بەڕۆژوو بێ، فیدیەی دەدات بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک، نیو صاع گەنم.

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ مَنْصور، عَنْ مُجَاهِدٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّهُ كَانَ يَقْرَؤُهَا: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطَوَّقُونَهُ ﴾. وَيَقُولُ: هُوَ الشَّيْخُ الْكَبِيرُ الَّذِي لَا يَسْتَطِيعُ الصِّيَامَ، فَيُفْطِرُ وَيُطْعِمُ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، نِصف صَاعٍ مِنْ حِنْطَةٍ.

المصنف لعبدرزاق ا ٧٧٠٨ سنن الدارقطني باب طلوع الشمس بعد الإفطار ا ١٢

**عكرمة** دەڵێ: إبن عباس رضي الله عنهما وتی: ئەو ئایەتە حوكمەكەی سابتە بۆ ئافرەتی حامیلە و شیردەر.

حَدَّثَنَا مُوسَى بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثَنَا أَبَانُ، حَدَّثَنَا قَتَادَةُ، أَنَّ عِكْرِمَةَ حَدَّثَهُ، أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أُثْبِتَتْ لِلْحُبْلَى وَالْمُرْضِعِ.

سنن أبي داود ا ٢٣١٧

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەربارەی ئەم ئایەتە: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. دەڵێ: ئەمە ڕوخصە بوو بۆ ژن و پیاوی پیر، کە دەیانتوانی ڕۆژوو بگرن، هەروەها ئافرەتی حاملە شیردەر ئەگەر ترسیان هەبێ. أبو داود دەڵێ: واتە ئەگەر ترسیان هەبوو لە منداڵەکانیان، ئەوە ڕۆژوو ناگرن و فیدیەی دەدەن.

عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. قَالَ: كَانَتْ رُخْصَةً لِلشَّيْخِ الْكَبِيرِ وَالْمَرْأَةِ الْكَبِيرَةِ، وَهُمَا يُطِيقَانِ الصِّيَامَ، أَنْ يُفْطِرَا وَيُطْعِمَا مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَالْحُبْلَى وَالْمُرْضِعُ إِذَا خَافَتَا. قَالَ أَبُو دَاوُدَ: يَعْنِي عَلَى أَوْلَادِهِمَا، أَفْطَرَتَا وَأَطْعَمَتَا.

سنن أبي داود | ٢٣١٨ تفسير الطبري | **(٣/٦٣٠)**

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕوخصەت دراوە بە ژن و پیاوی پیر و بە تەمەن کە توانای ڕۆژوو گرتنیشیان هەبوو، ئەگەر ویستیان لێ بووایە نەیگرن و فیدیەی بدەن، پاشان نەسخ بوویەوە، الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا

أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾. سابت بووە بۆ ژن و پیاوی پیر، کە نەتوانن بەڕۆژوو بن فیدیەی بدەن، وە بۆ ئافرەتی حامیلە و شیردەر ئەگەر ترسیان هەبوو ئەوە فیدیەی دەدەن بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک، وە قەزا کردنەوەیان لەسەر نییە.

حَدَّثنَا أبو سعيد، حَدَّثَنَا سعيد بن يحيى بن سعيد القطان، حَدَّثَنَا محمد بن بشر، حَدَّثنَا سعيد، عَن عُروة، عَن سعيد بن جُبير، أنّ ابن عباس رضي الله عنهما، قال: رخص للشيخ الكبير وَالعجوز الكبيرة وَهُما يطيقان الصّوم، إن شاءا أطعما وَلم يصوما، ثُمّ نسخت بعد ذالک، فقال الله: ﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾.وَثبَتَ للشيخ الكبير وَالعجوز الكبيرة، إذا كانا لا يطيقان الصّوم، أن يطعما، وَللحبلى وَالمُرضع إذا خافتا أفطرتا وأطعما مكان يوم مسكينًا، وَلا قضاء عليهما.

تفسير ابن أبي حاتم | **(٦٨٢/٢)**

**سعيد بن جبير** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دایکی یەکێک لە منداڵەکانی بینی حامیلە بوو یاخود شیردەر، وتی: تۆ لەوانەی کە

ناتوانن بیگرن، لەسەرتە فیدیەی بدەی بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک، وە قەزا کردنەوەت لەسەر نییە.

حَدَّثنا هنّاد، حَدَّثنا عَبدَة، عَن سعيد، عَن قتادة، عَن عزرة، عَن سعيد بن جُبَير، عَنِ ابن عباسٍ رضي الله عنهما، أنّه رأى أُمٍّ وَلَد له حاملاً أو مُرضعًا، فقال: أنتِ بمنزلةِ الذي لا يطيقه، عَلَيكِ أن تُطعِمي مَكانُ كُلّ يومٍ مسكينًا وَلا قضاءَ عَلَيكَ.

تفسير الطبري | **(٦٣٧/٣)** سنن الدارقطني باب طلوع الشمس بعد الإفطار | ٨

ئەم ئەثەرەی سەرەوە عبدالرزاق ـیش ڕیوایەتی کردووە، هێندەی جیاوازە لە کۆتاییەکەیدا دەڵێ: فیدیەی بدە بۆ هەر ڕۆژێک نیو صاع لە گەنم.

عَنِ ابْنِ التَّيْمِيِّ، عَنْ أَبِيه، عَنْ قَتَادَةَ، عَنْ سَعِيد بْن جُبَيْرٍ، عَن ابْن عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما، أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ وَلِيدَةً لَهُ حُبْلَى أَنْ تُفْطِرَ لَهُ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ، وَقَالَ: أَنْت بِمَنْزِلَةِ الْكَبِيرِ لَا يُطِيقُ الصيَامَ، فَأَفْطِرِي، وَأَطْعِمِي عَنْ كُلِّ يَوْمٍ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ حِنْطَةٍ.

المصنف لعبدرزاق | ٧٧٠٠

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئافرەتی حامیلە و شیردەر لە ڕەمەزاندا ڕۆژوو ناگرن، قەزای دەکەنەوە فیدیەی نادەن.

عَنِ الثوْرِيِّ، وَعَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ وَالْمُرْضِعُ فِي رَمَضَانَ، وَتَقْضِيَانِ صِيامًا وَلَا تُطْعِمَانِ.

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٩٧

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما دایکی یەکێک لە منداڵەکانی بینی حامیلە بوو یاخود شیردەر وتی: تۆ لەوانەی کە ناتوانن بیگرن، لەسەرتە فیدیەی بدەی، وە قەزا کردنەوەت لەسەر نییە.

حَدَّثَنَا أبو سعيد، حَدَّثَنَا سعيد بن يحيى بن سعيد القطان، حَدَّثَنَا محمد بن بشر، حَدَّثَنَا سعيد بن أبي عروبة، عن علي بن ثابت، عَن نافع، عَنِ ابنِ عمر رضي الله عنهما، أنّه قال لأُمِّ وَلده إمّا حامل وإمّا مُرضع: أنتِ بمنزلة الذين لا يُطيقونه، عَلَيك الطعام، وَلا قضاء عَلَيك.

تفسير ابن أبي حاتم | **(٦٨٣/٢)**

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ئافرەتی حامیلە ئەگەر لە ڕەمەزاندا ترسی هەبوو لەسەر نەفسی ئەوە ڕۆژوو ناگرێ فیدیەی دەدات، وە قەزا کردنەوەی لەسەر نییە.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: الْحَامِلُ إِذَا خَشِيَتْ عَلَى نَفْسِهَا فِي رَمَضَانَ تُفْطِرُ وَتُطْعِمُ، وَلَا قَضاءَ عَلَيْهَا .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٩٤

**نافع** دەڵێ: کچێکی عبدالله بن عمر رضي الله عنهما شووی کردبوو بە پیاوێک لە قورەیش، وە حامیلە بوو، ڕۆژێکی ڕەمەزان تووشی تینوویەتییەکی زۆر بوو، إبن عمر فەرمانی پێکرد ڕۆژووەکەی بشکێنێ فیدیەی بدات بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک.

حَدَّثنا أبو صالح، حَدَّثنا أبو مسعود، حَدَّثنا أبو أُسامة، عَن عبيدالله، عَنْ نَافِعٍ، قال: كانَت بنت لابْنِ عُمَرَ رَضيَ الله عَنهُما تَحتَ رَجُل مِن قريش وَكانت حاملًا، فَأَصَابَهَا عَطَشٌ فِي رَمَضَّان، فَأَمَرَهَا ابْنِ عُمَرَ أَن تُفْطِرَ وَتُطّعِمَ عَنْ كُلِ يَوْمٍ مسْكِيناً.

سنن الدارقطني باب طلوع الشمس بعد الإفطار | ١٥

**سعيد بن جبير** دەڵێ: ئافرەتی کە حامیلە کە لە مانگی لە دایک بوونیدایە ڕۆژوو ناگرێ، وە هەروەها ئافرەتی شیردەریش کە ترسی هەیە لە منداڵەکەی، فیدیەی دەدەن بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک، وە قەزاکردنەوەیان لەسەر نییە.

أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ الَّتِي فِي شَهْرِهَا، وَالْمُرْضِعُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا، تُفْطِرَانِ وَتُطْعِمَانِ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِمَا .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٨٧

**قتادة** دەڵێ: ئافرەتی حامیلە کە ترسی هەیە لەسەر منداڵەکەی ڕۆژوو ناگرێ، وە هەروەها ئافرەتی شیردەریش کە ترسی هەیە لەسەر منداڵەکەی، فیدیەی دەدەن بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک، وە قەزا کردنەوەیان لەسەر نییە.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، قَالَ: تُفْطِرُ الْحَامِلُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا، وَتُفْطِرُ الْمُرْضِعُ الَّتِي تَخَافُ عَلَى وَلَدِهَا، وَتُطْعِمُ كُلُّ وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا كُلَّ يَوْمٍ مِسْكِينًا، وَلَا قَضَاءَ عَلَيْهِمَا .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٨٩

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: ئافرەتێک هات بۆ لای علقمة وتی: من حاملیەم، وە توانای ڕۆژوو گرتنم هەیە، بەڵام مێردەکەم ڕێگریم لێ دەکات، علقمة پێی وت: گوێڕایەڵی پەروەردگات بکە، سەرپێچی مێردەکەت بکە.

عَنْ فُضَيْلٍ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى عَلْقَمَةَ فَقَالَتْ إِنِّي حُبْلَى، وإِنِّي أُطِيقُ الصِّيَامَ، وَإِنَّ زَوْجِي يَمْنَعُنِي، فَقَالَ لَهَا عَلْقَمَةُ: أَطِيعِي رَبَّكِ، وَاعْصِي زَوْجَكِ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٩٩

**حسن البصري** دەڵێ: ئافرەتی حاملە و شیردەر ڕۆژووەکەیان قەزا دەکەنەوە، حاڵیان وەک حاڵی نەخۆشە ڕۆژوو ناگرێ قەزای دەکاتەوە.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ، عَنِ الْحَسَنِ، قَالَ: تَقْضِيَانِهِ صِيَامًا، بِمَنْزِلَةِ الْمَرِيضِ يُفْطِرُ وَيَقْضِي، وَالْمُرْضِعُ كَذَلِكَ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٦٩٨

**شافعي** دەڵێ: ئافرەتی حاملە و شیردەر ئەگەر توانای ڕۆژوو گرتنیان هەبوو، وە ترسیان نەبوو لەسەر منداڵەکەیان ئەوە دەبێ بەڕۆژوو بن، وە ئەگەر ترسیان هەبوو لەسەر منداڵەکەیان ئەوە ڕۆژوو ناگرن، فیدیەی دەدەن بۆ هەر ڕۆژێک مودێک گەنم، ئەگەر ترسیان نەبوو ئەوە بەڕۆژوو

دەبن، وە هەرکات توانای ڕۆژوو گرتنیان نەبوو، ئەوە وەک نەخۆشی وایەڕۆژوو ناگرن و قەزای دەکەنەوە بە بێ فیدیە، فیدیە دان بە ئەڤەر دەبێ، وە لەبەرئەوەی ڕۆژوو نەگرتنیان لەبەر نەفسی خۆیان نەبووە، بەڵکو لەبەر غەیری خۆیان بووە، ئەمە جیاوازی نێوان ئەوان و نەخۆشە کە فیدیە نادات.

وە کەسی پیر و بە تەمەن کە توانای ڕۆژووی نییە، توانای فیدیەی هەیە ئەوە بۆ هەر ڕۆژێک مودێک لە گەنم دەبەخشێ، ئەمە خەبەرە لە هەندێک صەحابەی ڕەسول الله ـەوە ﷺ.

قال الشافعي: والحامِلُ والمُرضعُ إذا أَطاقتا الصَّوم، ولم تخافا على وَلَديهما لم تُفطِرا، فإن خافتا على وَلَديهما أفطَرَتا، وتصدقتا عَن كُل يوم بِمُدِّ حِنطَة، وصامَتا إذا أَمِنَتَا على وَلَدَيهما، وإن كانتا لا تقدران على الصَّوم، فهذا مِثل المَرَضِ أفطَرَتا وقَضَتا بِلا كَفارةٍ، إنَّما تكفِّران بالأثر، وبأنَّهما لم تفطرا لأنفسهما إنَّما أفطَرتا لغيرهما، فذالكَ فرقُ بينهما وبينَ المريض لا يكفر.

والشَّيخ الكبير الذي لا يُطيق الصَّوم، ويقدر على الكفارة، يتصدق عَن كُلِ يوم بِمُدّ حِنطةٍ، خَبَرًا عَن بعض أَصحابِ النَّبيّ ﷺ.

كتاب الأم للشافعي | **(٦٥٨/١)**

**عبيدالله بن يحيى** دەڵێ: يحيى بۆی گێڕامەوە لە مالک ـەوە پێی گەیشتووە عبدالله بن عمر رضي الله عنهما پرسیاری لێکراوە دەربارەی ئافرەتی حامیلە ئەگەر ترسی هەبوو لەسەر منداڵەکەی، وە ڕۆژوو گرتن لەسەری قورس بێ؟ وتی: ڕۆژووەکەی دەشکێنێ، وە فیدیەی دەدات بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک مودێک لە گەنم دەدات بە مودی ڕەسول الله ﷺ.

مالک دەڵێ: ئەهلی عیلم وای دەبینن دەبێ قەزای بکاتەوە، هەروەک چۆن الله ﷻ فەرموویەتی: ﴿ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾. وە پێیان وایە نەخۆشیەکە لە نەخۆشییەکان لەگەڵ مەترسی بوون لەسەر منداڵەکە.

وَحَدَّثَنِي، عَنْ مَالِكٍ: أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ عَبْدَاللَّه بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا سُئِلَ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَامِلِ إِذَا خَافَتْ عَلَى وَلَدِهَا، وَاشْتَدَّ عَلَيْهَا الصِّيَامُ؟ فَقَالَ: تُفْطِرُ، وَتُطْعِمُ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا مُدًّا مِنْ حِنْطَةٍ بِمُدِّ النَّبِيِّ ﷺ.

قَالَ مَالِكٌ: وَأَهْلُ الْعِلْمِ يَرَوْنَ عَلَيْهَا الْقَضَاءَ، كَمَا قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾. وَيَرَوْنَ ذَلِكَ مَرَضًا مِنَ الْأَمْرَاضِ مَعَ الْخَوْفِ عَلَى وَلَدِهَا .

الموطأ لمالک ا ٧٠٠

**الطبري** دەڵێ: وە لەپێشترینی ئەم قەولانە بە تەفسیری ئایەتەکە قەولی ئەوانەیە کە دەڵێن: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. نەسخ بووەتەوە بە قەولی اللە ﷻ: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾. لەبەرئەوەی پیتی بزوێن «هـ» لە قەولی اللە ﷻ: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ ﴾. لە باسی ڕۆژووە. واتاکەی: ئەوانەی دەتوانن ڕۆژوو بگرن فیدیە دەدەن خواردنی هەژارێک. ئەگەر ئەمە ئاوایە، هەموو ئەهلی ئیسلام یەک دەنگن لەسەر ئەوەی هەر کەسێک توانای هەبوو لەش ساغ بوو موسافریش نەبێ کە مانگی ڕەمەزان هات دروست نییە بۆی ڕۆژوو بشکێنێ، بەخواردن فیدیەیەکەی بدات بە هەژارێک، جا ئەمە زانراوە کە ئایەتە نەسخ بووەتەوە، ئەمە پاڵپشت کراوە بەو خەبەرانەی کە باسمان کردن لە معاذ بن جبل و عبداللە بن عمر و سلمة بن الأكوع، ئەوانە

دوای دابەزینی ئەم ئایەتە لەسەردەمی ڕەسول الله ﷺ لە مانگی ڕەمەزاندا ئیختیاریان هەبوو لە نێوان ئەوەی ڕۆژوو بگرن فیدیەیان لەسەر نییە، وە ڕۆژوو ناگرن فیدیەکەی دەدەن بۆ هەر ڕۆژێک خواردنی هەژارێک بەم جۆرەیان دەکرد هەتا ئایەتی: ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾. دابەزی ئەوکات ڕۆژوو فەڕز بوو لەسەریان، وە ئیختیار و فیدیە هەڵوەشایەوە.

وَأولى هذه الأقوال بتأويل الآيةِ قَولُ مَن قال: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾. مَنسُوخٌ بِقَول الله تَعالى ذِكرُه: ﴿ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾. لأَنَّ الهاءَ التي في قَوله: ﴿ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ ﴾. مِن ذِكر الصِّيامِ. معناه: وَعلى الذين يُطيقونَ الصِّيامَ فِديةٌ طعامُ مِسكينٍ. فإذا ذالكَ كذالكَ، وَكانَ الجميع مِن أَهل الإسلام مُجمَعين على أَنَّ مَن كانَ مُطيقًا مِن الرِّجالِ الأَصحاءِ المُقيمينَ غيرِ المُسافرين صوم شهر رمضان فغير جائز له الإفطار فيه، والافتداء مِنه بطعام مِسكين، كانَ معلومًا أَنَّ الآية منسوخة، هذا مع ما يُؤَيِّد هذا القَولَ مِنَ الأخبارِ التي ذَكرناها آنفًا عَن مُعاذِ بن جَبل، وَابنِ عُمَر، وَسَلَمَة بنِ الأكوَع، مِن أَنهم كانوا بعد نزول هذه الآية على عهد رسول الله ﷺ في شهر رمضانَ بالخِيَارِ بينَ صَومه

وَسقوطِ الفِدية عنهم، وَبين الإفطارِ والافتداءِ مِن إفطاره بإطعام مِسكينٍ لِكُل يوم وَأَنهم كانوا يفعلون ذالِكَ حتى نَزَلَت: ﴿ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ﴾. فأُلزموا فَرضَ صَومِهِ، وَبَطَلَ الخِيَارُ وَالفِديَة.

تفسير الطبري | **(٣/صـ : ٢٨٠)**



# ڕۆژووی منداڵان

ربیع بنت معوذ دەڵێ: ڕەسول اللە ﷺ بەیانی ئەو ڕۆژەی کە عاشوراء بوو پەیامی نارد بۆ گوندەکانی دەوروبەری مەدینە پێیانی فەموو: « هەرکەسێک لە ئێوە بەیانی هەستاوە خواردنی خواردووە ئەوە با دەست بگرێتەوە باقی ڕۆژەکەی هیچ نەخوات، هەرکەسێکیش هەستاوە بەڕۆژوو بووە ئەوە با درێژە بدات بە ڕۆژووەکەی ». دەڵێ: ئێمە بەڕۆژوو دەبووین وە بە منداڵەکانیشمان دەگرت، وە لە خوری یاریمان بۆ دروست دەکردن، ئەگەر یەکێکیان بگریایە داوای خواردنی بکردایە ئەو یارییەمان دەدایە هەتا مەشغوڵ ببێ بۆ ئەوەی درێژە بدات بە ڕۆژووەکەی.

عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتُ مُعَوِّذٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أَرْسَلَ النَّبِيُّ ﷺ غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ: « مَنْ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ، وَمَنْ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيَصُمْ ». قَالَتْ: فَكُنَّا نَصُومُهُ بَعْدُ وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا، وَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاهُ ذَاكَ حَتَّى يَكُونَ عِنْدَ الإِفْطَارِ.

صحيح البخاري | ١٩٦٠ صحيح مسلم | ٢٦٦٩ مسند أحمد | ٢٧٠٢٥

## ماچ کردن و موباشەرە کردنی خێزان لە ڕۆژی ڕەمەزاندا

عروة بن الزبير دەڵێ: عائشة رضي الله عنها وتی : ڕەسول الله ﷺ ماچی هەندێک لە خێزانەکانی دەکرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو. پاشان عائشة پێکەنی.

عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيُقَبِّلُ بَعْضَ أَزْوَاجِهِ وَهُوَ صَائِمٌ. ثُمَّ تَضْحَكُ.

صحيح البخاري | ١٩٢٨ صحيح مسلم | ٢٥٧٣ سنن الدارمي | ١٧٤٨ الموطأ لمالك | ٦٦٠ مسند أحمد | ٢٥٦٠٠ كتاب الأم للشافعي | ٩٢١ مسند الشافعي | ٣٧٩ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٨٠ مسند الحميدي | ١٩٩ تفسير الطبري | **(٧٣/٧)**

سفيان بن عيينة دەڵێ: بە عبدالرحمن بن قاسم ـم وت: بیستووتە لە باوکت ئەو حدیثە ڕیوایەت بکات لە عائشة ـوە کە ڕەسول ﷺ ماچی کردووە کاتێک بەڕۆژوو بووە؟ ماوەیەک بێدەنگ بوو، پاشان وتی: بەڵێ.

عَنْ سُفْيَانُ، قَالَ: قُلْتُ: لِعَبْدالرَّحْمَنِ بْنِ الْقَاسِمِ: أَسَمِعْتَ أَبَاكَ يُحَدِّثُ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ؟ فَسَكَتَ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَ: نَعَمْ.

صحيح مسلم | ٢٥٧٤ مسند أحمد | ٢٤١١٠ مسند الحميدي | ١٩٨ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٠٠

**قاسم** دەڵێ: عائشة رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ماچی دەکردم لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو، وە کێ هەیە لە ئێوە خۆی بپارێزێ وەک ئەوەی ڕەسول الله ﷺ داوێنی دەپاراست؟

عَنْ عُبَيْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُنِي وَهُوَ صَائِمٌ، وَأَيُّكُمْ يَمْلِكُ إِرْبَهُ كَمَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَمْلِكُ إِرْبَهُ؟

صحيح مسلم | ٢٥٧٥ سنن ابن ماجه | ١٦٨٤ مسند أحمد | ٢٤١٧٤

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ماچی دەکرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو، وە موباشەرە و تێکەڵی دەکرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو، بەڵام لە هەمووتان زیاتر داوێنی دەپاراست.

عَنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَلَكِنَّهُ أَمْلَكُكُمْ لِإِرْبِهِ.

صحيح البخاري | ١٩٢٧ صحيح مسلم | ٢٥٧٦ سنن أبي داود | ٢٣٨٢ سنن الترمذي | ٨٣٨ مسند أحمد | ٢٤١٥٤ كتاب الأم للشافعي | ٩٢٢ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٨١

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ موباشەرە و تێکەڵی لەگەڵ دەکردم، لە هەمووتان زیاتر داوێنی دەپاراست.

عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُبَاشِرُنِي وَهُوَ صَائِمٌ، وَكَانَ أَمْلَكَكُمْ لِإِرْبِهِ.

سنن الترمذي | ٧٣٧

**عروة بن الزبير** دەڵێ: عائشة رضي الله عنها بۆی گێڕامەوە کە ڕەسول الله ﷺ ماچی کردووە لەکاتێکدا بەڕۆژوو بووە.

عَنْ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ، أَنَّ عُرْوَةَ بْنَ الزُّبَيْرِ أَخْبَرَهُ، أَنَّ عَائِشَةَ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا أَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ.

صحيح مسلم | ٢٥٨١ سنن الدارمي | ١٧٤٩ مسند أحمد | ٢٦٣٩٢

**الأسود و مسروق** دەڵێن: هاتین بۆ لای عائشة رضي الله عنها پرسیاری لێ بکەین دەربارەی موباشەرە کردن بۆ ڕۆژووەوان، بەڵام شەرمان دەکرد، پێش ئەوەی لێی بپرسین هەستاینەوە جێمان هێشت، هەندێک ڕۆیشتین نازانین چەند بوو، پاشان وتمان: هاتین لێی بپرسین کەچی گەڕاینەوە پێش ئەوەی لێی بپرسین، ئیتر گەڕاینەوە بۆ لای، وتمان: ئەی دایکی ئیمانداران، ئێمە هاتووین پرسیارت لێ بکەین دەربارەی بابەتێک، بەڵام شەرمان کرد و هەستاینەوە، وتی: چییە؟ هەرچییەکتان دەوێ بپرسن. وتمان: ئایا ڕەسول الله ﷺ موباشەرە و تێکەڵی دەکرد کاتێک بەڕۆژوو بوو؟ وتی: بەڵێ وای دەکرد، بەڵام لە ئێوە زیاتر داوێنی دەپاراست.

عَنِ الْأَسْوَدِ، وَمَسْرُوقٍ، قَالَا: أَتَيْنَا عَائِشَةَ لِنَسْأَلَهَا عَنِ الْمُبَاشَرَةِ لِلصَّائِمِ فَاسْتَحْيَيْنَا، فَقُمْنَا قَبْلَ أَنْ نَسْأَلَهَا، فَمَشَيْنَا لَا أَدْرِي كَمْ. ثُمَّ قُلْنَا: جِئْنَا لِنَسْأَلَهَا عَنْ حَاجَةٍ، ثُمَّ نَرْجِعُ قَبْلَ أَنْ نَسْأَلَهَا فَرَجَعْنَا، فَقُلْنَا: يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، إِنَّا جِئْنَا لِنَسْأَلَكِ عَنْ شَيْءٍ فَاسْتَحْيَيْنَا فَقُمْنَا، فَقَالَتْ: مَا هُوَ؟ سَلَا عَمَّا بَدَا لَكُمَا. قُلْنَا: أَكَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، قَالَتْ: قَدْ كَانَ يَفْعَلُ ذَلِكَ، وَلَكِنَّهُ كَانَ أَمْلَكَ لِإِرْبِهِ مِنْكُمْ.

صحيح مسلم | ٢٥٧٩ سنن ابن ماجه | ١٦٨٧ مسند أحمد واللفظ له | ٢٥٨١٥ صحيح ابن خزيمة | ١٩٩٨

**حفصة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ماچی دەکرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو.

عَنْ شُتَيْرِ بْنِ شَكَلٍ، عَنْ حَفْصَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ.

صحيح مسلم | ٢٥٨٦ سنن ابن ماجه | ١٦٨٥ مسند أحمد | ٢٦٤٤٧ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٨٥

**عمر بن أبي سلمة** دەڵێ: پرسیارم کرد لە ڕەسول الله ﷺ ئایا کەسی ڕۆژووەوان دەتوانێ ماچی خێزانی بکات؟ فەرمووی: « ئەم پرسیارە لە أم سلمة بکە ». ئەویش پێی ڕاگەیاند کە ڕەسول الله ﷺ ماچی دەکرد. عمر بن أبي سلمة دەڵێ: وتم ئەی ڕەسولی الله، تۆ الله لێت خۆش بووە لە هەر شتێک پێشتر گەر کردبێتت یاخود پاشتر بیکەی، ڕەسول الله ﷺ پێی فەرموو: « ئەمما والله من لە هەمووتان زیاتر تەقوای اللهـم هەیە، وە لێشی دەترسم ».

عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ كَعْبٍ الْحِمْيَرِيِّ، عَنْ عُمَرَ بْنِ أَبِي سَلَمَةَ، أَنَّهُ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: أَيُقَبِّلُ الصَّائِمُ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **سَلْ هَذِهِ** ». لِأُمِّ سَلَمَةَ. فَأَخْبَرَتْهُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَصْنَعُ ذَالِكَ. فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **أَمَا وَاللهِ، إِنِّي لَأَتْقَاكُمْ لِلهِ، وَأَخْشَاكُمْ لَهُ** ».

صحيح مسلم | ٢٥٨٨ مسند أحمد | ٢٦٤٩٨

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ماچی دەکرد یاخود ماچی دەکردم لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو، وە کێ هەیە لە ئێوە بتوانێ وەک ڕەسول لله ﷺ داوێنی بپارێزێ؟

عَنْ عُبَيْدِاللَّهِ، قَالَ: سَمِعْتُ الْقَاسِمَ، يُحَدِّثُ عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُ -أَوْ يُقَبِّلُنِي- وَهُوَ صَائِمٌ، وَأَيُّكُمْ كَانَ أَمْلَكَ لِأَرَبِهِ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ؟

مسند أحمد | ٢٤١٧٤

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ موباشەرەی دەكرد لەكاتێكدا بەڕۆژوو بوو، لە نێوان خۆی و ئەو قوماشێكی دادەنا. واتە: داوێن.

عَنْ عَائِشَةُ بِنْتُ طَلْحَةَ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ، ثُمَّ يَجْعَلُ بَيْنَهُ وَبَيْنَهَا ثَوْبًا. يَعْنِي الْفَرْجَ.

مسند أحمد | ٢٤٣١٤

**أبي النضر** دەڵێ: عائشة بنت طلحة بۆی گێڕامەوە كە لای عائشة ـ ی خێزانی ڕەسول الله ﷺ بووە، مێردەكەی كە عبدالله بن عبدالرحمن بن أبي بكر الصديق ـ هاتووە بۆ لای بەڕۆژووش بووە، عائشة پێی وت: چی ڕێگرە لێت كە نزیک بكەویتەوە لە خێزانت ماچی بكەیت و یاری لەگەڵ بكەی. وتی: ماچی بكەم من بەڕۆژووم؟ وتی: بەڵێ.

عَنْ أَبِي النَّضْرِ مَوْلَى عُمَرَ بْنِ عُبَيْدِاللَّه، أَنَّ عَائِشَةَ بِنْتَ طَلْحَةَ أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهَا كَانَتْ عِنْدَ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا زَوْجُهَا هُنَالِكَ، وَهُوَ عَبْدُاللَّه بْنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ، وَهُوَ صَائِمٌ، فَقَالَتْ لَهُ

عَائِشَةُ: مَا يمْنَعُك أَنْ تدْنُوَ مِنْ أَهْلِك، فَتُقبِّلَهَا، وَتُلَاعِبَهَا. فقَالَ: أُقَبِّلُهَا وَأَنَا صَائِمٌ؟ قَالَتْ: نَعَمْ.

الموطأ لمالک | ٦٦٢ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٤٣

**مسروق** دەڵێ: پرسیارم کرد لە عائشة رضي الله عنها، چی حەڵاڵە بۆ پیاو لە خێزانەکەی کاتێک بەڕۆژووە؟ وتی: هەموو شتێک بێجگە لە جیماع.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ أَبِي قِلَابَةَ، عَنْ مَسْرُوقٍ، قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، مَا يَحِلُّ لِلرَّجُلِ مِنِ امْرَأَتِهِ صَائِمًا؟ قَالَتْ: كُلُّ شَيءٍ إِلَّا الْجِمَاعَ.

المصنف لعبدرزاق | ٧٥٧١

**يحيى بن سعيد** دەڵێ: عاتكة بنت زيد بن عمرو بن نفيل خێزانی عمر بن الخطاب رضي الله عنه، سەری عمر بن الخطاب ـی ماچ دەکرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو، نەهی لێ نەدەکرد.

عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ، أَنَّ عَاتِكَةَ بِنْتَ زَيْدِ بْنِ عَمْرِو بْنِ نُفَيْلٍ امْرَأَةَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ كَانَتْ تُقَبِّلُ رَأْسَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَهُوَ صَائِمٌ، فَلَا يَنْهَاهَا .

الموطأ لمالک | ٦٦١ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٦١ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٩٧

**زيد بن أسلم** دەڵێ: أبا هريرة و سعد بن أبي وقاص رضي الله عنهما ڕێگەیان دەدا ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان.

عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ وَسَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ رَضِيَ اللهُ عنهما كَانَا يُرَخِّصَانِ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ .

الموطأ لمالک | ٦٦٣

**أبي ميسرة** دەڵێ: عبدالله بن مسعود رضي الله عنه موباشەرەی خێزانی دەکرد لە نیوەی ڕۆژدا لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو.

حَدَّثَنَا عليٌّ بنُ مسهر وَوَكيعُ، عَن زكريَّا، عن الشَّعبيِّ، عَن أبي مَيسَرةَ، عَن ابنِ مسعودٍ رَضيَ اللهُ عَنهُ، قال: كان يُباشِرُ امرأته بِنِصفِ النَّهارِ وهو صَائم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٢٠ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٧٤

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ماچی دەکرد لە مانگی ڕۆژوودا.

عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُقَبِّلُ فِي شَهْرِ الصَّوْمِ.

صحيح مسلم | ٢٥٨٣ سنن أبي داود | ٢٣٨٤ سنن الترمذي | ٧٣٦ سنن ابن ماجه | ١٦٨٣ مسند أحمد | ٢٤٩٨٩ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٧٩ سنن الدارقطني باب قبلة للصائم | ١

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: خیلاف هەیە لە نێوان ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، وە غەیری ئەوانیش دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان، هەندێک لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ ڕێیان داوە ماچ کردن بۆ کەسی بە تەمەن، ڕێیان نەداوە بۆگەنجان ترسیان هەبووە ڕۆژووەکەی سەلامەت نەبێ، وە موباشەرە کردن بە لایانەوە توندترە، وە هەندێک ئەهلی عیلم وتوویانە: ماچ کردن ڕۆژوو ناشکێنێ، بەڵام پاداشتەکەی کەم دەکاتەوە. وە وای دەبینن ئەگەر ڕۆژووەوان توانی نەفسی خۆی کۆنترۆڵ بکات ئەوە با ماچ بکات، وە ئەگەر ئەمین نەبوو

لە نەفسی ماچ کردن تەرک بکات بۆ ئەوەی ڕۆژووەکەی سەلامەت بێ، ئەمە قەولی سفيان الثوري و شافعي ـيە.

وَاخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ، وَغَيْرِهِمْ فِي الْقُبْلَةِ لِلصَّائِمِ، فَرَخَّصَ بَعْضُ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْقُبْلَةِ لِلشَّيْخِ، وَلَمْ يُرَخِّصُوا لِلشَّابِّ مَخَافَةَ أَنْ لَا يَسْلَمَ لَهُ صَوْمُهُ، وَالْمُبَاشَرَةُ عِنْدَهُمْ أَشَدُّ وَقَدْ قَالَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ: الْقُبْلَةُ تُنْقِصُ الْأَجْرَ، وَلَا تُفْطِرُ الصَّائِمَ. وَرَأَوْا أَنَّ لِلصَّائِمِ إِذَا مَلَكَ نَفْسَهُ أَنْ يُقَبِّلَ، وَإِذَا لَمْ يَأْمَنْ عَلَى نَفْسِهِ تَرَكَ الْقُبْلَةَ لِيَسْلَمَ لَهُ صَوْمُهُ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَالشَّافِعِيِّ.

**سعيد بن المسيب** دەڵێ: عمر بن الخطاب رضي الله عنه نەهی دەکرد لە ماچ کردنی ڕۆژووەوان، پێی وترا: ڕەسول الله ﷺ ماچی دەکرد لەکاتێکدا بەڕۆژوو بوو، وتی: جا کێ هەیە ئەو پارێزراویەی هەیە کە ڕەسول الله ﷺ هەیبوو.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ كَانَ يَنْهَى عَنْ قُبْلَةِ الصَّائِمِ، فَقِيلَ لَهُ: إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، فَقَالَ: وَمَنْ ذَا لَهُ مِنَ الْحِفْظِ وَالْعِصْمَةِ مَا لِرَسُولِ اللهِ ﷺ.

المصنف لعبدرزاق | ٧٥٣٨

**أبي المتوكل** دەڵێ: پرسیار کرا لە أبي سعيد الخدري رضي الله عنه دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: کێشەی تێدا نییە مادام سەر نەکێشێ بۆ زیاتر.

حَدَّثَنَا ابن مباركٍ، عَنْ خالدٍ الحَذَّاء، عَن أبي المتوكِّل، عَن أبي سعيدٍ رَضيَ اللهُ عَنهُ، أنَّه سُئِلَ عَنِ القُبلة للصَّائم، فقال: لا بأسَ بها ما لم يَعدُ ذالكَ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٤٨٤

**عكرمة** دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای عبدالله بن عباس رضي الله عنهما لێی پرسی، ڕێی پێدا ماچ و موباشەرە و دەست خستنە سەر مادام سەر نەکێشی بۆ زیاتر.

حَدَّثَنَا حَفصٌ، عَن داودَ، عَن عكرمة، عَنِ ابن عبَّاسٍ رَضيَ اللهُ عنهُما، قال: أعرابيٌّ أتاه فسألَه فَرُخِّصَ له في القُبلَةِ والمُباشرَةِ ووَضعِ اليد ما لم يعده إلى غيره.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٢١

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: کێشەی تێدا نییە پیاوی بە تەمەن ماچ کردن و موباشەرە بکات کاتێک بەڕۆژووە.

حَدَّثَنَا وَكيع، عَن أبي مَكين، عَن عكرمةَ، عَن ابنِ عبَّاسٍ رَضيَ اللهُ عنهُما، قال: لا بأسَ للشَّيخِ أن يُباشِرَ يعني وهو صائم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥٢٦

**أبي مجلز** دەڵێ: پیاوێک هات بۆ لای عبدالله بن عباس رضي الله عنهما پرسیاری کرد دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ڕێگە و ڕوخصەتی پێدا، گەنجێکیش هات هەمان پرسیاری کرد، نەهی لێکرد.

أَخْبَرَنَا مَعْمَرٌ، عَنْ عَاصِمِ بْنِ سُلَيْمَانَ، عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ شَيْخٌ يَسْأَلُهُ عَنِ الْقُبْلَةِ وَهُوَ صَائِمٌ، فَرَخَّصَ لَهُ، فَجَاءَهُ شَابٌّ، فَنَهَاهُ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٥٥٠

**عطاء بن يسار** دەڵێ: پرسیار کرا لە عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ بۆ بە تەمەن ڕێگە و ڕوخصەتی پێدا، بەڵام بۆ گەنج بە کەراهەتی دانا.

عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ، عَنْ عَطَاءِ بْنِ يَسَارٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّه بْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنهُمَا، سُئِلَ عَنِ القُبْلَةِ لِلصَّائِمِ ؟ فَأَرْخَصَ فِيهَا لِلشَّيْخِ، وَكَرِهَهَا لِلشَّابِّ .

الموطأ لمالک | ٦٦٦ كتاب الأم للشافعي | ٩٢٤ مسند الشافعي | ٣٨٠

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما: نەهی دەکرد لە ماچ و موباشەرە کردن بۆ ڕۆژووەوان.

عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، كَانَ يَنْهَى عَنِ القُبْلَةِ وَالْمُبَاشَرَةِ لِلصَّائِمِ.

الموطأ لمالک | ٦٦٧ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٥٥ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥١٢

**ثعلبة بن عبدالله** دەڵێ: بینیم صەحابەی ڕەسول الله ﷺ نەهییان دەکرد لە ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان.

حَدَّثَنَا شَبابَةُ، عَنْ ابن أَبي ذِئبٍ، عَن الزُّهريَّ، عَن ثَعلَبة بن عبدالله بن أَبي صُعَيرٍ، قال: رأيت أصحاب رسول الله ﷺ وُهُم ينهونَ عَنِ القُبلة للصَّائم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥١٥

**عروة بن الزبير** دەڵێ: ئەم دیوە ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان بەرەو خێر بچێت.

قَالَ هِشَامُ بْنُ عُرْوَةَ، قَالَ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: لَمْ أَرَ الْقُبْلَةَ لِلصَّائِمِ تَدْعُو إِلَى خَيْرٍ.

الموطأ لمالك ا ٦٦٥ كتاب الأم للشافعي ا ٩٢٣

**ضرار بن مرة الشيباني** دەڵێ: پرسارم کرد لە سعيد بن جبير دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: کێشەی تێدا نییە، بەڵام بەریدی خراپەیە.

حَدَّثَنَا علي بن مُسهر، عَن الشيباني، قال: سألتُ سعيد بن جُبيرٍ، عَنِ القُبلة للصَّائم، فقال: لا بأسَ بها وإنَّها لبريد سوءٍ.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٤٩٢

**مغيرة** دەڵێ: إبراهيم النخعي بە کەراهەتی دادەنا پیاو خێزانی ماچ بکات کاتێک بەڕۆژووە.

حَدَّثَنَا أبو الأحوَص، عَن مُغيرةَ، عَن إبراهيمَ، أنَّه كان يَكره أن يُقَبِّلَ الرَّجُلُ امرأته وهو صائم.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٥٠٤

**محمد بن سيرين** دەڵێ: پرسیار کرا لە شريح دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: تەقوای الله بکات و دووبارە نەگەڕێتەوە سەری.

حَدَّثَنَا حَفصُ، عَن عاصمٍ وجَرير ووَكيع، عَن ابن عَونٍ، كلاهما عن ابن سيرينَ، عَن شُرَيحٍ، قال: سُئِلَ عَنِ القُبلة للصَّائم، فقال: يَتَّقي الله، ولا يَعود.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٥٠٦ المصنف لعبدرزاق ا ٧٥٥٩

**رزيق** و **خصيف** دەڵێن: پرسیارمان کرد لە سعيد بن المسيب دەربارەی پیاوێک خێزانی ماچ دەکات کاتێک بەڕۆژووە؟ وتی: ئەگەر ماچ بکەی ڕۆژووەکەت ناشکێ، بەڵام لە ئەجری ڕۆژووەکەت کەم دەکات.

عَنِ ابْنِ عُيَيْنَةَ، عَنْ رُزَيْقٍ وَخُصَيْفٍ، أَنَّهُمَا سَأَلَا ابْنَ الْمُسَيَّبِ عَنِ الرَّجُلِ يُقَبِّلُ امْرَأَتَهُ، وَهُوَ صَائِمٌ، فَقَالَ: إِنْ قَبَّلْتَ لَمْ يُفْطِرْكَ، وَهُوَ يُنْقِصُ مِنْ صَوْمِكَ .

المصنف لعبدرزاق ا ٧٥٦٢

**هشام بن الغاز** دەڵێ: گەنجێک هات بۆ لای مکحول وتی: من لە مانگی ڕەمەزاندا کاتێک بەڕۆژووم ماچی خێزانم دەکەم، پێی وت: کوڕی خۆم، ئەمما من ئەوە ماچی خێزانم دەکەم، بەڵام تۆ مەیکە.

حَدَّثَنَا شَبابَةُ، عَن هشام بن الغازِ، قال: سمعت مَكحولاً وأتاه رَجُلُ شابٌّ، فقال: إنِّي أُقَبِّلُ في شهر رمضان وأنا صائم، فقال: يا بُنَيَّ، أَمَّا أنا فأَفعَلُ ذالك وأَمَّا أنت فلا تفعله.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٥٠٨

**حبيب** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أبي قلابة دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: کاتێک بەڕۆژووی ماچی مەکە.

حَدَّثَنَا وَكيعُ، عَن مِسعَرٍ، عَن حبيبٍ، قال: سأَلتُ أبا قِلابة عَن القُبلَة للصَّائم، قال: لا تُقَبِّل وأنت صَائم.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٥١٠

**محمد بن المنتشر** دەڵێ: پرسیارم کرد لە مسروق دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: ماچی مەکە شەو نزیکە.

حَدَّثنا شَبابَةُ، قال: حَدَّثَنَا شُعبَة، عَن إبراهيم بن محمد بن المُنتَشِر، عَن أبيه، عَن مَسروقٍ، عَنِ القُبلة للصَّائم، فقال: اللَّيلُ قَريب.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٥١٧

**شافعي** دەڵێ: هەرکەسێک بە ماچ کردن شەهوەتی جووڵا ئەوە بە کەراهەتی دادەنێم بۆی، وە هەرکەسێک شەهوەتی نەجووڵا ئەوە ماچ کردن بۆی کێشەی نییە، لە هەردوو حاڵەتەکەدا کۆنترۆڵ کردنی نەفس باشترە، چونکە مەنع کردنی شەهوە لە الله تعالى ئومێد دەکرێ.

بۆیە وتمان ڕۆژووەکەی بەتاڵ ناکاتەوە، ئەگەر ماچ ڕۆژووی بەتاڵ بکردایەتەوە ئەوە ڕەسول الله ﷺ نەی دەکرد، وە عبدالله بن عباس رضي الله عنهما ڕوخصەتی نەدەدا وە غەیری ئەویش، وەک چۆن ڕوخصە نادەن بەو شتانەی ڕۆژوو دەشکێنن، تەماشای ئەوە ناکەن ئایا ڕۆژووەوان بە شەهوەتەوە کردوویەتی یان بێ شەهوەت .

قال الشافعي: ومَن حَرَكَت القُبلة شهوته كرهتها له، وإن فعلها لم ينقض صَومه، ومَن لم تَحرك شهوته فلا بأسَ له بالقُبلةِ، وَملك النفس في الحالتين عنها أفضل، لأنه مَنعُ شهوة يرجى مِنَ الله تعالى.

وإنما قلنا لا ينقض صَومه، لأنَّ القُبلةَ لو كانت تنقضُ صَومه لم يُقَبِّل رسول الله ﷺ، ولم يرخص ابن عباس وغيره فيها، كما لا يرخصون فيما يفطر، ولا ينظرون في ذالكَ إلى شهوةٍ فعلها الصَّائم لها ولا غير شهوَةِ.

كتاب الأم للشافعي | **(٦٥٠/١)**

**أبي داود** دەڵێ: بیستم پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەربارەی ماچ کردن بۆ ڕۆژووەوان؟ وتی: ئەگەر ترسی نەبێ لەوەی شتێکی لێوە بێ، لەوانەیە گەنج بێ مەنی بێتەوە.

سمعتُ أحمد سُئلَ عَن القُبلة للصائم؟ قال: إذا كانَ لا يخافُ أن يأتي مِنه شيء فإنَّه رُبما شابًّا فأمنى.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٣٠

**أبي داود** دەڵێ: بیستم جارێک پێی وترا: ڕۆژووەوان ماچ دەکات؟ وتی: ئەگەر گەنج بێ نەخێر. وە جارێکیش وتی: پێم باش نییە.

وَسمعته مَرَّةً قيل له: يقبَلُ الصَّائم؟ قال: إن كانَ شابًا فلا. وَقالَ مَرَّةً لا يُعجبني.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٣١

# کەفارەتی ڕۆژووی ئەو کەسەی بە ڕۆژدا جیماع دەکات لەگەڵ خێزانی

أبي هريرة رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لە خزمەت ڕەسول الله ﷺ دانیشتبووین پیاوێک هات وتی: یا ڕەسول الله، بە هیلاک چووم. فەرمووی: « چیتە؟ ». وتی: لەگەڵ خێزانم جووت بووم لەکاتێکدا بەڕۆژوو بووم. ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « دەتوانی کۆیلەیەک ئازاد بکەی؟ ». وتی: نەخێر. فەرمووی: « دەتوانی دوو مانگ بەڕۆژوو بی؟ ». وتی: نەخێر. فەرمووی: « دەتوانی نانی شەست هەژار بدەی؟ ». وتی: نەخێر. ڕەسول ﷺ ماوەیەک بێدەنگ بوو، دواتر زەمبیلەیەک خورما هێنرایە خزمەتی، ئەنجا فەرمووی: « کوا ئەو کەسەی پرسیاری کرد؟ ». پیاوەکە وتی: ئەمەتام. فەرمووی: « ئەو خورمایە ببە ببەخشە ». پیاوەکە وتی: ببەخشم بە کەسێک لە خۆم فەقیرتر؟ والله لە نێوان هەردوو حەڕەکەی مەدینە ماڵێک نییە هێندەی من فەقیر بێ. ڕەسول الله ﷺ زەردەخەنەیەکی کرد هەتا ددانەکانی دەرکەوتن ئەنجا فەرمووی: « بڕۆ خۆت و ماڵ و منداڵت بیخۆن ».

عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ، أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: بَيْنَمَا نَحْنُ جُلُوسٌ عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺ، إِذْ جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، هَلَكْتُ. قَالَ: « **مَا لَكَ؟** ». قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِي وَأَنَا صَائِمٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **هَلْ تَجِدُ رَقَبَةً تُعْتِقُهَا؟** ». قَالَ: لَا. قَالَ: « **فَهَلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟** ». قَالَ: لَا. فَقَالَ: « **فَهَلْ تَجِدُ إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِينًا؟** ». قَالَ: لَا. قَالَ: فَمَكَثَ النَّبِيُّ ﷺ، فَبَيْنَا نَحْنُ عَلَى ذَالِكَ أُتِيَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَرَقٍ فِيهَا تَمْرٌ -وَالْعَرَقُ: الْمِكْتَلُ- قَالَ: « **أَيْنَ السَّائِلُ؟** ». فَقَالَ: أَنَا. قَالَ: « **خُذْهَا فَتَصَدَّقْ بِهِ** ». فَقَالَ الرَّجُلُ: أَعَلَى أَفْقَرَ مِنِّي يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَوَاللهِ مَا بَيْنَ لَابَتَيْهَا -يُرِيدُ الْحَرَّتَيْنِ- أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي. فَضَحِكَ النَّبِيُّ ﷺ حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ ثُمَّ قَالَ: « **أَطْعِمْهُ أَهْلَكَ** ».

صحيح البخاري | ١٩٣٦ صحيح مسلم | ٢٥٩٦ سنن أبي داود | ٢٣٩٠ سنن الترمذي | ٧٣٣ سنن ابن ماجه | ١٦٧١ سنن الدارمي | ١٧٤٢ الموطأ لمالك | ٨١٥ مسند أحمد | ٧٢٩٠ كتاب الأم للشافعي | ٩٢٥ مسند الشافعي | ٣٨١ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٨٩ مسند الحميدي | ١٠٣٨ صحيح ابن خزيمة | ١٩٤٤ سنن الدارقطني باب القبلة للصائم | ٤٩

الَعَرَق مِكتَل: واتە زەمبیلەیەک کە بڕی پانزە صاع خۆراک دەگرێ، دەکاتە شەست مود وە هەر صاعێک پێکهاتووە لە چوار مشت، واتە بۆ هەموو هەژارێک مودێک.

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای ئەهلی عیلم بۆ هەرکەسێک کە ڕۆژووەکەی شکاندووە لە ڕەمەزاندا بە عەمدی جیماع لەگەڵ خێزانی بکات، ئەمما ئەو کەسەی ڕۆژووەکەی بە عەمدی شکاندووە بە خواردن و خواردنەوە، ئەوە ئەهلی عیلم خیلافیان هەیە لەمەدا. هەندێکیان دەڵێن: لەسەریەتی قەزای بکاتەوە، کەفارەتیشی بدات. خواردن و خواردنەوەیان شوبهاندووە بە جیماع. ئەمە قەولی سفیان الثوري و عبدالله بن المبارک و إسحاق بن راهوية ـشە. هەندێکی تریان دەڵێن: لەسەریەتی قەزای بکاتەوە، فیدیەی لەسەر نییە، چونکە ئەوەی لە ڕەسول الله ﷺ باس کراوە دەربارەی کەفارەت بۆ جیماعە، نەک بۆ خواردن و خواردنەوە. وە وتوویانە: جیماع لە خواردن و خواردنەوە ناچێ. ئەمە قەولی شافعي و أحمد بن حنبل ـە. وە شافعي دەڵێ: قەولی ڕەسول الله ﷺ بۆ ئەو پیاوەی ڕۆژووەکەی شکاندووە: « **خُذْهُ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ** ». ئەمە چەند مانایەک دەدات:

کەفارەت لەسەر کەسێکە کە توانای هەبێ، وە ئەم پیاوە توانای دانی کەفارەتەکەی نەبووە، کاتێک ڕەسول الله ﷺ شتێکی دەداتێ، وە پیاوەکە دەبێتە خاوەنی دەڵێ: کەس نییە هێندەی من فەقیر بێ وە پێویستی بێ. ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « **خُذْهُ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ** ». چونکە کەفارەت کاتێکە لە زیادەی خواردنەکەی بمێنێتەوە. وە شافعي ئەوەی هەڵبژاردووە ئەگەر کەسێک بەم جۆرە بێ، ئەوە با بیخوات، بەڵام کەفارەتە قەرزە لە گەردنیدا، هەرکات بوویە خاوەن خواردن ئەوە دەبێ کەفارەتەکە بدات.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا الْحَدِيثِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ فِيمَنْ أَفْطَرَ فِي رَمَضَانَ مُتَعَمِّدًا مِنْ جِمَاعٍ، وَأَمَّا مَنْ أَفْطَرَ مُتَعَمِّدًا مِنْ أَكْلٍ، أَوْ شُرْبٍ فَإِنَّ أَهْلَ الْعِلْمِ قَدِ اخْتَلَفُوا فِي ذَلِكَ. فَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَلَيْهِ الْقَضَاءُ وَالْكَفَّارَةُ. وَشَبَّهُوا الْأَكْلَ وَالشُّرْبَ بِالْجِمَاعِ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ وَابْنِ الْمُبَارَكِ وَإِسْحَاقَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: عَلَيْهِ الْقَضَاءُ، وَلَا كَفَّارَةَ عَلَيْهِ، لِأَنَّهُ إِنَّمَا ذُكِرَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ الْكَفَّارَةُ فِي الْجِمَاعِ، وَلَمْ تُذْكَرْ عَنْهُ فِي الْأَكْلِ وَالشُّرْبِ. وَقَالُوا: لَا يُشْبِهُ الْأَكْلُ وَالشُّرْبُ الْجِمَاعَ. وَهُوَ قَوْلُ الشَّافِعِيِّ، وَأَحْمَدَ. وَقَالَ الشَّافِعِيُّ: وَقَوْلُ النَّبِيِّ ﷺ لِلرَّجُلِ الَّذِي أَفْطَرَ، فَتَصَدَّقَ عَلَيْهِ: « **خُذْهُ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ** ». يَحْتَمِلُ هَذَا مَعَانِيَ: يَحْتَمِلُ أَنْ تَكُونَ الْكَفَّارَةُ عَلَى مَنْ قَدَرَ عَلَيْهَا، وَهَذَا رَجُلٌ لَمْ

يَقْدِرْ عَلَى الْكَفَّارَةِ، فَلَمَّا أَعْطَاهُ النَّبِيُّ ﷺ شَيْئًا وَمَلَكَهُ، فَقَالَ الرَّجُلُ: مَا أَحَدٌ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنَّا. فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: « **خُذْهُ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ** ». لِأَنَّ الْكَفَّارَةَ إِنَّمَا تَكُونُ بَعْدَ الْفَضْلِ عَنْ قُوتِهِ. وَاخْتَارَ الشَّافِعِيُّ لِمَنْ كَانَ عَلَى مِثْلِ هَذَا الْحَالِ أَنْ يَأْكُلَهُ، وَتَكُونَ الْكَفَّارَةُ عَلَيْهِ دَيْنًا، فَمَتَى مَا مَلَكَ يَوْمًا مَا كَفَّرَ.

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: پیاوێک چوویە مزگەوت بۆ لای ڕەسول الله ﷺ لە ڕەمەزاندا، وتی: ئەی ڕەسولی الله، سووتام، سووتام. ڕەسول الله ﷺ پرسیاری لێکرد: « چیتە؟ ». وتی: جیماعم کردووە لەگەڵ خێزانم. فەرمووی: « ببەخشە کەفارەتی بدە». وتی: ئەی ڕەسولی الله، والله هیچم نییە، وە توانا و دەسەڵاتم نییە، فەرمووی: « دانیشە ». پیاوەکە دانیشت کاتێک لەم حاڵەدا بوو، پیاوێک هات کەرێکی پێ بوو بارەکەی خواردن بوو، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « کوا پیاوە سووتاوەکەی کەمێک پێش ئێستا؟ ». پیاوەکە هەستایە سەر پێ، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « ئەمە ببەخشە ». وتی: ئەی ڕەسولی الله، بیدەمە غەیری خۆمان، والله ئێمە برسین، هیچمان نییە، فەرمووی: « خۆتان بیخۆن ».

عَنْ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ: أَتَى رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي الْمَسْجِدِ فِي رَمَضَانَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، احْتَرَقْتُ، احْتَرَقْتُ. فَسَأَلَهُ رَسُولُ اللهَّ

ﷺ: « **مَا شَأْنُهُ؟** ». فَقَالَ: أَصَبْتُ أَهْلِي. قَالَ: « **تَصَدَّقْ** ». فَقَالَ: وَاللهِ يَا نَبِيَّ اللَّه، مَا لِي شَيْءٌ، وَمَا أَقْدِرُ عَلَيْهِ، قَالَ: « **اجْلِسْ** ». فَجَلَسَ فَبَيْنَا هُوَ عَلَى ذَلِكَ، أَقْبَلَ رَجُلٌ يَسُوقُ حِمَارًا عَلَيْهِ طَعَامٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **أَيْنَ الْمُحْتَرِقُ آنِفًا؟** ». فَقَامَ الرَّجُلُ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **تَصَدَّقْ بِهَذَا** ». فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَغَيْرَنَا، فَوَاللهِ إِنَّا لَجِيَاعٌ، مَا لَنَا شَيْءٌ، قَالَ: «**فَكُلُوهُ**».

صحيح البخاري | ١٩٣٥-٦٨٢٢ صحيح مسلم | ٢٦٠٣ سنن أبي داود | ٢٣٩٤ سنن الدارمي | ١٧٤٤ مسند أحمد | ٢٥٠٩٢ صحيح ابن خزيمة | ١٩٤٦

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی پیاوێک جیماع دەکات لەگەڵ خێزانی لە ڕەمەزاندا پێی وایە هێشتا شەوە، بەڵام سەیر دەکات ڕۆژ بووەتەوە؟ وتی: لەسەریەتی قەزای بکاتەوە، وە کەفارەتیشی بدات وەک چۆن ڕەسول اللە ﷺ فەرمانی کرد بەو پیاوەی کە جیماعی کرد بوو لەگەڵ خێزانی لە ڕەمەزاندا.

سألت أَبي عَن رَجُل وَطئ أَهله في رمضان وَهو يرى أَنّ عليه ليلًا، فإذا هوَ قد أصبَح؟ قال: عليه القضاء يقضي يومًا، ويكفر ما أَمرَ النبي ﷺ الذي وَطئَ أَهله في رمضان.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٧١٢

**أَبي داود** دەڵێ: بیستم أحمد بن حنبل وتی: ئەگەر ڕۆژووەوان جیماع بکات لە ڕەمەزاندا ئەوە دەبێ قەزای بکاتەوە و کەفارەتیشی بدات.

سمعت أحمد قال: الصَّائم إذا جامَعَ في رمضان عليه القضاءُ والكفارةُ.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٦٣٧



# نەسخ بوونەوەی حوکمی تەرک کردنی خواردن و چوونە لای ئافرەت دوای عیشا

عبدالله بن عباس رضي الله عنهما لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ ﴾. دەڵێ: موسڵمانەکان لە مانگی ڕەمەزاندا ئەگەر نوێژی عیشایان بکردایە، ئەوە خواردن و خواردنەوە لەگەڵ چوونە لای خێزانەکانیان لێ حەڕام دەکرا هەتا هەمان کاتی ڕۆژی دواتر، پاشان هەندێک لە خەڵکی دوای عیشا خواردنیان خوارد، وە چوونە لای خێزانەکانیان، یەکێک لەوانە عمر بن الخطاب بوو رضي الله عنه، شکاتی ئەم حاڵەیان بردە لای ڕەسول الله ﷺ، ئیتر الله ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ﴾. واتە: بچنە لای خێزانەکانتان. ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾. بخۆن و بخۆنەوە هەتا سپیایی سپێدەتان بۆ ڕوون دەبێتەوە لە ڕەشاییەکەی.

حدثني المثنى، قال: حدثنا أبو صالح، قال: حدثنا مُعاوية بن صالح، عن علي ابن أبي طلحة، عن ابن عباس رضي الله عنهُما في قول الله تعالى

ذِكره: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ ﴾. وذالک أنّ المسلمين كانوا في شهر رمضان إذا صلوا العشاء حرُم عليهم النساء والطعام إلى مثلها مِنَ القابلة، ثم إنّ أناسًا من المسلمين أصابوا الطعام والنساء في رمضان بعد العشاء، منهم عمر بن الخطاب، فشكوا ذالک إلى رسول الله ﷺ، فأنزل الله: ﴿ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ ﴾. يعني: أنكحوهن. ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ ﴾.

تفسير الطبري | **(٣/٨٢٧)**

**البراء بن عازب** رضي الله عنه دەڵێ: صەحابەکانی محمد ﷺ کاتێک بەڕۆژوو دەبوون ئەگەر پیاو نانی ئێوارەی بۆ بهێنرایە پێش ئەوەی ڕۆژووەکەی بشکێنێ بخەوتایە، ئەوە ئەو شەوە لەگەڵ ڕۆژەکەشی بۆی نەبوو هیچ بخوات هەتا ئێوارە، قيس بن صرمة الأنصاري بەڕۆژوو بوو، کاتی بەربانگ کردنەوە هاتە لای خێزانی وتی: هیچ خواردنێک هەیە؟ وتی: نەخێر، بەڵام ئێستا دەچم شتێکت بۆ پەیدا دەکەم، قيس ماندوو بوو ڕۆژەکەی ئیشی کردبوو خەوت، خێزانەکەی خواردنی بۆ هێنا تەماشای کرد خەوی لێ کەوتووە، وتی: بەداخەوە خەسارەت بۆ تۆ. کاتێک ڕۆژ

بوویەوە قیس لە نیوەڕۆدا لە هۆش خۆی چوو، ئەمەیان باس کرد بۆ ڕەسول الله ﷺ، ئیتر الله ﷻ ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَائِكُمْ﴾. بەمە زۆر دڵخۆش بوون، ئەنجا ئەم ئایەتش دابەزی: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ﴾.

عَنِ الْبَرَاءِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ أَصْحَابُ مُحَمَّدٍ ﷺ إِذَا كَانَ الرَّجُلُ صَائِمًا فَحَضَرَ الْإِفْطَارُ فَنَامَ قَبْلَ أَنْ يُفْطِرَ، لَمْ يَأْكُلْ لَيْلَتَهُ وَلَا يَوْمَهُ حَتَّى يُمْسِيَ، وَإِنَّ قَيْسَ بْنَ صِرْمَةَ الْأَنْصَارِيَّ كَانَ صَائِمًا، فَلَمَّا حَضَرَ الْإِفْطَارُ أَتَى امْرَأَتَهُ فَقَالَ لَهَا: أَعِنْدَكِ طَعَامٌ؟ قَالَتْ: لَا، وَلَكِنْ أَنْطَلِقُ فَأَطْلُبُ لَكَ. وَكَانَ يَوْمَهُ يَعْمَلُ فَغَلَبَتْهُ عَيْنَاهُ، فَجَاءَتْهُ امْرَأَتُهُ، فَلَمَّا رَأَتْهُ قَالَتْ: خَيْبَةً لَكَ. فَلَمَّا انْتَصَفَ النَّهَارُ غُشِيَ عَلَيْهِ، فَذُكِرَ ذَالِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ﴾ فَفَرِحُوا بِهَا فَرَحًا شَدِيدًا، وَنَزَلَتْ: ﴿وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ﴾.

صحيح البخاري | ١٩١٥ سنن أبي داود | ٢٣١٤ سنن الترمذي | ٣٢٠٦ سنن النسائي | ٢١٦٨ سنن الدارمي | ١٧١٩ مسند أحمد | ١٨٦١١ صحيح ابن خزيمة | ١٩٠٤ تفسير الطبري | **(٨٢٦/٣)**



# ئافرەتی خاوەن حیض دەبێ ڕۆژووەکانی قەزا بکاتەوە

**معاذة العدوية** دەڵێ: ئافرەتێک پرسیاری کرد لە عائشة رضي الله عنها: ئافرەت کاتێک لە حیض پاک دەبێتەوە نوێژەکانی قەزا بکاتەوە؟ وتی: تۆ حەروری؟ ئێمە لە سەردەمی ڕەسول الله ﷺ توشی حیض دەبووین، پاشان پاک دەبووینەوە فەرمانی پێ دەکردین ڕۆژووەکەمان بگرینەوە، بەڵام فەرمانی پێ نەدەکردن نوێژەکانمان قەزا بکەینەوە.

عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ، أَنَّ امْرَأَةً سَأَلَتْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا :أَتَقْضِي الْحَائِضُ الصَّلَاةَ إِذَا طَهُرَتْ؟ قَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ كُنَّا نَحِيضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، ثُمَّ نَطْهُرُ فَيَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلَا يَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصَّلَاةِ.

صحيح البخاري | ٣٢١ صحيح مسلم | ٧٦١ سنن النسائي | ٢٣١٨ مسند أحمد | ٢٤٦٦٠

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی ڕەسول الله ﷺ توشی حیض دەبووین، پاشان پاک دەبووینەوە، فەرمانی پێ دەکردین ڕۆژووەکەمان بگرینەوە، بەڵام فەرمانی پێ نەدەکردن نوێژەکانمان قەزا بکەینەوە.

عَنِ الْأَسْوَدِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كُنَّا نَحِيضُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، ثُمَّ نَطْهُرُ، فَيَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصِّيَامِ، وَلَا يَأْمُرُنَا بِقَضَاءِ الصَّلَاةِ.

سنن الترمذي | ٧٩٧ سنن ابن ماجه | ١٦٧٠ مسند أحمد | ٢٥٥٤٣

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای ئەهلی عیلم هیچ خیلافێک نییە لە نێوانیان ئافرەتی خاوەن حیض ڕۆژوو قەزا دەکاتەوە، نوێژ قەزا ناکاتەوە .

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ لَا نَعْلَمُ بَيْنَهُمُ اخْتِلَافًا أَنَّ الْحَائِضَ تَقْضِي الصِّيَامَ، وَلَا تَقْضِي الصَّلَاةَ.

**أبو الزناد** دەڵێ: سونەن و قەولەکانی حەق زۆربەی کات پێچەوانەی ڕەئی دێن، موسڵمانان چاریان نییە ئیللا دەبێ شوێنی بکەون، یەکێک لەوانە مەسئەلەی ئافرەتی حائض ـەیە ڕۆژووەکەی دەگرێتەوە، بەڵام قەزای نوێژەکان ناکاتەوە.

وَقَالَ أَبُو الزِّنَادِ: إِنَّ السُّنَنَ وَوُجُوهَ الْحَقِّ لَتَأْتِي كَثِيرًا عَلَى خِلَافِ الرَّأْيِ، فَمَا يَجِدُ الْمُسْلِمُونَ بُدًّا مِنِ اتِّبَاعِهَا، مِنْ ذَالِكَ أَنَّ الْحَائِضَ تَقْضِي الصِّيَامَ وَلَا تَقْضِي الصَّلَاةَ.

صحيح البخاري ٤١- باب الحائض تترك الصوم والصلاة.



# خۆ توند کردنەوە بۆ عیبادەت لە دە شەوی کۆتاییدا

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هەرکات پێی دەخستە دە شەوی کۆتایی، نزیکی خێزانەکانی نەدەکەوتەوە، شەوەکەی زیندوو دەکردەوە، خێزانەکانی خەبەر دەکردەوە.

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ شَدَّ مِئْزَرَهُ وَأَحْيَا لَيْلَهُ وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ.

صحيح البخاري | ٢٠٢٤ صحيح مسلم | ٢٧٨٧ سنن الترمذي | ١٧٦٨ سنن النسائي | ١٦٣٩ سنن ابن ماجه | ١٧٦٨ مسند أحمد | ٢٤١٣١ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٤٠

ئەم حدیثەی سەرەوە عبدالرزاق لە ڕێگەی سفيان الثوري ـيەوە ڕیوایەتی کردووە، سفیان تەفسیری کەلیمەی « شَدَّ الْمِئْزَرَ » دەکات واتە: نزیکی ئافرەتان نەدەبوویەوە.

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ بَعْضِ أَصْحَابِهِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ الله ﷺ إِذَا دَخَلَتِ الْعَشْرُ الْأَوَاخِرُ مِنْ رَمَضَانَ: أَيْقَظَ أَهْلَهُ، وَشَمَّرَ الْمِئْزَرَ، يَقُولُ سُفْيَانُ: شَدَّ الْمِئْزَرَ: لَا يَقْرَبُ النِّسَاءَ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٨٣٨

**علي بن أبي طالب** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ کاتێک پێی دەخستە دە شەوی کۆتایی خێزانەکانی خەبەر دەکردەوە، وە مئزەرەکەی بەرز دەکردەوە. بە أبي بكر بن عياش وترا: « رَفْعُ الْمِئْزَرِ » چییە؟ وتی: وازی لە ئافرەتان دەهێنا و نزیکیان نەدەکەوتەوە.

حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ هُبَيْرَةَ، عَنْ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ الله ﷺ إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ أَيْقَظَ أَهْلَهُ وَرَفَعَ الْمِئْزَرَ. قِيلَ لِأَبِي بَكْرِ بْنِ عَيَّاشٍ: مَا رَفْعُ الْمِئْزَرِ؟ قَالَ: اعْتَزَلَ النِّسَاءَ.

كتاب الصيام للفريابي | ١٥٧

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە دە شەوی کۆتاییدا هەوڵ و کۆششێکی زۆری دەکرد، ئەو هەوڵ و کۆششەی لە غەیری ئەو شەوانەدا نەدەکرد.

عَنِ الْحَسَنِ بْنِ عُبَيْدِاللَّه، قَالَ: سَمِعْتُ إِبْرَاهِيمَ يَقُولُ، سَمِعْتُ الْأَسْوَدَ بْنَ يَزِيدَ، يَقُولُ: قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَجْتَهِدُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مَا لَا يَجْتَهِدُ فِي غَيْرِهِ.

صحيح مسلم | ٢٧٨٨ مسند أحمد | ٢٦١٨٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٣٨

# ئیعتکاف

**عبیدالله بن یحیی** دەڵێ: یحیی بۆی گێڕامەوە لە مالک ـەوە: پێی گەیشتووە لە قاسم بن محمد و نافع خزمەتکاری عبدالله بن عمر، وتوویانە: ئیعتکاف ناکرێ ئیللا لەگەڵ ڕۆژوودا نەبێ، لەبەر قەولی الله ﷻ: ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ ﴾. لەبەرئەوەی الله ﷻ لەگەڵ ڕۆژوودا باسی ئیعتکاف دەکات. مالک دەڵێ: وە لەسەر ئەمەیە قەول و فیعلی ئێمەش ئیعتکاف ناکرێ ئیللا لەگەڵ ڕۆژوودا نەبێ.

حَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ مَالِكٍ: أَنَّهُ بَلَغَهُ أَنَّ الْقَاسِمَ بْنَ مُحَمَّدٍ وَنَافِعًا مَوْلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ، قَالَا: لَا اعْتِكَافَ إِلَّا بِصِيَامٍ، لِقَوْلِ اللهِ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي كِتَابِهِ: ﴿ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ ﴾. فَإِنَّمَا ذَكَرَ اللَّهُ الِاعْتِكَافَ مَعَ الصِّيَامِ. قَالَ مَالِكٌ: وَعَلَى ذَلِكَ الْأَمْرُ عِنْدَنَا: أَنَّهُ لَا اعْتِكَافَ إِلَّا بِصِيَامٍ.

الموطأ لمالک | ٧١٣

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتکافی دەکرد.

عَنْ يُونُسَ، أَنَّ نَافِعاً أَخْبَرَهُ، عَنْ عَبْدِاللهَ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ.

صحيح البخاري | ٢٠٢٥ صحيح مسلم | ٢٧٨١ سنن أبي داود | ٢٤٦٥ سنن ابن ماجه | ١٧٧٣ مسند أحمد | ٦١٧٢

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هەتا وەفاتی کرد دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتکافی دەکرد، پاشان خێزانەکانیشی دوای ئەو ئیعتکافیان دەکرد.

عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ.

صحيح البخاري | ٢٠٢٦ صحيح مسلم | ٢٧٨٤ سنن أبي داود | ٢٤٦٢ سنن الترمذي | ٨٠٠ مسند أحمد | ٢٤٦١٣ المصنف لعبدرزاق | ٧٨١٧

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هەموو ڕەمەزانێک دە ڕۆژ ئیعتکافی دەکرد، بەڵام ئەو ساڵەی کە وەفاتی کرد تیایدا بیست ڕۆژ ئیعتکافی کرد.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعْتَكِفُ فِي كُلِّ رَمَضَانٍ عَشْرَةَ أَيَّامٍ، فَلَمَّا كَانَ الْعَامُ الَّذِي قُبِضَ فِيهِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ يَوْمًا.

صحيح البخاري | ٢٠٤٤ سنن أبي داود | ٢٤٦٦ سنن ابن ماجه | ١٧٦٩ سنن الدارمي | ١٨٠٥ مسند أحمد | ٨٦٦٢

**أبي بن كعب** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان ئیعتکافی دەکرد، ساڵێک ئیعتکافی نەکرد، بەڵام ساڵی دوای ئەو بیست شەو ئیعتکافی کرد.

عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ، فَلَمْ يَعْتَكِفْ عَامًا، فَلَمَّا كَانَ فِي الْعَامِ الْمُقْبِلِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ لَيْلَةً.

سنن أبي داود | ٢٤٦٣ سنن ابن ماجه | ١٧٧٠ مسند أحمد | ٢١٢٧٧

ئەم حدیثەی سەرەوە لای الترمذي لە أنس بن مالک رضي الله عنه ڕیوایەتی کردووە.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَعْتَكِفُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ فَلَمْ يَعْتَكِفْ عَامًا، فَلَمَّا كَانَ فِي الْعَامِ الْمُقْبِلِ اعْتَكَفَ عِشْرِينَ.

سنن الترمذي | ٨١٤

**أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە دە شەوی وەسەطی ڕەمەزان ئیعتکافی دەکرد، وە کاتێک شەوی بیستەم تێ دەپەڕی و شەوی بیست و یەک ڕووی تێ دەکرد دەگەڕایەوە بۆ شوێنی مانەوەکەی ئەوانەشی لەگەڵیدا ئیعتکافیان کردبوو گەڕانەوە، جا لە مانگێکی ڕەمەزان ئیعتکافی کرد پاشان وتاری بۆ خەڵکیدا و فەرمانی پێ کردن بەوەی الله دەیەوێ، پاشان وتی: « من ئەم دە شەوە ئیعتکافم کردووە، بەڵام بۆم دەرکەوت و پێم باشە ئەم دە شەوەی کۆتاییش بمێنمەوە، هەرکەسێک ئیعتکافی کردووە با لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە، من شەوی قەدرم نیشاندرا، بەڵام بیرم چوویەوە، لە دە شەوی کۆتاییدا بە دوایەوە بن، لە شەوە تاکەکاندا بە دوایەوە بن، بینیم نوێژی بەیانی شەوی قەدر لە ناو ئاوو قوڕاودا سوجدەم دەبرد ». أبو سعید دەڵێ: لە شەوی بیست و یەکدا باران باری مزگەوت تکەی کرد لە شوێنی نوێژی ڕەسول

اللە ﷺ، سەیری ڕەسول اللە ـم کرد ﷺ کاتێک دوای نوێژی بەیانی دەچوویەوە ڕوومەتی تەڕ بوو بە قوڕ و ئاو.

عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُجَاوِرُ فِي رَمَضَانَ الْعَشْرَ الَّتِي فِي وَسَطِ الشَّهْرِ، فَإِذَا كَانَ حِينَ يُمْسِي مِنْ عِشْرِينَ لَيْلَةً تَمْضِي وَيَسْتَقْبِلُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ رَجَعَ إِلَى مَسْكَنِهِ، وَرَجَعَ مَنْ كَانَ يُجَاوِرُ مَعَهُ، وَأَنَّهُ أَقَامَ فِي شَهْرٍ جَاوَرَ فِيهِ اللَّيْلَةَ الَّتِي كَانَ يَرْجِعُ فِيهَا، فَخَطَبَ النَّاسَ فَأَمَرَهُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ: « كُنْتُ أُجَاوِرُ هَذِهِ الْعَشْرَ، ثُمَّ قَدْ بَدَا لِي أَنْ أُجَاوِرَ هَذِهِ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ، فَمَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعِي فَلْيَثْبُتْ فِي مُعْتَكَفِهِ، وَقَدْ أُرِيتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، فَابْتَغُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، وَابْتَغُوهَا فِي كُلِّ وِتْرٍ، وَقَدْ رَأَيْتُنِي أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: مُطِرْنَا لَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ فِي مُصَلَّى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، وَقَدِ انْصَرَفَ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ، وَوَجْهُهُ مُبْتَلٌّ طِينًا وَمَاءً .

صحيح البخاري | ٢٠٢٧ صحيح مسلم | ٢٧٦٩ سنن أبي داود | ١٣٨٢ سنن النسائي | ١٣٥٦ سنن ابن ماجه | ١٧٦٦ الموطأ لمالک | ٧١٨ مسند

أحمد | ١١١٨٦ مسند أبي داود الطيالسي | ٢٣٠١ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٢١ مسند الحميدي | ٧٧٤

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هەرکات بە نیازی ئیعتکاف بووایە ئەوە نوێژی بەیانی دەکرد، پاشان دەچووە شوێنی ئیعتکافەکەی، داوای کرد خەیمەکەی بۆ هەڵبدەن، خەیمەکەی بۆ هەڵدرا، ویستی دە شەوی کۆتایی ئیعتکاف بکات، وە زەینەبی خێزانی ئیعتکافی دەکرد ئەویش داوای کرد خەیمەکەیان بۆ هەڵدا، وە غیری ئەویش لە خێزانەکانی ڕەسول الله ﷺ داوایان کرد خەیمەیان بۆ هەڵبدەن و بۆیان هەڵدرا، کاتێک ڕەسول الله ﷺ نوێژی بەیانی کرد سەیری خەیمەکانی کرد، فەرمووی: « خێرتان دەوێ ». فەرمانی کرد خەیمەکەی لابەرن و پێچایانەوە، ئەو ڕەمەزانە ئیعتکافی تەرک کرد، دواتر دە ڕۆژی یەکەمی مانگی شەوال ئیعتکافی کرد.

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْرَ، ثُمَّ دَخَلَ مُعْتَكَفَهُ، وَإِنَّهُ أَمَرَ بِخِبَائِهِ، فَضُرِبَ أَرَادَ الِاعْتِكَافَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَمَرَتْ زَيْنَبُ بِخِبَائِهَا فَضُرِبَ، وَأَمَرَ غَيْرُهَا مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ الْفَجْرَ نَظَرَ

فَإِذَا الْأَخْبِيَةُ، فَقَالَ: «آلْبِرَّ تُرِدْنَ؟». فَأَمَرَ بِخِبَائِهِ فَقُوِّضَ، وَتَرَكَ الاعْتِكَافَ فِي شَهْرِ رَمَضَانَ حَتَّى اعْتَكَفَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَّلِ مِنْ شَوَّالٍ.

صحيح البخاري | ٢٠٣٣ صحيح مسلم | ٢٧٨٥ سنن أبي داود | ٢٤٦٤ سنن الترمذي | ٨٠١ سنن ابن ماجه | ١٧٧١ الموطأ لمالك | ٧١٦ مسند أحمد | ٢٤٥٤٤ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٣٧ مسند الحميدي | ١٩٦

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای هەندێک لە ئەهلی عیلم دەڵێن: ئینسان ئەگەر ویستی ئیعتکاف بکات نوێژی بەیانی دەکات، پاشان دەچێتە شوێنی ئیعتکافەکەی. وە ئەمە قەولی أحمد بن حنبل و إسحاق بن إبراهیم بن راهویة ـیە. وە هەندێکی تریان دەڵێن: ئینسان ئەگەر ویستی ئیعتکاف بکات خۆری ئەو شەوەی کە بۆ بەیانییەکەی دەیەوێ ئیعتکافی تێدا بکات ئاوا بێ. ئەم لە شوێنی ئیعتکافەکەی دابنیشێ، ئەمە قەولی سفیان الثوري و مالک بن أنس ـە.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا الْحَدِيثِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ يَقُولُونَ: إِذَا أَرَادَ الرَّجُلُ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْرَ، ثُمَّ دَخَلَ فِي مُعْتَكَفِهِ. وَهُوَ قَوْلُ أَحْمَدَ وَإِسْحَاقَ

بْنِ إِبْرَاهِيمَ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ فَلْتَغِبْ لَهُ الشَّمْسُ مِنَ اللَّيْلَةِ الَّتِي يُرِيدُ أَنْ يَعْتَكِفَ فِيهَا مِنَ الْغَدِ. وَقَدْ قَعَدَ فِي مُعْتَكَفِهِ، وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ.

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ کاتێک لە ئیعتکاف بوو سەری دەهێنایە دەرەوە لە مزگەوت منیش بۆم دەشۆری و شانەم دەکرد لەکاتێکدا عادە بووم.

عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ نَوْفَلٍ، عَنْ عُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ، عَنْ عَائِشَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ، أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُخْرِجُ إِلَيَّ رَأْسَهُ مِنَ الْمَسْجِدِ، وَهُوَ مُجَاوِرٌ، فَأَغْسِلُهُ وَأَنَا حَائِضٌ.

صحيح البخاري | ٢٩٥ صحيح مسلم | ٦٨٦ سنن أبي داود | ٢٤٦٩ سنن النسائي | ٣٨٧ سنن ابن ماجه | ١٧٧٨ مسند أحمد | ٢٥٥٦٣

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە مزگەوت بوو سەری دەهێنایە ژوورەوە بۆ لام قژیم دادەهێنا، کاتێک لە ئیعتیکافدا دەبوو نەدەهاتەوە ماڵ ئیلا بۆ قەزای حاجە نەبێ.

عَنْ لَيْثٌ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ عُرْوَةَ، وَعَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِالرَّحْمَنِ، أَنَّ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ قَالَتْ : وَإِنْ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيُدْخِلُ عَلَيَّ رَأْسَهُ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ فَأُرَجِّلُهُ ، وَكَانَ لَا يَدْخُلُ الْبَيْتَ إِلَّا لِحَاجَةٍ إِذَا كَانَ مُعْتَكِفًا.

صحيح البخاري | ٢٠٢٩ صحيح مسلم | ٦٨٥ سنن أبي داود | ٢٤٦٨ سنن الترمذي | ٨١٥ سنن ابن ماجه | ١٧٧٦ الموطأ لمالک | ٧١٠ مسند أحمد | ٢٤٥٢١

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای ئەهلی عیلم دەڵێن: ئەگەر ئینسان ئیعتکافی کرد ناچێتە دەرەوە ئیللا بۆ قەزای حاجە نەبێ، وە هەموو لەسەر ئەوە یەک دەنگن دەتوانێ بۆ قەزای حاجەی دەست بە ئاو گەیاندن بچێتە دەرەوە، پاشان خیلاف هەیە لە نێوان ئەهلی عیلم دەربارەی سەردانی کردنی نەخۆش و ئامادە بوونی جمعة و بەشداری کردن لە جەنازە: هەندێک لە ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ وە غەیری ئەوانیشە وای دەبینن دەتوانێ سەردانی نەخۆش بکات، وە ئامادەی جەنازە بێ، وە بەشداری نوێژی جمعة بکات ئەگەر هاتوو لە ئیعتکافەکەیدا ئەمانەی بە مەرج گرت بێ.

ئەمە قەولی سفيان الثوري و عبدالله بن المبارک ـە. وە هەندێکی تر دەڵێن: بۆی نییە هیچ کامێک لەمانە بکات، وە ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات ئەگەر لە شارێکدا بوو کە نوێژی جمعەی تێدا دەکرێ ئەوە دەبێ ئیعتکاف لەو مزگەوتەدا بکات کە جمعەی تێدا دەکرێ، وە نابێ جمعة تەرک بکات، وە دەڵێن: دەبێ ئیعتکاف لەو مزگەوتە بکرێ کە جمعەی تێدا دەکرێ بۆ ئەوەی پێویست نەکات لە شوێنی ئیعتکافەکەی بچێتە دەرەوە ئیللا بۆ قەزای حاجەی نەبێ، چونکە چوونە دەرەوە بۆ غەیری قەزای حاجە بەلایانەوە ئیعتکافەکە دەپچڕێنێ. ئەمە قەولی مالک بن أنس و شافعي ـیە. وە أحمد بن حنبل دەڵێ: سەردانی نەخۆش ناکات، وە شوێنی جەنازە ناکەوێ. لەبەر حدیثی عائشة رضي الله عنها. وە إسحاق بن راهوية دەڵێ: ئەگەر بە مەرجی گرتبێ ئەوە بۆی هەیە شوێنی جەنازە بکەوێ، وە سەردانی نەخۆش بکات.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ: إِذَا اعْتَكَفَ الرَّجُلُ أَنْ لَا يَخرُجَ من اعْتِكَافِهِ إِلَّا لِحَاجَةِ الْإِنْسَانِ، وَاجْتَمَعُوا عَلَى هَذَا أَنَّهُ يَخْرُجُ لِقَضَاءِ حَاجَتِهِ لِلْغَائِطِ وَالْبَوْلِ، ثُمَّ اخْتَلَفَ أَهْلُ الْعِلْمِ فِي عِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَشُهُودِ الْجُمُعَةِ، وَالْجَنَازَةِ لِلْمُعْتَكِفِ: فَرَأَى بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ

أَنْ يَعُودَ الْمَرِيضَ، وَيُشَيِّعَ الْجَنَازَةَ، وَيَشْهَدَ الْجُمُعَةَ إِذَا اشْتَرَطَ ذَلِكَ. وَهُوَ قَوْلُ سُفْيَانَ الثَّوْرِيِّ، وَابْنِ الْمُبَارَكِ. وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ لَهُ أَنْ يَفْعَلَ شَيْئًا مِنْ هَذَا، وَرَأَوْا لِلْمُعْتَكِفِ إِذَا كَانَ فِي مِصْرٍ يُجَمَّعُ فِيهِ أَنْ لَا يَعْتَكِفَ إِلَّا فِي مَسْجِدِ الْجَامِعِ، لِأَنَّهُمْ كَرِهُوا الْخُرُوجَ لَهُ مِنْ مُعْتَكَفِهِ إِلَى الْجُمُعَةِ، وَلَمْ يَرَوْا لَهُ أَنْ يَتْرُكَ الْجُمُعَةَ، فَقَالُوا: لَا يَعْتَكِفُ إِلَّا فِي مَسْجِدِ الْجَامِعِ حَتَّى لَا يَحْتَاجَ أَنْ يَخْرُجَ مِنْ مُعْتَكَفِهِ لِغَيْرِ قَضَاءِ حَاجَةِ الْإِنْسَانِ، لِأَنَّ خُرُوجَهُ لِغَيْرِ حَاجَةِ الْإِنْسَانِ قَطْعٌ عِنْدَهُمْ لِلاعْتِكَافِ. وَهُوَ قَوْلُ مَالِكٍ، وَالشَّافِعِيِّ. وَقَالَ أَحْمَدُ: لَا يَعُودُ الْمَرِيضَ، وَلَا يَتْبَعُ الْجَنَازَةَ. عَلَى حَدِيثِ عَائِشَةَ. وَقَالَ إِسْحَاقُ: إِنِ اشْتَرَطَ ذَلِكَ فَلَهُ أَنْ يَتْبَعَ الْجَنَازَةَ، وَيَعُودَ الْمَرِيضَ.

**علي بن الحسين** رضي الله عنهما دەڵێ: صفية ـی خێزانی ڕەسول الله ﷺ بۆی گێڕامەوە، کە هاتووە بۆ لای ڕەسول الله ﷺ سەردانی بکات لە مزگەوت لە کاتی ئیعتکافەکەیدا لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان، بۆ ماوەی سەعاتێک لای ماوەتەوە قسەیان کردووە پاشان هەستایەوە بڕوات، ڕەسول الله ﷺ لەگەڵی هەستایەوە هەتا بیگەیێنێ، هەتا گەیشتنە دەرگای مزگەوت لای دەرگای أم سلمة دوو پیاو لە ئەنصارییەکان تێپەڕین، سەلامیان کرد لە ڕەسول الله ﷺ، ڕەسول الله ﷺ پێی فەرموون:

«لەسەرخۆ بن، ئەمە صفية بنت حيي». وتيان: سبحان الله ئەی ڕەسولی الله، ئەمەیان لەسەر گران بوو، فەرمووی: « شەیتان بە ڕێڕەوی خوێندا تێدەپەڕێ، جا ترسام گومانێک بخاتە دڵتانەوە ».

عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَلِيُّ بْنُ الْحُسَيْنِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ صَفِيَّةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ أَخْبَرَتْهُ، أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَزُورُهُ فِي اعْتِكَافِهِ فِي الْمَسْجِدِ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَتَحَدَّثَتْ عِنْدَهُ سَاعَةً ثُمَّ قَامَتْ تَنْقَلِبُ، فَقَامَ النَّبِيُّ ﷺ مَعَهَا يَقْلِبُهَا، حَتَّى إِذَا بَلَغَتْ بَابَ الْمَسْجِدِ عِنْدَ بَابِ أُمِّ سَلَمَةَ مَرَّ رَجُلَانِ مِنَ الْأَنْصَارِ، فَسَلَّمَا عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ لَهُمَا النَّبِيُّ ﷺ: « عَلَى رِسْلِكُمَا، إِنَّمَا هِيَ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَيٍّ ». فَقَالَا: سُبْحَانَ اللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ. وَكَبُرَ عَلَيْهِمَا، فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: « إِنَّ الشَّيْطَانَ يَبْلُغُ مِنَ الْإِنْسَانِ مَبْلَغَ الدَّمِ، وَإِنِّي خَشِيتُ أَنْ يَقْذِفَ فِي قُلُوبِكُمَا شَيْئًا ».

صحيح البخاري | ٢٠٣٥ صحيح مسلم | ٥٦٧٩ سنن أبي داود | ٢٤٧٠ سنن ابن ماجه | ١٧٧٩ سنن الدارمي | ١٨٠٦ مسند أحمد | ٢٦٨٦٣

ئەم حدیثە **البخاري** لە ژێر ناونیشانی ئەم بابە هێناویەتی: **باب: هل يخرج المعتكف لحوائجه إلى باب المسجد؟**

**مالک بن أنس** دەڵێ: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات بۆ پێویستیەکانی ناچێتە دەرەوە، وە یارمەتی خەڵکی نادات ئیللا مەگەر بۆ قەزای حاجە بچێتە دەرەوە، خۆ ئەگەر ڕۆشتبایەتە دەرەوە ئەوە ئەو کەسەی پێویست بووایە بە سەردانی: نەخۆش و شوێنکەوتنی جەنازە و نوێژ کردن بوو لەسەری.

وە ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات، نابێتە خاوەنی ئیعتکاف هەتا واز لەو شتانە نەهێنێ کە پێویستە وازی لێ بهێنێ وەک: سەردانی نەخۆش، نوێژ کردن لەسەر جەنازە، وە چوونە ماڵەوە ئیللا بۆ قەزای حاجە نەبێ.

قَالَ مَالِكٌ: لَا يَأْتِي الْمُعْتَكِفُ حَاجَتَهُ، وَلَا يَخْرُجُ لَهَا، وَلَا يُعِينُ أَحَدًا إِلَّا أَنْ يَخْرُجَ لِحَاجَةِ الْإِنْسَانِ، وَلَوْ كَانَ خَارِجًا لِحَاجَةِ أَحَدٍ لَكَانَ أَحَقَّ مَا يُخْرَجُ إِلَيْهِ: عِيَادَةُ الْمَرِيضِ، وَالصَّلَاةُ عَلَى الْجَنَائِزِ وَاتِّبَاعُهَا .

قَالَ مَالِكٌ: وَلَا يَكُونُ الْمُعْتَكِفُ مُعْتَكِفًا حَتَّى يَجْتَنِبَ مَا يَجْتَنِبُ الْمُعْتَكِفُ مِنْ: عِيَادَةِ الْمَرِيضِ، وَالصَّلَاةِ عَلَى الْجَنَائِزِ، وَدُخُولِ الْبَيْتِ إِلَّا لِحَاجَةِ الْإِنْسَانِ .

الموطأ لمالک | ٧١١

عمرة دەڵێ: عائشة رضي الله عنها کاتێک لە ئیعتکافدا بوو تێدەپەڕی بەلای نەخۆشی خانەوادەکەی، بەڵام نە دەوەستا و هەواڵی نەدەپرسی.

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَن سُفيانَ، عَن عبدالله بن أَبي بكرٍ، عَن عَمرَة، عَن عائشَةَ، أَنَّها كانت تَمُرُّ بالمريض مِن أَهلها وهي مُعتَكِفة فلا تَعرض له.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٣٢

سعيد بن المسيب و عطاء بن أبي رباح دەڵێن: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات نابێ بەشداری جەنازە بکات، وە نابێ سەردانی نەخۆش بکات.

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَن سُفيانَ، عَنِ ابن جُريجٍ، عَنِ الزُّهريِّ، عَن سعيد بنِ المُسَيَّب، وعَن سُفيانَ، عَنِ ابن جُريجٍ، عَن عطاءٍ، قالا: المُعتَكِف لا يَشهَدُ جنازة، ولا يَعودُ مريضًا.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٣٣

إبن شهاب الزهري دەڵێ: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات نابێ بەشداری جەنازە بکات، وە نابێ سەردانی نەخۆش بکات، وە نابێ وەڵامی دەعوەت و بانگ کردن بداتەوە.

حَدَّثَنَا عبدالأعلى، عَن مَعمرٍ، عَنِ الزُّهريِّ، قال: لا يَتَّبعُ جنازةً، ولا يَعودُ مريضًا، ولا يُجيبُ دعوَة.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٣٤

**مجاهد** دەڵێ: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات شوێنی جەنازە ناکەوێ، وە سەردانی نەخۆش ناکات.

حَدَّثَنَا ابن عُيينة، عَنِ ابنِ أَبي نَجيحٍ، عَن مُجاهدٍ، قال: المُعتَكِف لا يَتَبعُ جنازةً، ولا يَعودُ مريضًا.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٣٥

**عروة بن الزبير** دەڵێ: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات وەڵامی دەعوەت و بانگ کردن ناداتەوە، وە سەردانی نەخۆش ناکات، وە بەشداری ناشتنی جەنازە ناکات.

حَدَّثَنَا وَكيعٌ، عَنِ هِشامٍ، عَن أَبيه، قال: لا يُجيبُ دَعوةً، ولا يَعودُ مريضًا، ولا يَحضُر جِنازةً.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٣٦

**سعيد بن جبير** دەڵێ: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات با بەشداری جمعة بکات، وە سەردانی نەخۆش بکات، وە وەڵامی ئیمام بداتەوە ئەگەر بانگی کرد.

حَدَّثَنَا هُشَيمٌ، أخبرنا الشَّيبانيُّ، عَن سَعيد بنِ جُبيرٍ، أَنَّه قال: لِيَشهدَ الجمعة ويعودَ المريض ويُجيبَ الإمام.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٢٢

**عامر الشعبي** دەڵێ: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات بۆ دەست بە ئاو گەیاندن دەچێتە دەرەوە، وە سەردانی نەخۆش دەکات، وە بەشداری جمعة دەکات، وە لە لای دەرگادا دەوەستێ.

حَدَّثَنَا ابنُ فُضَيلٍ، عَن مُطَرِّفٍ، عَنِ الشَعبيِّ، قال: يَخرجُ إلى الغائط ويعودُ المريض ويأتي الجمعة ويقومُ على الباب.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٢٦

**أبي سلمة بن عبدالرحمن** دەڵێ: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات سەردانی نەخۆش دەکات، بەشداری جمعة دەکات، وە لەگەڵ پیاودا دەوەستێ لە ڕێگادا وەڵامی پرسیاری دەداتەوە.

حَدَّثَنَا وَكِيعُ، عَن علي بنِ مباركٍ، عَن يحيى، عَن أبي سلمةَ، قال: المُعتكِف يعودُ المريض ويُشهد الجمعة ويقوم مع الرَّجُلِ في الطريق يُسائله.

المصنف لابن أبي شيبة | ٩٧٢٨

**شافعي** دەڵێ: کێشەی تێدا نییە مەرج دانان لە ئیعتکافی واجبدا، بۆ نمونە بڵێ: ئەگەر ڕووداوێک هاتە پێش ئەوە دەبێ بچمە دەرەوە.

ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات بۆ قەزای حاجەی دەست بە ئاو گەیاندن ئەگەر ویستی ئەوە دەتوانێ بچێتە ماڵەوە، یاخود غەیری ئەوە، وە دوای تەواو بوونی نەمێنێتەوە، وە کێشەی تێدا نییە هەواڵی نەخۆش بپرسێ کاتێک چوویە ماڵەوە.

وە نابێ سەردانی نەخۆش بکات، وە نابێ ئامادەی جەنازە بێ ئەگەر ئیعتکافی واجب بوو.

قال الشافعي: ولا بأسَ بالاشتراط في الاعتكاف الواجبِ، وذالکَ أن يقول: إن عَرَضَ لي عارض كانَ لي الخُروج.

ويخرجُ المُعتَكف لحاجته إلى البَولِ والغائط إلى بيته إن شاءَ، أو غيره، ولا يَمكثُ بعد فراغهِ مِن حاجَته، ولا بأسَ أن يسأل عَنِ المريض إذا دَخلَ منزله.

وَلا يعود المريضَ، وَلا يشهد الجنازة إذا كانَ اعتكافًا واجبًا.

كتاب الأم للشافعي | **(٦٦٠/١)**

**إسحاق بن راهوية** دەڵێ: ئەو کەسەی ئیعتکاف دەکات نابێ بچێتە دەرەوە ئیللا بۆ قەزای حاجە دەس بە ئاو گەیاندن نەبێ، یاخود چوون بۆ جمعة ئەمە جائزە، با کاتی بانگ دوای تێپەڕبوونی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسماندا بچێ، ئەمما سەردانی نەخۆش و ئامادەی جەنازە ئەوە ناتوانێ ئیللا مەگەر بە مەرجی دانابێ .

قال إسحاق: لا يخرج المُعتَكِف إلا لغائط أو بَول أو خروج إلى الجمعة فجائز، وليخرج نحو الزوال أحب إلينا، فأما عيادة المرضى وشهود الجنائز فلا يفعل حتى يشترط.

مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية الكوسج | ٧٩٣

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: عمر بن الخطاب رضي الله عنه وتی ئەی ڕەسولی الله، من لە سەردەمی جاهلیەتدا نەزرم کردووە شەوێک لە مسجد الحرام ئیعتکاف بکەم. فەرمووی: « نەزرەکەت جێبەجێ بکە ».

عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِاللَّهِ بْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ لَيْلَةً فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ. فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: « **أَوْفِ نَذْرَكَ** ». فَاعْتَكَفَ لَيْلَةً.

صحيح البخاري | ٢٠٢٤ صحيح مسلم | ٤٢٩٢ سنن أبي داود | ٣٣٢٥ سنن الترمذي | ١٦٢٠ سنن ابن ماجه | ١٧٧٢ سنن الدارمي | ٢٣٧٨ مسند الشافعي | ٣٠٨ مسند أحمد | ٢٥٥ سنن الدارقطني باب الاعتكاف | ٢

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما بۆی گێڕامەوە، دەڵێ: عمر بن الخطاب پرسیاری کرد لە ڕەسول الله ﷺ کاتێک لە جعرانة بوو دوای ئەوەی لە طائف گەڕابوویەوە، وتی: ئەی ڕەسولی الله، من لە سەردەمی جاهلیدا نەزرم کرد ڕۆژێک لە مسجد الحرام ئیعتکاف بکەم، پێت چۆنە؟

فەرمووی: « بڕۆ ڕۆژێک ئیعتکاف بکە ». وە ڕەسول الله ﷺ کچۆڵەیەکی پێدابوو لە سەبایای غەزاکە، کاتێک ڕەسول الله ﷺ سەبایاکانی ئازاد کرد عمر بن الخطاب دەنگیانی بیست دەیانوت: ڕەسول الله ﷺ ئازادی کردین. وتی: ئەمە چییە؟ وتیان: ڕەسول الله ﷺ سەبایاکانی ئازاد کردووە. عمر وتی: ئەی عبدالله بڕۆ بۆ لای ئەو کچۆڵەیە ئازادی بکە.

عَنْ جَرِيرُ بْنُ حَازِمٍ، أَنَّ أَيُّوبَ حَدَّثَهُ، أَنَّ نَافِعًا حَدَّثَهُ، أَنَّ عَبْدَاللَّه بْنَ عُمَرَ حَدَّثَهُ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ سَأَلَ رَسُولَ اللهِ ﷺ وَهُوَ بِالْجِعْرَانَةِ بَعْدَ أَنْ رَجَعَ مِنَ الطَّائِفِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنِّي نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ يَوْمًا فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَكَيْفَ تَرَى؟ قَالَ: « اذْهَبْ فَاعْتَكِفْ يَوْمًا ». قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّه ﷺ قَدْ أَعْطَاهُ جَارِيَةً مِنَ الْخُمْسِ فَلَمَّا أَعْتَقَ رَسُولُ اللهِ ﷺ سَبَايَا النَّاسِ سَمِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ أَصْوَاتَهُمْ يَقُولُونَ: أَعْتَقَنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ. فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقَالُوا: أَعْتَقَ رَسُولُ اللَّه ﷺ سَبَايَا النَّاسِ. فَقَالَ عُمَرُ: يَا عَبْدَاللَّه، اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْجَارِيَةِ فَخَلِّ سَبِيلَهَا.

صحيح مسلم | ٤٢٩٤



# ئیعتکافی ئەو ئافرەتانەی خوێنی بەردەوامیان هەیە

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: یەکێک لە خێزانەکانی ڕەسول الله ﷺ لە ئیعتکافدا بوو لەگەڵ ئەوەشدا مستحاضة بوو خوێنی بەردەوامی هەبوو، خوێنی دەبینی لەگەڵ زەردایی، تەشتێک لە ژێریدا دانرا بوو، هەروەها نوێژیشی دەکرد.

عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا: اعْتَكَفَتْ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ امْرَأَةٌ مِنْ أَزْوَاجِهِ مُسْتَحَاضَةٌ، فَكَانَتْ تَرَى الدَّمَ وَالصُّفْرَةَ وَالطَّسْتَ تَحْتَهَا، وهِيَ تُصَلِّي.

صحيح البخاري | ٢٠٣٧ سنن أبي داود | ٢٤٧٦ وابن ماجه | ١٧٨٠ وأحمد | ٢٤٩٩٨



# شەوی قەدر

لە ڕاستیدا ئەوەی کە بە دیاریکراوی نازانین شەوی قەدر کام شەوەیە خێری ئیمانداارانی تێدایە بۆ ئەوەی هەر دە شەوەکە دابنیشن و بە عیبادەت زیندووی بکەنەوە و هەوڵی بۆ بدەن، خۆ ئەگەر دیار بووایە کامەیانە ئەوە خەڵکی بەس ئەو شەوەیان زیندوو دەکردەوە شەوەکانی تر دەخەوتن.

زۆربەی خەڵکی پێیان وایە شەوی قەدر هەموو ساڵێک جێگیرە و لە شەوێکدایە، بەڵام ئەمە دروست نییە، چونکە کاتێک سەیری هەموو حدیثەکان دەکەی دەبینی ئەو شەوە جێگر نییە و گۆڕانکاری بەسەردا دێ هەر ساڵێک دەکەوێتە شەوێکەوە. ئەوەی زانراوە حدیثی لەسەر هاتووە بەم جۆرەیە:

**یەکەم**: دەکەوێتە دە شەوی کۆتایی لە شەوە تاکەکانیدا.

**دووەم**: دەکەوێتە حەوت شەوی کۆتایی.

**سێهەم**: دەکەوێتە شەوی بیست و یەک.

**چوارەم**: دەکەوێتە شەوی بیست و سێ.

**پێنجەم**: دەکەوێتە شەی بیست و پێنج.

**شەشەم**: دەکەوێتە شەوی بیست و حەوت.

**حەوتەم**: دەکەوێتە شەوی بیست و نۆ .

**عائشة** رضي الله عنها دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: بە دوای شەوی قەدر بگەڕێن لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزاندا لە شەوە تاکەکاندا.

عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: « **تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْوِتْرِ مِنَ الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ** ».

صحيح البخاري | ٢٠١٧ صحيح مسلم | ٢٧٧٦ سنن الترمذي | ٨٠٢ مسند أحمد | ٢٤٤٤٥ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦١٥

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: زۆربەی ڕیوایەتەکان لە ڕەسول الله ـوە ﷺ فەرموویەتی: « **الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ فِي كُلِّ وِتْرٍ** ». وە لە ڕەسول الله ـوە ﷺ ڕیوایەت کراوە کە شەوی بیست و یەک، بیست و سێ، بیست و پێنج، بیست و حەوت، بیست نۆ، وە کۆتا شەوی ڕەمەزانە. شافعي دەڵێ: بەلای منەوە بەم جۆرەیە والله أعلم

ڕەسول اللە ﷺ بەو جۆرە وەڵامی داوەتەوە کە پرسیاری لێکراوە، پێی وتراوە: لە چ شەوێکدا بە دوایەوە بین؟ ئەویش فەرموویەتی: « لە فڵانە شەودا بە دوایەوە بن ». شافعي دەڵێ: بەهێزترین ڕیوایەت لای من شەوی بیست و یەکە. وە ڕیوایەت کراوە لە أبي بن کعب رضي الله عنه سوێندی خواردووە شەوی بیست و حەوتە، وە وتوویەتی: ڕەسول الله ﷺ هەوالی پێداین دەربارەی نیشانەکەی، ئێمەش ژماردمان و لەبەرمان کرد. وە لە أبي قلابة ڕیوایەت کراوە وتوویەتی: شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتاییدا دەگوازرێتەوە و جێگیر نییە.

وَأَكْثَرُ الرِّوَايَاتِ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: « **الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ فِي كُلِّ وِتْرٍ** ». وَرُوِيَ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ أَنَّهَا لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَلَيْلَةُ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ، وَخَمْسٍ وَعِشْرِينَ، وَسَبْعٍ وَعِشْرِينَ، وَتِسْعٍ وَعِشْرِينَ، وَآخِرُ لَيْلَةٍ مِنْ رَمَضَانَ. قَالَ الشَّافِعِيُّ: كَأَنَّ هَذَا عِنْدِي، وَاللَّهُ أَعْلَمُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُجِيبُ عَلَى نَحْوِ مَا يُسْأَلُ عَنْهُ، يُقَالُ لَهُ: نَلْتَمِسُهَا فِي لَيْلَةِ كَذَا؟ فَيَقُولُ: « **الْتَمِسُوهَا فِي لَيْلَةِ كَذَا** ». قَالَ الشَّافِعِيُّ: وَأَقْوَى الرِّوَايَاتِ عِنْدِي فِيهَا لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ أَنَّهُ كَانَ يَحْلِفُ أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، وَيَقُولُ: أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللهِ

ﷺ بِعلَامَتِهَا، فَعدَدْنَا، وَحَفِظْنَا. وَرُوِيَ عَنْ أَبِي قِلَابَةَ أَنَّهُ، قَالَ: لَيْلَةُ الْقَدْرِ تَنْتَقِلُ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ .

**جابر بن سمرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: بە دوای شەوی قەدر بگەڕێن لە دە شەوی کۆتاییدا.

عَنْ جَابِرَ بْنُ سَمُرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: « **إِلْتَمِسُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي عَشْرِ الْأَوَاخِرِ** ».

مسند أبي داود الطيالسي | ٨١٥

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: لە خەومدا شەوی قەدرم نیشاندرا، پاشان یەکێک لە خێزانەکانم خەبەری کردمەوە ئیتر بیرم چوویەوە، لە دە شەوی کۆتاییدا بە دوایدا بگەڕێن.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: «**رَأَيْتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، ثُمَّ أَيْقَظَنِي بَعْضُ أَهْلِي فَنَسِيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْغَوَابِرِ**».

صحيح مسلم | ٢٧٦٨ سنن الدارمي | ١٨٠٨

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: پیاوانێک لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ لە خەودا شەوی قەدریان دیبوو دەکەوێتە حەوت شەوی کۆتایی، ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « وای دەبینم ئەم خەوەی پێکەوە دیوتانە غەڵەت نابێ، هەرکەس لە ئێوە بە دوای شەوی قەدردا دەگەڕێ ئەوە با لە حەوت شەوی کۆتاییدا بە دوایەوەبێ ».

عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رِجَالًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ أُرُوا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي الْمَنَامِ فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ، فَقَالَ رَسُولُ الله ﷺ: « **أَرَى رُؤْيَاكُمْ قَدْ تَوَاطَأَتْ فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ، فَمَنْ كَانَ مُتَحَرِّيهَا فَلْيَتَحَرَّهَا فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ** ».

صحيح البخاري ا ٢٠١٥ صحيح مسلم ا ٢٧٦١ مسند أحمد ا ٤٤٩٩ المصنف لعبدرزاق ا ٧٨١٥ مسند الحميدي ا ٦٤٧

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: بە دوای شەوی قەدردا بگەڕێن لە حەوت شەوی کۆتاییدا.

عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ دِينَارٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا،قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **تَحَرَّوْا لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي السَّبْعِ الْأَوَاخِرِ** ».

صحيح مسلم | ٢٧٦٢ سنن أبي داود | ١٣٨٥ سنن الدارمي | ١٨٠٩ مسند أحمد | ٥٩٣٢ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦١٤

**أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە دە شەوی وەسەطی ڕەمەزان ئیعتکافی دەکرد، وە کاتێک شەوی بیستەم تێ دەپەڕی و شەوی بیست و یەک ڕووی تێ دەکرد دەگەڕایەوە بۆ شوێنی مانەوەکەی ئەوانەشی لەگەڵیدا ئیعتکافیان کردبوو گەڕانەوە، جا لە مانگێکی ڕەمەزان ئیعتکافی کرد پاشان وتاری بۆ خەڵکیدا و فەرمانی پێ کردن بەوەی الله دەیەوێ، پاشان وتی: « من ئەم دە شەوە ئیعتکافم کردووە، بەڵام بۆم دەرکەوت و پێم باشە ئەم دە شەوەی کۆتاییش بمێنمەوە، هەرکەسێک ئیعتکافی کردووە با لە شوێنی خۆی بمێنێتەوە، من شەوی قەدرم نیشاندرا، بەڵام بیرم چوویەوە، لە دە شەوی کۆتاییدا بە دوایەوە بن، لە شەوە تاکەکاندا بە دوایەوە بن، بینیم نوێژی بەیانی شەوی قەدر لە ناو ئاوو قوڕاودا سوجدەم دەبرد ». أبو سعید دەڵێ: لە شەوی بیست و یەکدا باران باری مزگەوت تکەی کرد لە شوێنی نوێژی ڕەسول الله ﷺ، سەیری ڕەسول الله ـم کرد ﷺ کاتێک دوای نوێژی بەیانی دەچوویەوە ڕوومەتی تەڕ بوو بە قوڕ و ئاو.

عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُجَاوِرُ فِي رَمَضَانَ الْعَشْرَ الَّتِي فِي وَسَطِ الشَّهْرِ، فَإِذَا كَانَ حِينَ يُمْسِي مِنْ عِشْرِينَ لَيْلَةً تَمْضِي وَيَسْتَقْبِلُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ رَجَعَ إِلَى مَسْكَنِهِ، وَرَجَعَ مَنْ كَانَ يُجَاوِرُ مَعَهُ، وَأَنَّهُ أَقَامَ فِي شَهْرٍ جَاوَرَ فِيهِ اللَّيْلَةَ الَّتِي كَانَ يَرْجِعُ فِيهَا، فَخَطَبَ النَّاسَ فَأَمَرَهُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ قَالَ: « **كُنْتُ أُجَاوِرُ هَذِهِ الْعَشْرَ، ثُمَّ قَدْ بَدَا لِي أَنْ أُجَاوِرَ هَذِهِ الْعَشْرَ الْأَوَاخِرَ، فَمَنْ كَانَ اعْتَكَفَ مَعِي فَلْيَثْبُتْ فِي مُعْتَكَفِهِ، وَقَدْ أُرِيتُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، فَابْتَغُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، وَابْتَغُوهَا فِي كُلِّ وِتْرٍ، وَقَدْ رَأَيْتُنِي أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ** ». قَالَ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيُّ: مُطِرْنَا لَيْلَةَ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ فِي مُصَلَّى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ، وَقَدِ انْصَرَفَ مِنْ صَلَاةِ الصُّبْحِ، وَوَجْهُهُ مُبْتَلٌّ طِينًا وَمَاءً .

صحيح البخاري | ٢٠٢٧ صحيح مسلم | ٢٧٦٩ سنن أبي داود | ١٣٨٢ سنن النسائي | ١٣٥٦ سنن ابن ماجه | ١٧٦٦ الموطأ لمالك | ٧١٨ مسند أحمد | ١١١٨٦ مسند أبي داود الطيالسي | ٢٣٠١ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٢١ مسند الحميدي | ٧٧٤

**عبدالله بن أنيس** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « لە خەودا شەوی قەدرم بینی دواتر بیرم چوویەوە، پێم نیشاندرا نوێژی بەیانی لە ناو قوڕ و ئاودا دەکەم » عبدالله بن أنيس دەڵێ: شەوی بیست و سێ باران باری، ڕەسول الله ﷺ نوێژی بەیانی بۆ کردین کاتێک ڕۆیشتەوە بۆماڵەوە قوڕ و ئاو بە تەوێڵ و لووتیەوە بوو.

عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ أُنَيْسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: « **أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، وَأَرَانِي صُبْحَهَا أَسْجُدُ فِي مَاءٍ وَطِينٍ** ». قَالَ: فَمُطِرْنَا لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ، فَصَلَّى بِنَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَانْصَرَفَ وَإِنَّ أَثَرَ الْمَاءِ وَالطِّينِ عَلَى جَبْهَتِهِ وَأَنْفِهِ.

صحيح مسلم | ٢٧٧٥ سنن أبي داود | ١٣٧٩ مسند حمد | ١٦٠٤٥

**الأسود** دەڵێ: عائشة رضي الله عنها خەبەری دەکردینەوە لە شەوی بیست و سێ ـی ڕەمەزاندا.

عَنِ الثَّوْرِيِّ، عَنْ مَنْصُورٍ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، عَنِ الْأَسْوَدِ، قَالَ: كَانَتْ عَائِشَةُ تُوقِظُنَا لَيْلَةَ ثَلَاثٍ وَعِشْرِينَ مِنْ رَمَضَانَ .

المصنف لعبدرزاق | ٧٨٣١ المصنف لابن أبي شيبة | ٦٩٣٠

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان بە دوای شەوی قەدردا بگەڕێن، نۆ ڕۆژی بمێنێ، حەوت ڕۆژی بمێنێ ، پێنج ڕۆژی بمێنێ.

حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ، قَالَ: « **الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، فِي تَاسِعَةٍ تَبْقَى، فِي سَابِعَةٍ تَبْقَى، فِي خَامِسَةٍ تَبْقَى** ».

صحيح البخاري ا ٢٠٢١ سنن أبي داود ا ١٣٨١ مسند أحمد ا ٢٥٢٠

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: شەوی قەدر لە دە شەوی کۆتاییدایە، نۆ ڕۆژی تێپەڕی بێ، یاخود حەوت ڕۆژی مابێ.

حَدَّثَنَا عَاصِمٌ، عَنْ أَبِي مِجْلَزٍ وَعِكْرِمَةَ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **هِيَ فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، هِيَ فِي تِسْعٍ يَمْضِينَ، أَوْ فِي سَبْعٍ يَبْقَيْنَ. يَعْنِي لَيْلَةَ الْقَدْرِ** ».

صحيح البخاري ا ٢٠٢٢ مسند أحمد ا ٢٥٤٣

**عبادة بن صامت** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ هاتە دەرەوە شەوی قەدرمان پێ بڵێ، بەڵام دوو پیاو لە صەحابە دەمە قاڵێیان بوو، فەرمووی: «هاتمە دەرەوە پێتان بڵێم شەوی قەدر کام شەوەیە، بەڵام فلان و فلان دەمە قاڵێیان بوو ئیتر بیرم چوویەوە، بەشکو خێری تێدابێ بۆتان، لە شەوانی بیست و یەک، بیست و سێ، بیست و پینج بە دوایدا بگەڕێن».

عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: خَرَجَ النَّبِيُّ ﷺ لِيُخْبِرَنَا بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَتَلَاحَى رَجُلَانِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، فَقَالَ: « **خَرَجْتُ لِأُخْبِرَكُمْ بِلَيْلَةِ الْقَدْرِ، فَتَلَاحَى فُلَانٌ وَفُلَانٌ فَرُفِعَتْ، وَعَسَى أَنْ يَكُونَ خَيْرًا لَكُمْ، فَالْتَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالْخَامِسَةِ** ».

صحيح البخاري | ٢٠٢٣ الموطأ لمالك | ٧٢٢ سنن الدارمي | ١٨٠٧ مسند أحمد | ٢٢٦٧٢ مسند أبي داود الطيالسي | ٥٧٧ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٦٠١

**أبي نضرة** دەڵێ: أبي سعيد الخدري دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە دە شەوی وەسەطی ڕەمەزان ئیعتکافی کرد، بە دوای شەوی قەدردا دەگەڕا پێش ئەوەی بۆی دەربکەوێ لە چ شەوێکدایە، کاتێک دە شەوەکە تەواو بوو،

فەرمانی کرد شوێنی مانەوەکەی تێک بدرێ، پاشان بۆی دەرکەوت لە دە شەوی کۆتاییدایە، فەرمانی کرد شوێنی ئیعتکافەکەیان بۆ ڕێکخستەوە، پاشان هاتە دەرەوە بۆ لای خەڵکی، فەرمووی: « ئەی خەڵکینە شەوی قەدرم بۆ دەرکەوت، هاتمە دەرەوە پێتانی بڵێم، دوو پیاو هاتن هەریەکە داوای حەقی خۆی دەکرد لەویتریان شەیتان لەگەڵیان بوو، ئیتر بیرم چوویەوە، لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان بە دوایدا بگەڕێن، بە دوایەوە بن لە نۆ و حەوت و پێنج ». وتم: یا أبا سعید ئێوە لە ئێمە شارەزاترن بە ژمارە، وتی: بەڵێ. ئێمە لەپێشترین بەوە هەتا ئێوە، وتم: مەبەست چییە لە نۆ و حەوت و پێنج؟ وتی: ئەگەر بیست و یەک تێپەڕی ، ئەوەی بە دوایدا دێ بیست و دووە ئەمە واتە نۆ، ئەگەر بیست و سێ تێپەڕی ئەوەی بە دوایدا دێ حەوتە، ئەگەر بیست و پێنج تێپەڕی، ئەوەی بە دوایدا دێ پێنجە.

عَنْ أَبِي نَضْرَةَ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللَّه ﷺ الْعَشْرَ الْأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ، يَلْتَمِسُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ قَبْلَ أَنْ تُبَانَ لَهُ، فَلَمَّا انْقَضَيْنَ، أَمَرَ بِالْبِنَاءِ فَقُوِّضَ، ثُمَّ أُبِينَتْ لَهُ، أَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، فَأَمَرَ بِالْبِنَاءِ فَأُعِيدَ، ثُمَّ خَرَجَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهَا كَانَتْ أُبِينَتْ لِي لَيْلَةُ الْقَدْرِ، وَإِنِّي خَرَجْتُ لِأُخْبِرَكُمْ بِهَا، فَجَاءَ رَجُلَانِ

يَحْتَقَّانِ مَعَهُمَا الشَّيْطَانُ، فَنُسِّيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، الْتَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالْخَامِسَةِ ». قَالَ: قُلْتُ: يَا أَبَا سَعِيدٍ، إِنَّكُمْ أَعْلَمُ بِالْعَدَدِ مِنَّا، قَالَ: أَجَلْ. نَحْنُ أَحَقُّ بِذَلِكَ مِنْكُمْ، قَالَ: قُلْتُ: مَا التَّاسِعَةُ وَالسَّابِعَةُ وَالْخَامِسَةُ؟ قَالَ: إِذَا مَضَتْ وَاحِدَةٌ وَعِشْرُونَ، فَالَّتِي تَلِيهَا ثِنْتَيْنِ وَعِشْرِينَ وَهِيَ التَّاسِعَةُ، فَإِذَا مَضَتْ ثَلَاثٌ وَعِشْرُونَ، فَالَّتِي تَلِيهَا السَّابِعَةُ، فَإِذَا مَضَى خَمْسٌ وَعِشْرُونَ، فَالَّتِي تَلِيهَا الْخَامِسَةُ.

صحيح مسلم | ٢٧٧٤ سنن أبي داود | ١٣٨٣ مسند أحمد | ١١٠٧٦

**زر بن حبيش** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أبي بن كعب رضي الله عنه وتم: براکەت عبدالله بن مسعود رضي الله عنه دەڵێ: هەرکەسێک هەموو شەوەکانی ساڵ بمێنێتەوە ئەوە شەوی قەدری بە نیسب دەبێ، وتی: بۆیە وای وتووە ویستوویەتی خەڵک تەمەڵ نەبێ لە عیبادەت، ئەگینا ئەو دەزانێ لە ڕەمەزاندایە، وە لە دە شەوی کۆتاییدایە، وە شەوی بیست و حەوتە، پاشان بە بێ ئەوەی إن شاء الله بکات سوێندی خوارد شەوی قەدر شەوی بیست و حەوتە. وتم: یا أبا المنذر بە چ بەڵگەیەک وا دەڵێی؟ وتی: بە نیشانەکەیدا ڕەسول الله ﷺ هەواڵی پێداین بەیانییەکەی خۆر هەڵدێ تیشکی نییە.

عَنْ عَبْدَةَ وَعَاصِمِ بْنِ أَبِي النَّجُودِ، سَمِعَا زِرَّ بْنَ حُبَيْشٍ، يَقُولُ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَقُلْتُ: إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ، يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، فَقَالَ: رَحِمَهُ اللَّهُ، أَرَادَ أَنْ لَا يَتَّكِلَ النَّاسُ، أَمَا إِنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِي رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، ثُمَّ حَلَفَ لَا يَسْتَثْنِي، أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، فَقُلْتُ: بِأَيِّ شَيْءٍ تَقُولُ ذَلِكَ يَا أَبَا الْمُنْذِرِ؟ قَالَ: بِالْعَلَامَةِ، أَوْ بِالْآيَةِ الَّتِي أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ، أَنَّهَا تَطْلُعُ يَوْمَئِذٍ لَا شُعَاعَ لَهَا.

صحيح مسلم ا ٢٧٧٧ سنن أبي داود ا ١٣٧٨ سنن الترمذي ا ٨٠٤ مسند أحمد ا ٢١١٩٧ المصنف لعبدرزاق ا ٧٨٣٦ مسند الحميدي ا ٣٧٩

**زر بن حبيش** دەڵێ: بيستم أبي بن كعب رضي الله عنه دەيوت: شەوی قەدر شەوی بيست و حەوتە.

حَدَّثَنَا مروان بن مُعاوية، عَنِ ابن أَبي خالد، عَن زِرٍّ، قال: سمعت أُبي بن كَعبٍ، يقول: ليلةُ القدرِ ليلةُ سبعٍ وعشرين.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٩٦٢٠

أبا العالية دەڵێ: پیاوێکی دەشتەکی هاتە خزمەت ڕەسول الله ﷺ لەکاتێکدا نوێژی دەکرد، پێی وت: کەی شەوی قەدرە؟ فەرمووی: بە دوایا بگەڕێن لە شەوی یەکەم و کۆتا شەو، وە شەوە تاکەکان.

حَدَّثنا مسلم بن إبراهيم، حَدَّثنا أبو خَلدة، سمعت أبا العالية يُحدث أنَّ أعرابيًا أتى النبي ﷺ وَهو يُصلِّي، فقال له: متى ليلةُ القدرِ؟ فقال: «اطلُبُوهَا في أَوَّلِ لَيلَةٍ وَآخرِ لَيلَة، وَالوتِرِ مِنَ الليالي».

مراسيل لأبي داود | ٧٩



# دەرگای ڕەیان دەرگایەک بۆ ڕۆژووەوانان

**سهل بن سعد** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: لە بەهەشتدا دەرگایەک هەیە پێی دەوترێ: ڕەیان، لە ڕۆژی قیامەتدا ڕۆژووەوانان لێوەی دەچنە ژوورەوە، بێجگە لەوان هیچ کەسی تر ناتوانێ لێوەی بچێتە ژوورەوە، دەوترێ: کوان ڕۆژووەوانان؟ ئەوانیش هەڵدەستنەوە بەس ئەوان دەچنە ژوورەوە، کاتێک داخڵ دەبن ئیتر دادەخرێ ناهێڵدرێ کەسی تر لێوەی بچێتە ژوورەوە.

عَنْ سَهْلٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ، قَالَ: « **إِنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ لَهُ: الرَّيَّانُ، يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، لَا يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، يُقَالُ: أَيْنَ الصَّائِمُونَ؟ فَيَقُومُونَ لَا يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ، فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ** ».

صحيح البخاري | ١٨٩٦ صحيح مسلم | ٢٧١٠ سنن الترمذي | ٧٧٥ سنن النسائي | ٢٢٣٦ سنن ابن ماجه | ١٦٤٠ مسند أحمد | ٢٢٨١٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٨٩٨٧ صحيح ابن خزيمة | ١٩٠٢

# زەکاتی سەرفیترە

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەڕز کرد صاعێک لە خورما یاخود صاعێک لە جۆ لەسەر هەموو موسڵمانێکی ئازاد و کۆیلە و مێینە و نێرینە.

عَنْ مَالِكٌ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيرٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ، أَوْ عَبْدٍ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ.

صحيح البخاري ا ١٥٠٤ صحيح مسلم ا ٢٢٧٨ سنن أبي داود ا ١٦١١ سنن الترمذي ا ٦٨٣ سنن ابن ماجه ا ١٨٢٦ سنن النسائي ا ٢٥٠٣ الموطأ لمالک ا ٦٤١ سنن الدارمي ا ١٦٨٧ مسند أحمد ا ٥٣٠٣ كتاب الأم للشافعي ا ٨٦٠ المصنف لعبدرزاق ا ٥٨٣٩ المصنف لابن أبي شيبة ا ١٠٤٥١

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەڕز کرد صاعێک لە جۆ یاخود صاعێک لە خورما، لەسەر بچووک و گەورە، وە ئازاد و کۆیلە.

عَنْ عُبَيْدِاللَّه، قَالَ: حَدَّثَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: فَرَضَ رَسُولُ اللهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، عَلَى الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ.

صحيح البخاري | ١٥١٢ صحيح مسلم | ٢٢٧٩ سنن أبي داود | ١٦١٣ سنن النسائي | ٢٥٠٥ مسند أحمد | ٥١٧٤ سنن الدارقطني كتاب زكاة الفطر | ٥

صاعێک چوار مشت دەکات بە دەستێکی مام ناوەند، تەقریبەن سێ کیلۆ دەکات.

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما هەمیشە زەکاتی سەرفیترەی بە خورما دەیدا بێجگە لە جارێک نەبێ کە بە جۆ سەفیترەکەی دەرکرد.

عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَاللَّه بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا كَانَ لَا يُخْرِجُ فِي زَكَاةِ الْفِطْرِ إِلَّا التَّمْرَ إِلَّا مَرَّةً وَاحِدَةً، فَإِنَّهُ أَخْرَجَ شَعِيرًا .

الموطأ لمالک | ٦٤٣

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەڕز کرد لەسەر نێرینە و مێینە، ئازاد و کۆیلە،

صاعێک بوو لە خورما یاخود صاعێک لە جۆ، دواتر خەڵکی لە جیاتی ئەوە نیو صاع گەنمیان دەدا، وە عبدالله بن عمر رضي الله عنهما زەکاتی سەرفیترەی بە خورما دەردەکرد هەتا جارێک خورما دەست نەکەوت لە مەدینە، ئەوکات سەرفیترەکەی بە جۆ دەرکرد، وە عبدالله بن عمر رضي الله عنهما سەرفیترەی گەورە و بچووکیشی دەدا، هەتا سەرفیترەی کوڕەکانی منیشی دەدا. وە عبدالله بن عمر رضي الله عنهما سەرفیترەکەی دەدایە ئەو کەسانەی تایبەت کرابوون بە کۆکردنەوەی، ئەوانیش ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ پێش جەژن دەریان دەکرد.

عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: فَرَضَ النَّبِيُّ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ -أَوْ قَالَ: رَمَضَانَ- عَلَى الذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، فَعَدَلَ النَّاسُ بِهِ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ، فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُعْطِي التَّمْرَ فَأَعْوَزَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنَ التَّمْرِ، فَأَعْطَى شَعِيرًا، فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُعْطِي عَنِ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، حَتَّى إِنْ كَانَ يُعْطِي عَنْ بَنِيَّ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُعْطِيهَا الَّذِينَ يَقْبَلُونَهَا، وَكَانُوا يُعْطُونَ قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ .

صحيح البخاري | ١٥١١ صحيح مسلم | ٢٢٨٠ مسند أحمد | ٤٤٨٦ المصنف لعبدرزاق | ٥٩١٥

**أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە زەکاتی سەرفیترەمان دەردەکرد صاعێک بوو لە خواردن، یاخود صاعێک لە جۆ، یاخود صاعێک لە خورما، یاخود صاعێک لە کەشک، یاخود صاعێک لە مێوژ.

عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِاللهِ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ الْعَامِرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ: كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ.

صحيح البخاري | ١٥٠٦ صحيح مسلم | ٢٢٨٣ الموطأ لمالک | ٦٤٢ سنن الدارمي | ١٦٩٠ كتاب الأم للشافعي | ٨٦٢ المصنف لابن أبي شيبة | ١٠٤٥٢

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ زەکاتی سەرفیترەی فەڕز کرد صاعێک بوو لە خورما، یاخود صاعێک لە جۆ. **عبدالله** رضي الله عنه دەڵێ: دواتر خەڵکی لەجیاتیدا دوو مشت گەنمیان دەدا.

عَنِ اللَّيْثُ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ عَبْدِاللهَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: أَمَرَ النَّبِيُّ ﷺ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ صَاعَاً مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيرٍ. قَالَ عَبْدُاللهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: فَجَعَلَ النَّاسُ عِدْلَهُ مُدَّيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ.

صحيح البخاري | ١٥٠٧ صحيح مسلم | ٢٢٨١ مسند أحمد | ٤٤٨٦ المصنف لعبدرزاق | ٥٨٤٠

**أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە ڕەسول الله ﷺ لە ناوماندا بوو زەکاتی سەرفیترەمان دەردەکرد لەسەر هەموو گەورە و بچووکێک، ئازاد و کۆیلەیەک، صاعێک بوو لە خواردن، یاخود صاعێک لە کەشک، یاخود صاعێک لە جۆ، یاخود صاعێک لە گەنم، یاخود صاعێک لە مێوژ، بەردەوام بەم جۆرە دەرمان دەکرد هەتا لە شامەوە معاوية بن أبي سفيان هات بۆ سەفەری حەج یاخود عەمرە، لە سەر مینبەر قسەی کرد بۆ خەڵکی، یەکێک لەو قسانەی کردی، وتی: وای دەبینم دوو مشت گەنمی شام یەکسان دەبێ بە صاعێک لە خورما، ئیتر خەڵکی دەستیان پێوەگرت. أبو سعيد دەڵێ: ئەمما من ئەوە هەتا لە ژیاندا مابم بەو جۆرە دەیدەم کە پێشتر دەرم کردووە.

عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِاللهِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللهِ ﷺ زَكَاةَ الْفِطْرِ، عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ، حُرٍّ أَوْ مَمْلُوكٍ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، فَلَمْ نَزَلْ نُخْرِجُهُ حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِي سُفْيَانَ حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، فَكَلَّمَ النَّاسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ، أَنْ قَالَ: إِنِّي أَرَى أَنَّ مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَمَّا أَنَا، فَلَا أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ أَبَدًا مَا عِشْتُ.

صحيح البخاري | ١٥٠٨ صحيح مسلم | ٢٢٨٤ سنن أبي داود | ١٦١٦ سنن الترمذي | ٦٧٩ سنن ابن ماجه | ١٨٢٩ سنن الدارمي | ١٦٨٩ المصنف لعبدرزاق | ٥٨٥٧

وەک دەبینین لە حدیثەکان ئەوەی ڕوونە لە زەکاتی سەرفیترە باس باسی خواردنە، واتە هەر کەسێک چی دەخوات لەوە دەیدات، بە هیچ جۆرێک باسی قیمەت نەکراوە، چونکە زەکاتی سەرفیترە پەیوەندی بە عیبادەتێکەوە هەیە گرێدراوە بە خواردنەوە نەک نرخ، کەواتە دەبێ لە خواردن بدرێ، ئەمە بۆ زەکاتەکانی تریش بەهەمان شێوەیە، بۆ نمونە

کەسێک پارەی هەیە مەبلەغێکی زۆر زەکاتی تێدا واجب بووە، ئەصڵ ئەوەیە زەکاتەکە بە پارە بدات نەک هەستێت بچێ پارەکە بکات بە خواردن ئەنجا وەک زەکات بیدات!

ئەگەر هاتوو کەسێک بڵێ: دەی خۆ لەسەردەمی تابعین هەندێکیان فەتوایان داوە زەکاتی سەرفیترە نرخەکەی بدرێ لەجیاتی خۆراک، وەک: « عمر بن عبدالعزیز، الحسن البصري، أبا إسحاق السبيعي ». وەک ئەم خەبەرانەی خوارەوە کە ابن أبي شيبة هێناویەتی:

حَدَّثنا أَبو أُسامَةَ، عَن عَوفٍ، قال: سمعتُ كِتابَ عمرَ بنِ عبدالعزيزِ يُقرأ إلى عَدِيٍّ بالبصرةِ يُؤخذُ مِن أَهلِ الدِّيوانِ مِن أَعطياتهم، عَن كُلِّ إنسانٍ نِصفُ درهمٍ.

المصنف لابن أبي شيبة ١٠٤٦٤

حَدَّثنا وَكيعٌ، عَن قُرَّةَ، قال: جاءنا كِتابُ عمرَ بنِ عبدالعزيزِ في صدقةِ الفِطرِ نِصفُ صاعٍ عَن كُلِّ إنسانٍ أَو قيمته نِصفُ درهمٍ.

المصنف لابن أبي شيبة ١٠٤٦٥

حَدَّثنا وَكيعٌ، عَن سفيانَ، عَن هِشامٍ، عَنِ الحَسَنِ، قال: لا بأسَ أن تُعطيَ الدَّراهِمَ في صدقة الفِطرِ.

المصنف لابن أبي شيبة | ١٠٤٦٦

حَدَّثنا أبو أُسامةَ، عَن زُهيرٍ، قال: سمعتُ أبا إسحاقَ، يقول: أدرَكتُهم وَهُم يُعطونَ في صدَقةِ رمضان الدَّراهمَ بقيمَةِ الطعامِ.

المصنف لابن أبي شيبة | ١٠٤٦٧

لە وەڵامدا دەڵێم: ئەوانە تابعین ڕەحمەتی اللە ـیان لێبێ، بەڵام قەول و فەتوایان حوجە نییە کاتێک خیلافی نەص بێ، وە قەولەکەیان نقڵ کردنی ئیجماع نییە هەتا بوترێ ئەمە عەمەلی هەموو سەلەفە یان زۆربەی سەلەفی لەسەرە، بەڵکو ئەو ئیمامانە ئیجتهادیان کردووە لەوانەیە وەک مەصڵەحەتێکیان دیبێ بۆیە ئەوەیان وتووە، دەکرێ صەواب لە تەرەفی بەرامبەری ئەواندا بووبێ کە پێیان وا بووە زەکاتی سەرفیترە ئەصڵ لێی خۆراکە نەک پارە، جا ئەمە هیچ لە فەزیلەت و پێگەیان کەم ناکاتەوە، بەڵکو بە دڵنیاییەوە ئیمامن هەتا دونیا کۆتایی پێدێ.

دەمێنێتەوە قسەکردن لەسەر قەولەکەی أبا إسحاق کە دەڵێ: پێیان گەیشتووم صەدەقەی ڕەمەزانیان بە درهەم دەدا قیمەتی خواردنەکەیان دەدا.

أبا إسحاق عمرو بن عبدالله السبيعي، ساڵی «٣٣» هیجری لە دایک بووە، وە ساڵی «١٢٧» هیجری وەفاتی کردووە، تابعییەکی موعەمەر بووە «٩٤» ساڵ ژیاوە، جا کە دەڵێ: پێیان گەیشتووم. نازانین مەبەستی لێیان تابعییە یاخود صەحابە!

جا بە عەمەل کردن بە حدیثەکان بۆ ئیماندار باش وایە زەکاتی سەرفیترەکەی بە خواردن بدات نەک پارە، چونکە دەرکردنی سەرفیترە بە پارە ئەو بابەتە نییە نەصی لەسەر هاتبێ، بەڵکو ئەوەی نەصی لەسەر هاتووە خواردنە، وە لە بەرامبەردا تابعی هەبووە بە کەراهەتی بینیوە زەکاتی سەرفیترە بە پارە بدرێ، وەک: عطاء ابن أبي رباح، ئەگەر قەرار بێ عەمەل بە فەتوای ئەو سێ ئیمامە بکرێ کە ڕێیان داوە بە پارە بدرێ، ئەی مانع چییە عەمەل نەکرێ بە فەتواکەی عطاء؟!

حَدَّثنا أبو بكرٍ، عَنِ ابنِ جُريجٍ، عَن عطاءٍ، أنَّه كَرِهَ أن يُعطيَ في صدقة الفِطرِ وَرِقًا.

المصنف لابن أبي شيبة | ١٠٤٦٨

هەروەها هەریەک لە ئیمامی شافعي و ئیمامی أحمد پێیان دروست نەبووە زەکاتی سەرفیترە بە پارە بدرێ، بەڵکو پێیان وابووە دەبێ خواردن بدرێ لەو خۆراکەی کە دەخورێ، وە ئەمەیان بە موافەقەی سوننە و نەصی ئایەت بینیوە.

**شافعي** دەڵێ: لە سوننەتی ڕەسول الله ﷺ زەکاتی سەرفیترە لەوە دەدرێ کە ئینسان دەیخوات، وە ئەوەی زەکاتی تێدایە.

وە هەر خۆراکێک زۆرترینی خواردنی کەسەکە بێ زەکات لەوە دەدات، وە نابێ لەوە بیدات کە ئەوە نییە دەیخوات، وە نابێ ئارد و سویق بدرێ، وە نابێ بە قیمەت و پارە بدرێ.

قال الشافعي: وفي سُنَّةِ رسول الله ﷺ أَنَّ زكاة الفِطرِ مِمَّا يَقتَاتُ الرَّجُلُ، ومِمَّا فيه زكاة.

وأَيُّ قوتٍ كانَ الأغلَب على رَجُل أَدَّى مِنه زكاة الفِطرِ، وَلا يؤدي مِنَ الحَبِّ غير الحَبِّ نفسه، وَلا يؤدي دَقيقًا ولا سويقًا، ولا قيمته.

كتاب الأم للشافعي | **(١/٦٠٥)**

سويق: واتە ئاردی گەنم یاخود جۆ، ئەم دووانە هەرکامیان بێ کاتێک دەنکە گەنمە یاخود جۆ لەسەر ئاگر دەکوڵێنرێ، پاشان دەکوترێ و دەکرێتە ئارد، هەرکات ویستبێتیان بیخۆن ئاو یان شیریان تێکەڵ کردووە.

**صالح بن أحمد** دەڵێ: وتم کەسانێک هەن دەڵێن: خواردن سوودی هەیە بۆ هەژاران، وە کەسانێکیش هەن دەڵێن نان سوودی هەیە؟ باوکم ئەمەی پێ ناخۆش بوو، وتی: سونەنەکان لە جێگای خۆیاندا دادەنرێن، الله ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ﴾. فەرمانی پێ نەکردووین بە نرخ، لەوە دەدرێ کە فەرمانی پێ کردووین.

وە حدیثی عبدالله بن عمر رضي الله عنهما: « فَرَضَ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيرٍ ». ئەوە دەدرێ کە ڕەسول الله ﷺ فەرزی کردووە.

وە وتی: أبو سعيد و إبن عمر ـیش لایان نەکردووەتەوە بە لای نرخدا.

قلت: قوم يقولون: الطعام أنفع للمساكين، وقوم يقولون الخبز خير؟ فكره أبي وقال: تُوضع السنن على مواضعها، قال الله: ﴿ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ﴾. وَلم يأمرنا بالقيمة وَلا الشيء، نُعطى ما أُمرنا به.

وحديث ابن عمر: « فَرَضَ رَسُولَ اللهِ ﷺ صَدَقَة الْفِطْرِ صَاعاً مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعَاً مِنْ شَعِيرٍ ». فيعطى ما فَرَضَ رسول الله ﷺ.

وقال: لم يَلتفت أبو سعيد، ولا ابن عمر إلى قيمَة مقومة.

مسائل أحمد بن حنبل رواية صالح بن أحمد ا ٩٧٨

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: باوکم بە کەراهەتی دادەنا دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە بە پارە، دەیوت: ترسم هەیە ئەگەر پارە بدرێ دروست نەبێ و لە سەری لانەچێ.

سمعتُ أبي يكره أن يعطي القيمة في زكاة الفطر، يقول: أخشى إن أعطي القيمة ألّا يجزئه ذالِک.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد ا ٦٤٧

**أبي داود** دەڵێ: بیستم پرسیار کرا لە أحمد بن حنبل دەربارەی دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە بە نان؟ وتی: نابێ، وە من گوێم لێ بوو پێی وترا: درهەم دەدرێ؟ وتی: ترسم هەیە دروست نەبێ و لەسەر لانەچێ، خیلافی سونەتی ڕەسول اللە ـیە ﷺ.

سمعتُ أحمد سُئِل عَنِ الخُبز في زكاة الفطر؟ قال: لا، قيل لأحمد وأنا أسمع: يُعطي الدراهم؟ قال: أخافُ أن لا يُجزئه، خِلافُ سُنَّةِ رسول الله ﷺ.

مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود | ٥٩٦



# کاتی دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول ﷺ فەرمانی کرد بە دەرکردنی زەکاتی سەرفیترە پێش دەرچوونی خەڵکی بۆ نوێژی جەژن.

عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أَمَرَ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ.

صحيح البخاري | ١٥٠٩ صحيح مسلم | ٢٢٨٨ سنن أبي داود | ١٦١٠ سنن الترمذي | ٦٨٤ مسند أحمد | ٦٣٨٩

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: ئەمە ئەوەیە ئەهلی عیلم بە موستەحەب و چاکیان داناوە پیاو زەکاتی سەرفیترەکەی پێش چوونی بۆنوێژی جەژن دەربکات.

وَهُوَ الَّذِي يَسْتَحِبُّهُ أَهْلُ الْعِلْمِ أَنْ يُخْرِجَ الرَّجُلُ صَدَقَةَ الْفِطْرِ قَبْلَ الْغُدُوِّ إِلَى الصَّلَاةِ.

**أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ئێمە لە سەردەمی ڕەسول الله ﷺ سەرفیترەمان لە ڕۆژی جەژن دەردەکرد صاعێک بوو لە خواردن. أبو سعيد دەڵێ: خواردنەکەمان بریتی بوو لە: جۆ، مێوژ، کەشک، خورما.

عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِاللهِ بْنِ أَبِي سَرْحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ الْفِطْرِ صَاعاً مِنْ طَعَامٍ. وَقَالَ أَبُو سَعِيدٍ: وَكَانَ طَعَامَنَا الشَّعِيرُ، وَالزَّبِيبُ، وَالْأَقِطُ، وَالتَّمْرُ.

صيح البخاري | ١٥١٠ صحيح مسلم | ٢٢٨٣ مسند أحمد | ١١٦٩٨

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما زەکاتی سەرفیترەی پێش نوێژی جەژن دەردەکرد.

حَدَّثنا ابنُ نمَيرٍ، عَن عبيدالله بن عمر، عَن نَافِعٍ، عَن ابنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أنَّه كانَ يُخرجها قبل الصَّلاةِ.

المصنف لابن أبي شيبة | ١٠٤١٨

**عطاء بن أبي رباح** دەڵێ: بیستم عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەیوت: ئەگەر دەتوانن ئەوە زەکاتی سەرفیترەکەتان بخەنە پێش نوێژ.

عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، أَنَّهُ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: إِنِ اسْتَطَعْتُمْ، فَأَلْقُوا زَكَاتَكُمْ أَمَامَ الصَّلَاةِ، يَعْنِي: صَلَاةَ الْفِطْرِ.

المصنف لعبدرزاق | ٥٩١٢

**يحيى بن أبي كثير** دەڵێ: أبي سلمة بن عبدالرحمن فەرمانی دەكرد زەكاتی سەرفیترەكەی بدرێ پێش ئەوەی بچێ بۆ نوێژ بۆ موصەلا.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ أَبِي سَلَمَةَ، قَالَ: كَانَ يُؤْمَرُ أَنْ تُلْقَى الزَّكَاةُ قَبْلَ أَنْ يُخْرَجَ إِلَى الْمُصَلَّى .

المصنف لعبدرزاق | ٥٩١٨

**عكرمة** دەڵێ: خەڵكی پێش چوونیان بۆ موصەلا خواردنیان دەخوارد و زەكاتی سەرفیترەیان دەردەكرد.

عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ، عَنْ عِكْرِمَةَ، قَالَ: كَانَ النَّاسُ يُلْقُونَ زَكَاتَهُمْ، وَيَأْكُلُونَ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجُوا إِلَى الْمُصَلَّى.

المصنف لعبدرزاق | ٥٩٢٤

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول اللە ﷺ زەكاتی سەرفیترەی فەرز كرد لەسەر نێرینە و مێینە، ئازاد و كۆیلە، صاعێك بوو لە خورما یاخود صاعێك لە جۆ، دواتر خەڵكی لە جیاتی ئەوە نیو صاع گەنمیان دەدا، وە عبدالله بن عمر رضي الله عنهما زەكاتی سەرفیترەی بە خورما دەردەكرد هەتا جارێك خورما دەست نەكەوت لە

مەدینە، ئەوکات سەرفیترەکەی بە جۆ دەرکرد، وە عبدالله بن عمر رضي الله عنهما سەرفیترەی گەورە و بچووکیشی دەدا، هەتا سەرفیترەی کوڕەکانی منیشی دەدا. وە عبدالله بن عمر رضي الله عنهما سەرفیترەکەی دەدایە ئەو کەسانەی تایبەت کرابوون بە کۆکردنەوەی، ئەوانیش ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ پێش جەژن دەریان دەکرد.

عَنْ أَيُّوبَ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: فَرَضَ النَّبِيُّ ﷺ صَدَقَةَ الْفِطْرِ -أَوْ قَالَ: رَمَضَانَ- عَلَى الذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالْحُرِّ وَالْمَمْلُوكِ، صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، فَعَدَلَ النَّاسُ بِهِ نِصْفَ صَاعٍ مِنْ بُرٍّ، فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُعْطِي التَّمْرَ فَأَعْوَزَ أَهْلُ الْمَدِينَةِ مِنَ التَّمْرِ، فَأَعْطَى شَعِيرًا، فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُعْطِي عَنِ الصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، حَتَّى إِنْ كَانَ يُعْطِي عَنْ بَنِيَّ. وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا يُعْطِيهَا الَّذِينَ يَقْبَلُونَهَا، وَكَانُوا يُعْطُونَ قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمٍ أَوْ يَوْمَيْنِ .

صحيح البخاري | ١٥١١ صحيح مسلم | ٢٢٨٠ مسند أحمد | ٤٤٨٦ المصنف لعبدرزاق | ٥٩١٥

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما زەکاتی سەرفیترەی دەنارد بۆ ئەو کەسانەی کە تایبەت بوون بە کۆکردنەوەی زەکات بە دوو ڕۆژ یان سێ ڕۆژ پێش جەژن.

**عبيدالله بن يحيى** دەڵێ: يحيى بۆی گێڕامەوە لە مالک ـەوە ئەهلی عیلمی بینیوە پێیان باش بووە ڕۆژی جەژن کاتێک خۆر هەڵدێ ئەوکات زەکاتی سەرفیترە دەربکرێ پێش ئەوەی خەڵکی بچن بۆ موصەلا .

**مالک** دەڵێ: وە ئەمە فراوانی تێدایە إن شاء الله تعالی پێش ئەوەی بچن بیدەن یاخود دوای چوونیان.

حَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، كَانَ يَبْعَثُ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ إِلَى الَّذِي تُجْمَعُ عِنْدَهُ قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةٍ.

وَحَدَّثَنِي، عَنْ مَالِكٍ: أَنَّهُ رَأَى أَهْلَ الْعِلْمِ يَسْتَحِبُّونَ أَنْ يُخْرِجُوا زَكَاةَ الْفِطْرِ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ مِنْ يَوْمِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوا إِلَى الْمُصَلَّى.

قَالَ مَالِكٌ: وَذَلِكَ وَاسِعٌ إِنْ شَاءَ اللَّهُ تَعَالَى أَنْ يُؤَدُّوا قَبْلَ الْغُدُوِّ مِنْ يَوْمِ الْفِطْرِ أَوبَعْدَهُ .

الموطأ لمالک ا ٦٤٤

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: چەندین جار کە ناژمێردرێ باوکمم دەبینی زەکاتی سەرفیترەی ڕۆژێک پێش جەژن دەردەکرد.

وَرأيتُ أبي ما لا أُحصي يعطي زكاة الفطر قَبل ذالِک بيوم.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٦٤٩



# خۆ شووشتنی ڕۆژی جەژن

**زاذان** دەڵێ: پیاوێک پرسیاری کرد لە علي بن أبي طالب رضي الله عنه دەربارەی خۆ شووشتن؟ وتی: لە ڕۆژی جەژنی قوربان و جەژنی ڕەمەزان خۆتان بشۆن.

حَدَّثنا وَكيعُ، عَن شُعبَةَ، عَن عَمرو بن مُرَّةَ، عَن زاذانَ، أَنَّ رَجُلًا سَأَلَ عَلِيًّا عَنِ الغُسلِ، فقال: الغُسلُ يَوم الأَضحى ويَوم الفِطرِ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٢٧

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش ئەوەی بچێ بۆ موصەلا خۆی دەشووشت.

عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَاللَّه بْنَ عُمَرَ كَانَ يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ، قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ إِلَى الْمُصَلَّى.

الموطأ لمالک | ٤٣٨ كتاب الأم للشافعي | ٥٠٠ مسند الشافعي | ٢٥٠ المصنف لعبدرزاق | ٥٨٢٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٢٨ كتاب العيدين للفريابي | ١٣

**الجعد بن عبدالرحمن** دەڵێ: السائب بن يزيد ـ‌م بینی پێش ئەوەی بچێ بۆ موصەلا خۆی دەشووشت.

حَدَّثنا قُتَيْبَةُ بْنُ سَعِيدٍ، حَدَّثنا حَاتِمُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ، حَدَّثنا الْجَعْدُ بْنُ عَبْدِالرَّحْمَنِ، قَالَ: رَأَيْتُ السَّائِبَ بْنَ يَزِيدَ يَغْتَسِلُ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى الْمُصَلَّى.

كتاب العيدين للفريابي | ١٦

**أبي إسحاق السبيعي** دەڵێ: علقمة لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا خۆی دەشووشت پێش ئەوەی بچێ بۆ موصەلا.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ، عَنْ عَلْقَمَةَ قَالَ كَانَ يَغْتَسِلُ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ .

المصنف لعبدرزاق | ٥٨٢٢

**معمر** دەڵێ: قتادة فەرمانی دەکرد بە خۆ شووشتن لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا، دەیوت: واجب نییە، بەڵام موستەحەبە شتێکی باشە.

عَنْ مَعْمَرٍ، عَنْ قَتَادَةَ أَنَّهُ كَانَ يَأْمُرُ بِالاغْتِسَالِ يَوْمَ الْفِطْرِ، وَيَقُولُ: لَيْسَ بِوَاجِبٍ وَلَكِنَّهُ حَسَنٌ مُسْتَحَبٌّ .

المصنف لعبدرزاق | ٥٨٢٣

**عبدالرازاق** دەڵێ: إبن جريج دەڵێ: خۆ شووشتن لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا شتێکی باشە لەبەرئەوەی ڕۆژی جەژنە، وە من قەت وازناهێنم لە خۆ شووشتنی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، پێم وت: ئایا هەروەک چۆن بۆ غوسڵی لەش گرانی بەدوایەوەین و مولتەزیمین پێوەی بۆ ئەمیش بە هەمان شێوە؟ وتی: نەخێر.

عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ، قَالَ: الاغْتِسَالُ يَوْمَ الْفِطْرِ حَسَنٌ لِأَنَّهُ يَوْمُ عِيدٍ، وَلَسْتُ أَنْ أَدَعَ أَنْ أَغْتَسِلَ فِي يَوْمِ الْفِطْرِ، قُلْتُ: أَفَيُتَحَرَّى الْغُسْلُ فِيهِ، كَمَا يُتَحَرَّى الْغُسْلُ فِي الْجَنَابَةِ؟ قَالَ: لَا.

المصنف لعبدرزاق | ٥٨٢٤

**عمرو بن سليم** دەڵێ: سعيد بن المسيب و غەیری ئەویش دەیانوت: خۆ شووشتنی ڕۆژی جەژن سوننەتە.

دەڵێ: سعيد بن المسيب دەیوت: وەک غوسڵی جەنابە.

عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ أَبِي سَبْرَةَ، عَنْ عَمْرِو بْنِ سُلَيْمٍ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيَّبِ وَغيْرِهِ قَالُوا: الْغُسْلُ فِي يَوْمِ الْعِيدَيْنِ سُنَّةٌ .

قَالَ: وَقَالَ ابْنُ الْمُسَيَّبِ: كَغُسْلِ الْجَنَابَةِ.

المصنف لعبدرزاق | ٥٨٢٥

**هشام بن حسان** دەڵێ: حسن البصري و محمد بن سيرين لە هەردوو جەژنی ڕەمەزان و قوربان خۆیان دەشووشت.

حَدَّثنا أبو أُسامةَ، عَن هِشامٍ، عَنِ الحَسَنِ وَمحمدٍ أَنَّهما كانَا يغتسلان يَومَ الفِطرِ وَيَومَ النَّحر.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٣٢

**مجاهد** دەڵێ: ئەوان پێیان خۆش بوو بە موستەحەبیان دادەنا خۆ شووشتن لە جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا.

حَدَّثنا حُمَيد بن عبدالرحمن، عَن حَسَنٍ، عَنِ ابن أَبي ليلى، عَن عبدالكريم، عَن مُجاهدٍ، قال: كانوا يَستحِبون أن يَغتَسلوا يَومَ الأضحى وَيَومَ الفِطرِ .

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٣٣

سعيد بن المسيب دەڵێ: خۆ شووشتن لە ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان پێش دەرچوونت بۆ موصەلا واجبە.

حَدَّثنا أبو داود، عَن زَمعةَ، عَنِ الزُّهري، عَن سعيد بنِ المُسَيِّبِ، أَنَّه سمعه، يقول: الاغتسال يَومَ الأضحى وَيَومَ الفِطرِ قبل أن تَخرُجَ حَقٌ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٣٤

أبي بكر دەڵێ: سالم بن عبدالله ڕۆژی جەژن خۆی دەشووشت.

حَدَّثنا مَعنَ بنُ عيسى، عَن خالدٍ، عَن أبي بكرٍ، أَنَّ سالمَ بنَ عبدالله كانَ يغتسل للعيد.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٣٥

أبي بكر دەڵێ: بيستم عبيدالله بن عبدالله فەرمانی دەكرد بە خۆ شووشتن بۆ هەردوو جەژنەكە.

حَدَّثنا مَعنَ بنُ عيسى، عَن خالدٍ، عَن أبي بكرٍ، قال: سمعتُ عبيدالله بنَ عبدالله يأمُرُ بالغُسلِ للعيدينِ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٣٦

**إبراهيم التيمي** دەڵێ: باوکم بە باشی دەزانی خۆ شووشتن بۆ جمعة و دوو جەژنەکە.

حَدَّثنا وَكيعٌ وَالفضلُ دُكَين، عَن عمر بن ذَر، عَن إبراهيم التَيميِّ، عَن أبيه، أَنَّه كانَ يَستَحِبُّ الغُسلَ للجمعةِ وَالعيدين.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٣٧

**شافعي** دەڵێ: مەزهەبی سعيد بن المسيب و عروة بن الزبير ئەوەبوو خۆ شووشتنی دوو جەژنەکە سوننەتە، وە شتێکی چاک و پاکە، وە قەومێکی صاڵح ئەمەیان کردووە، نەک ئەوەی حەتمی بێ لە کرداری ڕەسول الله ﷺ.

قال الشافعي: كانَ مَذهبُ سَعيد وَعُروة في أَنَّ الغسل في العيدين سُنَّة، أَنَّه أَحسنُ وأعرَفُ وأنظَف، وأَن قد فَعله قوم صالحون، لا أَنَّه حَتمٌ بأنه فعله رسول الله ﷺ.

كتاب الأم للشافعي | **(٤١٥/١)**



# پۆشینی جل و بەرگی جوان

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: عمر جوبەیەکی لە إستبرق بینی لە بازاڕ دەفرۆشرا هێنای بۆ ڕەسول الله ﷺ، وتی: ئەی ڕەسولی الله، ئەمە بکڕە بۆ ڕۆژانی جەژن، وە کاتێک وەفدەکان سەردانیت دەکەن. ڕەسول الله ﷺ فەرمووی: « ئەمە پۆشاکی ئەوانەیە کە هیچ نەصیبێکیان نییە ». پاشان ڕەسول الله ﷺ جوبەیەکی لە دیباج نارد بۆ عمر، عمر هات بۆ لای ڕەسول الله ﷺ، وتی: ئەی ڕەسولی الله، تۆ فەرمووت: « ئەمە پۆشاکی ئەوانەیە کە هیچ نەصیبێکیان نییە ». کەچی ئەم جوبەیەت بۆ ناردووم. ڕەسول الله ﷺ پێی وت: « بیفرۆشە یاخود پێداویستی خۆتی پێ ڕبکەوە ».

عَنْ سَالِمُ بْنُ عَبْدِاللَّه، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: أَخَذَ عُمَرُ جُبَّةً مِنْ إِسْتَبْرَقٍ تُبَاعُ فِي السُّوقِ فَأَخَذَهَا، فَأَتَى رَسُولَ الله ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، ابْتَعْ هَذِه تَجَمَّلْ بِهَا لِلْعِيدِ وَالْوُفُود. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ الله ﷺ: « **إِنَّمَا هَذِه لِبَاسُ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ** ». فَلَبِثَ عُمَرُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَلْبَثَ، ثُمَّ أَرْسَلَ إِلَيْهِ رَسُولُ الله ﷺ بِجُبَّةِ دِيبَاجٍ، فَأَقْبَلَ بِهَا عُمَرُ فَأَتَى بِهَا رَسُولَ اللَّهَ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه، إِنَّكَ قُلْتَ: « **إِنَّمَا هَذِه لِبَاسُ مَنْ لَا خَلَاقَ لَهُ** ».

وَأَرْسَلْتَ إِلَيَّ بِهَذِهِ الْجُبَّةِ. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: « **تَبِيعُهَا أَوْ تُصِيبُ بِهَا حَاجَتَكَ** ».

صحيح البخاري | ٩٤٨ صحيح مسلم | ٥٤٠٤ سنن أبي داود | ١٠٧٦ سنن النسائي | ١٥٦٠ مسند أحمد | ٤٧١٣

**شافعي** دەڵێ: وە پێم خۆشە پیاو جوانترین پۆشاکی لەبەر بکات بۆ جەژنەکان، جمعة، وە کۆبوونەوەی لەگەڵ خەڵکیدا، وە خۆی خاوێن بکات، وە خۆی بۆن خۆش بکات. وە پێم خۆشە ئەگەر ئافرەتان ئامادەی نوێژی جەژنەکان بوون ئەوە با بە پاک و خاوێنی بەشدار بن خۆیان شۆرد بێ، بۆنیان لە خۆ نەدابێ، وە پۆشاکی شوهرە ناوبانگ نەپۆشن.

قال الشافعي: وأُحِبُّ أن يلبس الرَّجُل أحسنُ ما يَجد في الأعياد: الجمعة، والعيدين، ومَحافلِ النَّاس، ويَتَنَظَّفَ ويتطيَّب.

وأُحِبُّ إذا حَضر النساء الأعياد والصلوات يَحضُرنها نظيفاتٍ بالماء غير متطيبات، ولا يلبسنَ ثَوبَ شُهرةٍ.

كتاب الأم للشافعي | **(٤١٧/١)**

## خواردن و خواردنەوە پێش چوون بۆ نوێژی جەژن

**أنس بن مالک** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش ئەوەی بچێ بۆ موصەلا هەندێک خورمای دەخوارد.

عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُفْطِرُ عَلَى تمَرَاتٍ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى الْمُصَلَّى.

صحيح البخاري | ٩٥٣ سنن الترمذي | ٥٥١ سنن الدارمي | ١٦٢٧ وأحمد | ١٢٢٦٨ سنن الداقطني كتاب العيدين | ٩

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: خەڵکی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان خواردنیان دەخوارد پێش ئەوەی بچن بۆ نوێژی جەژن.

عَنِ ابن جُريجٍ، عَن عمرو بن دينارٍ، عَن عِكرمةَ، عَنِ ابنِ عبّاسٍ، قال: كانَ النّاس يأكلون يوم الفِطر قبل أن يخرجوا.

المصنف لعبدرزاق | ٥٨١٥

**عبدالله بن الحارث** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەڵێ: ئەگەر ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان چوویت بۆ نوێژی جەژن، ئەوە شتێک بخۆ تەنانەت ئەگەر خورمایەکیش بێ.

حَدَّثنا عبدالله بن إدريس، عَنِ الأعمَش، عَنِ المنهال، عَن عبدالله بن الحارث، عَنِ ابنِ عباسٍ، قال: إذا خَرَجتَ يوم العيد، يعني الفطر فَكُل وَلو تمَرَةً.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٦٤٦

**هشام بن عروة** دەڵێ: باوکم لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا پێش ئەوەی بچێ بۆ نوێژی جەژن خواردنی دەخوارد.

عَنْ هِشَامِ بْنِ عُرْوَةَ، عَنْ أَبِيهِ، أَنَّهُ كَانَ يَأْكُلُ يَوْمَ عِيدِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوَ.

الموطأ لمالك | ٤٤٢ كتاب الأم للشافعي | ٥١٣ المصنف لعبدرزاق | ٥٨١٠ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٦٣٨ كتاب العيدين للفريابي | ٢٢

**سعيد بن المسيب** دەڵێ: فەرمان دەکرا بە خەڵکی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان خواردن بخۆن پێش ئەوەی ئیمام دەرچێ بۆ موصەلا. معمر دەڵێ: إبن شهاب الزهري ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش ئەوەی بچێ بۆ نوێژی

جەژن خواردنی دەخوارد، بەڵام لە جەژنی قورباندا خواردنی نەدەخوارد هەتا دوای نوێژ و قوربانی بکرایە.

عَن مَعمَرٍ، عَنِ الزُّهري، عَنِ ابنِ المُسَيِّب، قال: كانَ يُؤمر الإنسان أن يأكُل يوم الفِطرِ قبل أن يخرج الإمام إلى المُصلى. قال مَعمَر: فكانَ الزُّهري يأكُل يوم الفِطر قبلَ أن يَغدو، وَلا يأكُل يوم النّحر، حتى يَنحروا.

المصنف لعبدرزاق | ٥٨٠٩

**سعيد بن المسيب** دەڵێ: موسڵمانەکان لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا خواردنیان دەخوارد پێش نوێژی جەژن، بەڵام لە ڕۆژی جەژنی قورباندا نەیان دەخوارد.

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عُثْمَانَ بْنِ خَالِدٍ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ سَعْدٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنِ ابْنِ الْمُسَيِّبِ، قَالَ: كَانَ الْمُسْلِمُونَ يَأْكُلُونَ يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ الصَّلَاةِ، وَلَا يَفْعَلُونَ ذَلِكَ يَوْمَ النَّحْرِ.

كتاب العيدين للفريابي | ١٩

**عامر الشعبي** دەڵێ: لە سوننەتە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا خواردن بخورێ پێش ئەوەی بچی بۆ نوێژی جەژن، وە لە جەژنی قورباندا خواردن تەئخیر بکرێ هەتا لە نوێژ دەگەڕێیتەوە.

حَدَّثنا هُشَيم، قال: حَدَّثنا المُغيرة، عَنِ الشَّعبيِّ، قال: إنَّ مِن السُّنَّةِ أن تطعم يوم الفطر قبل أن تَغدوَ وَيؤخِّرَ الطعام يوم النَّحر حتى ترجع.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٦٤٢

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: ئەگەر خواردنی خوارد ئەوە شتێکی باشە، ئەگەر نەی خوارد ئەوە کێشەی نییە.

حَدَّثنا هُشَيم، قال: أخبرنا المُغيرة، عَن إبراهيم، قال: إن طَعِمَ فَحَسَنٌ وإن لم يَطعم فلا بأس.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٦٥٥

**شافعي** دەڵێ: ئێمە فەرمان دەکەین ئەو کەسەی دێت بۆ موصەلا خواردن و خواردنەوە بخوات پێش ئەوەی بچێ بۆ نوێژی جەژن، ئەگەر نەی خوات، فەرمانی پێ دەکەین لە ڕێگادا بیخوات، یاخود ئەگەر بۆی کرا لە موصەلا بیخوات، وە ئەگەر نەی خوارد، هیچی لەسەر نییە، بەڵام

کەراهەتی هەیە نەخوات، بەڵام لە جەژنی قورباندا فەرمانی پێ ناکەین بخوات، خۆ ئەگەر خواردی ئەوە کێشە نییە.

قال الشافعي: ونحن نَأْمُرُ مَن أتى المُصلَّى أن يَطعَم ويَشرَب قبل أن يَغدو إلى المُصلَّى، وإن لم يفعل، أمرناه بذالک في طريقه، أو المُصلَّى إن أمكَنه، وإن لم يفعل ذالک، فلا شيء عليه، ويُكرَه له ألَّا يفعل، ولا نأمره بهذا في الأضحى، وإن طَعمَ يوم الأضحى، فلا بأسَ عليه.

کتاب الأم للشافعي | **(٤١٧/١)**



# گۆڕینی ڕێگای چوون و گەڕانەوە

**أبي هريرة** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ بۆ نوێژی جەژن لە ڕێگایەکەوە دەچووە دەرەوە و لە ڕێگایەکی ترەوە دەگەڕایەوە.

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا خَرَجَ يَوْمَ الْعِيدِ فِي طَرِيقٍ رَجَعَ فِي غَيْرِهِ.

سنن أبي داود | ١١٥٦ سنن الترمذي | ٥٤٩ سنن ابن ماجه | ١٣٠١ سنن الدارمي | ١٦٣٩ مسند أحمد | ٨٤٥٤

**جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما دەڵێ ڕەسول الله ﷺ لە ڕۆژی جەژندا ڕێگای چوون و گەڕانەوەی جیاواز بوو.

عَنْ جَابِرِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا كَانَ يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ .

صحيح البخاري | ٩٨٦



# نوێژی جەژن لە موصەلا

**أبي سعيد الخدري** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان دەچووە دەرەوە بۆ موصەلا، یەکەم شتێک دەستی پێدەکرد نوێژ بوو، پاشان دەچوو بەرامبەر خەڵکی دەوەستا، خەڵکی لە صەفەکانیاندا دانیشت بوون، ئامۆژگاری دەکردن و فەرمانی پێدەکردن، وە ئەگەر بیویستایە نێرراوێک بنێرێ لەوێدا دەینارد یاخود فەرمانی بە شتێک بکردایە لەوێدا فەرمانی پێ دەدا، پاشان دەڕۆیشت. أبو سعيد دەڵێ: بەردەوام خەڵکی لەسەر ئەمە بوون هەتا لە جەژنی قوربان یاخود ڕەمەزان لەگەڵ مروان بن الحکم چوونە دەرەوە کاتێک ئەمیری مەدینە بوو، کاتێک گەیشتینە موصەلا سەیرمان کرد مینبەرێکی لێیە کثیر بن الصلت دروستی کرد بوو، مرون ویستی بچێتە سەرەوە پێش ئەوەی نوێژ بکات، کراسەکەیم ڕاکێشا نەهێڵم ئەویش کراسەکەی ڕاکێشام چوویە سەرەوە دەستی کردە وتار دان، پێیم وت: والله گۆڕیتان. وتی: یا أبا سعيد ئەوەی دەتزانی نوێژ پێش وتار بێ تێپەڕی. وتم: والله ئەوەی پێشتر لەسەری بووین خێردار ترە لەوەی کە نایزانم و خەڵکی ئێستا

لەسەرینی. وتی: خەڵکی دوای نوێژ دانانیشن گوێمان بۆ بگرن بۆیە وتارم خستووەتە پێش نوێژ.

عَنْ عِيَاضِ بْنِ عَبْدِاللَّه بْنِ أَبِي سَرْحٍ، عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى إِلَى الْمُصَلَّى، فَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ الصَّلَاةُ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ فَيَقُومُ مُقَابِلَ النَّاسِ، وَالنَّاسُ جُلُوسٌ عَلَى صُفُوفِهِمْ، فَيَعِظُهُمْ وَيُوصِيهِمْ وَيَأْمُرُهُمْ، فَإِنْ كَانَ يُرِيدُ أَنْ يَقْطَعَ بَعْثًا قَطَعَهُ أَوْ يَأْمُرَ بِشَيْءٍ أَمَرَ بِهِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَلَمْ يَزَلِ النَّاسُ عَلَى ذَلِكَ حَتَّى خَرَجْتُ مَعَ مَرْوَانَ، وَهُوَ أَمِيرُ الْمَدِينَةِ، فِي أَضْحًى أَوْ فِطْرٍ، فَلَمَّا أَتَيْنَا الْمُصَلَّى إِذَا مِنْبَرٌ بَنَاهُ كَثِيرُ بْنُ الصَّلْتِ، فَإِذَا مَرْوَانُ يُرِيدُ أَنْ يَرْتَقِيَهُ قَبْلَ أَنْ يُصَلِّيَ، فَجَبَذْتُ بِثَوْبِهِ فَجَبَذَنِي فَارْتَفَعَ فَخَطَبَ قَبْلَ الصَّلَاةِ، فَقُلْتُ لَهُ: غَيَّرْتُمْ وَاللهِ. فَقَالَ: أَبَا سَعِيدٍ، قَدْ ذَهَبَ مَا تَعْلَمُ. فَقُلْتُ: مَا أَعْلَمُ وَاللهِ خَيْرٌ مِمَّا لَا أَعْلَمُ. فَقَالَ: إِنَّ النَّاسَ لَمْ يَكُونُوا يَجْلِسُونَ لَنَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَجَعَلْتُهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ.

صحيح البخاري | ٩٥٦ صحيح مسلم | ٢٠٥٣ سنن النسائي | ١٥٧٩ سنن ابن ماجه | ١٢٨٨ مسند أحمد | ١١٣١٥ كتاب الأم للشافعي | ٥٣٦ مسند الشافعي | ٢٦٥ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٤١

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا لە بەردەمیدا لە شوێنی سوجدەکەی حەربە وەک سوترە دەچەقێنرا، ئەنجا نوێژی دەکرد.

حَدَّثَنَا عُبَيْدُاللَّه، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ تُرْكَزُ الْحَرْبَةُ قُدَّامَهُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَالنَّحْرِ ثُمَّ يُصَلِّي.

صحيح البخاري | ٩٧٢ صحيح مسلم | ١١١٥ سنن أبي داود | ٦٨٧ سنن النسائي | ٧٤٧ سنن ابن ماجه | ١٣٠٥ سنن الدارمي | ١٤٣٤ مسند أحمد | ٦٢٨٦ كتاب العيدين للفريابي | ٧٠

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ بۆ نوێژی جەژن دەچووە دەوە بۆ موصەلا، حەربەی لەگەڵ هەڵدەگیرا، وە لە موصەلا وەک سوترە لە بەردەمیدا دەچەقێنرا ئەویش ڕوو بە حەربەکە نوێژی دەکرد .

حَدَّثَنَا أَبُو عَمْرٍو، قَالَ: أَخْبَرَنِي نَافِعٌ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَغْدُو إِلَى الْمُصَلَّى وَالْعَنَزَةُ بَيْنَ يَدَيْهِ، تُحْمَلُ وَتُنْصَبُ بِالْمُصَلَّى بَيْنَ يَدَيْهِ، فَيُصَلِّي إِلَيْهَا.

صحيح البخاري | ٩٧٣ سنن ابن ماجه | ١٣٠٤ المصنف لعبدرزاق | ٥٧٣٢

# بەشداری کردنی ئافرەتان لە نوێژی جەژن

إبن جريج دەڵێ: عطاء بۆی گێڕامەوە، لە جابر بن عبدالله رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ڕۆژی جەژن نوێژی دەکرد پاشان وتاری دەدا، کاتێک تەواو دەبوو دادەبەزی دەهات بۆ لای ئافرەتەکان ئامۆژگاری دەکردن، پاڵیدابوو بە دەستی بلال ـەوە، وە بلال کراسەکەی کردبوویەوە ئافرەتەکان صەدەقەیان تێدەکرد. بە عطاء ـم وت: زەکاتی سەرفیترە؟ وتی نەخێر، بەڵکو صەدەقەیەک بوو لەو ڕۆژەدا دەیان بەخشی هەتا ئەڵقەکانیان دەبەخشی. وتم: وای دەبینی لەسەر ئیمام واجبە ئامۆژگاری ئافرەتان بکات؟ وتی: بەڵێ واجبە بۆچی وا ناکەن؟

عَنِ ابْنُ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ ثُمَّ خَطَبَ، فَلَمَّا فَرَغَ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ فَذَكَّرَهُنَّ، وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلَالٍ، وَبِلَالٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ يُلْقِي فِيهِ النِّسَاءُ الصَّدَقَةَ. قُلْتُ لِعَطَاءٍ: زَكَاةَ يَوْمِ الْفِطْرِ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ صَدَقَةً يَتَصَدَّقْنَ حِينَئِذٍ تُلْقِي فَتَخَهَا وَيُلْقِينَ، قُلْتُ: أَتُرَى حَقًّا عَلَى الْإِمَامِ ذَلِكَ وَيُذَكِّرُهُنَّ؟ قَالَ: إِنَّهُ لَحَقٌّ عَلَيْهِمْ وَمَا لَهُمْ لَا يَفْعَلُونَهُ؟

صحيح البخاري | ٩٧٨ صحيح مسلم | ٢٠٤٧ سنن أبي داود | ١١٤١ مسند أحمد | ١٤١٦٣ المصنف لعبدرزاق | ٥٧٠٢ كتاب العيدين للفريابي | ٩٧

**إبن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژنی ڕەمەزان بووم لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ، وە أبي بكر و عمر و عثمان رضي الله عنهم، هەموویان پێش وتار نوێژیان دەکرد، پاشان وتاریان دەدا، ئەنجا ڕەسول الله ﷺ دابەزی، وەک ئەوەی ئێستا تەماشای بکەم بە دەستی پیاوەکانی دادەنیشاند، ئەوانی تێپەڕاند و چوو بۆ لای ئافرەتەکان، وە بلال ـی لەگەڵ بوو، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لَا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا ﴾. هەتا تەواوی کرد، پاش تەواو بوونی وتی: « ئێوە لەسەر ئەم بەڵێنەن؟ ». ئافرەتێک وەڵامی دایەوە وتی: بەڵێ ئەی ڕەسولی الله. فەرمووی: « دەی ببەخشن ». بلال کراسەکەی کردبوویەوە، دەیوت وەرن باوک و دایکم فیداتان بێ. ئەوانیش هەستان ئەڵقەکانیان دەخستە ناو کراسەکەی بلال.

عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: شَهِدْتُ صَلَاةَ الْفِطْرِ مَعَ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمَانَ، فَكُلُّهُمْ يُصَلِّيهَا قَبْلَ الْخُطْبَةِ ثُمَّ

يَخْطُبُ، قَالَ: فَنَزَلَ نَبِيُّ اللهِ ﷺ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَيْهِ حِينَ يُجَلِّسُ الرِّجَالَ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَقْبَلَ يَشُقُّهُمْ حَتَّى جَاءَ النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلَالٌ فَقَالَ: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَنْ لَا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا ﴾. فَتَلَا هَذِهِ الْآيَةَ حَتَّى فَرَغَ مِنْهَا، ثُمَّ قَالَ حِينَ فَرَغَ مِنْهَا: « أَنْتُنَّ عَلَى ذَلِكِ؟ ». فَقَالَتِ امْرَأَةٌ وَاحِدَةٌ لَمْ يُجِبْهُ غَيْرُهَا مِنْهُنَّ: نَعَمْ يَا نَبِيَّ اللَّهِ. لَا يُدْرَى حِينَئِذٍ مَنْ هِيَ، قَالَ: « فَتَصَدَّقْنَ ». فَبَسَطَ بِلَالٌ ثَوْبَهُ ثُمَّ، قَالَ: هَلُمَّ، فِدًى لَكُنَّ أَبِي وَأُمِّي. فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ الْفَتَخَ وَالْخَوَاتِمَ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ.

صحيح البخاري | ٩٧٩ صحيح مسلم | ٢٠٤٤ مسند أحمد | ٣٠٦٣ المصنف لعبدرزاق | ٥٧٠٣

عبدالرحمن بن عابس دەڵێ: بيستم عبدالله بن عباس رضي الله عنهما پێی وترا: ئامادەی نوێژی جەژن بووی لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ؟ وتی: بەڵێ، ئەگەر لەبەر مەکانەتم نەبووایە لای ڕەسول الله ﷺ ئامادە نەدەبووم لەبەر بچووکیم، ڕەسول الله ﷺ چوو هەتا گەیشتە لای خانووی كثير بن الصلت، نوێژی کرد پاشان وتاری دا، پاشان هاتە لای ئافرەتەکان ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێکردن ببەخشن بلال لەگەڵی

بوو، بينيم بە دەستی خۆیان دەیانخستە ناو کراسەکەی بلال، پاشان لەگەڵ بلال ڕۆیشتەوە بۆ ماڵ.

عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ عَابِسٍ، قَالَ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قِيلَ لَهُ: أَشَهِدْتَ الْعِيدَ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ؟ قَالَ: نَعَمْ، وَلَوْلَا مَكَانِي مِنَ الصِّغَرِ مَا شَهِدْتُهُ، حَتَّى أَتَى الْعَلَمَ الَّذِي عِنْدَ دَارِ كَثِيرِ بْنِ الصَّلْتِ، فَصَلَّى ثُمَّ خَطَبَ ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلَالٌ فَوَعَظَهُنَّ وَذَكَّرَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ، فَرَأَيْتُهُنَّ يَهْوِينَ بِأَيْدِيهِنَّ يَقْذِفْنَهُ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ، ثُمَّ انْطَلَقَ هُوَ وَبِلَالٌ إِلَى بَيْتِهِ.

صحيح البخاري | ٩٧٧ مسند أحمد | ٣٢٢٦ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٢٧

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: شاهێدی دەدەم ڕەسول الله ﷺ لە ڕۆژی جەژندا پێش وتار نوێژی کرد، پاشان وتاری دا وای هەست کرد ئافرەتان نایبیستن، هات بۆ لایان و ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێکردن ببەخشن، وە بلال کراسەکەی گرتبوو، ئافرەت بە گوارەکانی و غەیری ئەویش دەهات پاشان دەیکردنە ناو کراسەکەی بلال.

عَنْ أَيُّوبُ السَّخْتِيَانِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءً، يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ بَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْعِيدِ، ثُمَّ خَطَبَ فَرُئِيَ أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعِ النِّسَاءَ، فَأَتَاهُنَّ فَذَكَّرَهُنَّ وَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ أَنْ يَتَصَدَّقْنَ، وَبِلَالٌ قَابِضٌ بِثَوْبِهِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تَجِيءُ بِالْخُرْصِ وَالشَّيْءِ ثُمَّ تُلْقِيهِ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ.

صحيح البخاري | ١٤٤٩ صحيح مسلم | ٢٠٤٥ سنن ابن ماجه | ١٢٧٣ سنن الدارمي | ١٦٢٩ مسند أحمد | ١٩٠٢ كتاب الأم للشافعي | ٥٣٣ مسند الشافعي | ٢٦٥ المصنف لعبدرزاق | ٥٧٠٤ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٢٤ مسند إسحاق بن راهوية | ٩١٧ كتاب العيدين للفريابي | ٨٨

**حفصة بنت سيرين** دەڵێ: ئێمە ڕێگریمان دەکرد لە جارییەکانمان ئامادەی نوێژی جەژن بن، هەتا ئەوەی ئافرەتێک هات لە کۆشکی بني خلف دابەزی و نیشتەجێ بوو، بۆی باس کردین کە مێردی خوشکەکەی بەشداری دوانزە غەزای کردبوو لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ، وە خوشکەکەی لە شەش غەزادا لەگەڵی بووە، وتی: ئێمە چاودێری نەخۆش و بریندارەکانمان دەکرد، وتم: ئەی ڕەسولی الله، یەکێک لە ئێمە جلبابی نییە ئەگەر بەشداری نوێژی جەژن نەکات تاوانی لەسەرە؟ فەرمووی: «

با خوشکەکەی لەو جلبابەی هەیەتی پۆشتەی بکات، وە بەشداری بکەن لە خێر و دوعای ئیماندااران ». حفصة دەڵێ: کاتێک أم عطية هات چووم بۆ لای لێم پرسی: هیچت بیستووە دەربارەی ئەوە و ئەوە؟ وتی: بەڵێ، بە باوکمەوە فیدای بم، هەرکات باسی ڕەسول الله ـ ی ﷺ بکردایە ئیللا دەیوت: بە باوکمەوە فیدای بم، فەرمووی: « ئافرەتانی خاوەن حیض و ئەوانەشی نیشتەجێی ماڵن با ئامادەی نوێژ و دوعای کۆمەڵی موسڵمانان بن، بەڵام ئافرەتانی خاوەن حیض نزیکی موصەلا نەکەونەوە ». پێم وت: خاوەن حیض بەشدار بێ؟ وتی: بەڵێ، مەگەر خاوەن حیض بەشداری عەرەفات و بەشداری ئەوە و بەشداری ئەوە ناکات؟

حَدَّثَنَا أَيُّوبُ، عَنْ حَفْصَةَ بِنْتِ سِيرِينَ، قَالَتْ: كُنَّا نَمْنَعُ جَوَارِيَنَا أَنْ يَخْرُجْنَ يَوْمَ الْعِيدِ فَجَاءَتِ امْرَأَةٌ فَنَزَلَتْ قَصْرَ بَنِي خَلَفٍ فَأَتَيْتُهَا فَحَدَّثَتْ أَنَّ زَوْجَ أُخْتِهَا غَزَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ غَزْوَةً، فَكَانَتْ أُخْتُهَا مَعَهُ فِي سِتِّ غَزَوَاتٍ، فَقَالَتْ: فَكُنَّا نَقُومُ عَلَى الْمَرْضَى وَنُدَاوِي الْكَلْمَى، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّه، أَعَلَى إِحْدَانَا بَأْسٌ إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهَا جِلْبَابٌ أَنْ لَا تَخْرُجَ؟ فَقَالَ: « **لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا، فَلْيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُؤْمِنِينَ** ». قَالَتْ حَفْصَةُ: فَلَمَّا قَدِمَتْ أُمُّ عَطِيَّةَ أَتَيْتُهَا فَسَأَلْتُهَا: أَسَمِعْتِ

فِي كَذَا وَكَذَا؟ قَالَتْ: نَعَمْ، بِأَبِي، وَقَلَّمَا ذَكَرَتِ النَّبِيَّ ﷺ إِلَّا قَالَتْ: بِأَبِي، قَالَ: « لِيَخْرُجِ الْعَوَاتِقُ ذَوَاتُ الْخُدُورِ -أَوْ قَالَ: الْعَوَاتِقُ وَذَوَاتُ الْخُدُورِ. شَكَّ أَيُّوبُ- وَالْحُيَّضُ، وَيَعْتَزِلُ الْحُيَّضُ الْمُصَلَّى وَلْيَشْهَدْنَ الْخَيْرَ وَدَعْوَةَ الْمُؤْمِنِينَ ». قَالَتْ: فَقُلْتُ لَهَا: آلْحُيَّضُ؟ قَالَتْ: نَعَمْ، أَلَيْسَ الْحَائِضُ تَشْهَدُ عَرَفَاتٍ وَتَشْهَدُ كَذَا وَتَشْهَدُ كَذَا؟

صحيح البخاري | ٩٨٠ مسند أحمد | ٢٠٧٨٩

أم عطية رضي الله عنها دەڵێ: فەرمانمان پێکرا بۆ نوێژی دوو جەژنەکە بچینە دەرەوە ئافرەتانی خاوەن حیض و ئەوانەشی نیشتەجێی ماڵن ئامادەی نوێژ و دوعای کۆمەڵی موسڵمانان بن، بەڵام ئافرەتانی خاوەن حیض نزیکی موصەلا نەدەکەوتنەوە، ئافرەتێک وتی: ئەی ڕەسولی الله، هەمانە جلبابی نییە، فەرمووی: « با خوشکەکەی لەو جلبابەی هەیەتی پۆشتەی بکات ».

عَنْ مُحَمَّدٍ، عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ الْحَيَّضَ يَوْمَ الْعِيدَيْنِ، وَذَوَاتِ الْخُدُورِ، فَيَشْهَدْنَ جَمَاعَةَ الْمُسْلِمِينَ وَدَعْوَتَهُمْ،

وَيَعْتَزِلُ الْحُيَّضُ عَنْ مُصَلَّاهُنَّ، قَالَتِ امْرَأَةٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِحْدَانَا لَيْسَ لَهَا جِلْبَابٌ، قَالَ: « **لِتُلْبِسْهَا صَاحِبَتُهَا مِنْ جِلْبَابِهَا** ».

صحيح البخاري ا ٣٥١ صحيح مسلم ا ٢٠٥٦ سنن أبي داود ا ١١٣٦ سنن الترمذي ا ٥٤٧ سنن النسائي ا ١٥٥٨ سنن ابن ماجه ا ١٣٠٧ سنن الدارمي ا ١٦٣٥ مسند أحمد ا ٢٠٧٩٩ مسند إسحاق بن راهوية ا ٦٦٢ المصنف لابن أبي شيبة ا ٥٨٤٨



# نوێژی جەژن بانگ و قامەتی پێوست نییە

**جابر بن سمرة** رضي الله عنه دەڵێ: نوێژی جەژنەکانم لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ کرد نە جارێک و نە دوو جار، بێ بانگ و بێ قامەت.

عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ الْعِيدَيْنِ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلَا مَرَّتَيْنِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ.

صحيح مسلم | ٢٠٥١ سنن أبي داود | ١١٤٨ سنن الترمذي | ٥٤٠ سنن الدارمي | ١٦٢٨ مسند أحمد | ٢٠٨٤٧ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٠٧

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، وە غەیری ئەوانیش بانگ نادرێ بۆ نوێژی جەژنەکان، وە هیچ یەکێک لە نوێژە سوننەتەکان.

وَالْعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّهُ لَا يُؤَذَّنُ لِصَلَاةِ الْعِيدَيْنِ وَلَا لِشَيْءٍ مِنَ النَّوَافِلِ.

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ، وە لەگەڵ أبي بكر و عمر و عثمان، هەموویان پێش وتار نوێژیان دەکرد بێ بانگ و بێ قامەت.

عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: شَهِدْتُ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ الْعِيدَ وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ، فَكُلُّهُمْ صَلَّى قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ .

سنن أبي داود ا ١١٤٧ سنن ابن ماجه ا ١٢٧٤ مسند أحمد ا ٢١٧١- ٢١٧٢

**جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ، نوێژی کرد پێش وتار بێ بانگ و بێ قامەت.

عَنْ عَبْدِالْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: شَهِدْتُ الصَّلَاةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ.

سنن النسائي ا ١٥٦٢ سنن الدارمي ا ١٦٢٨ المصنف لابن أبي شيبة ا ٥٧٠٨ كتاب العيدين للفريابي ا ٩٥

**عبدالرحمن بن عابس** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ نوێژی جەژنی بۆ کردین لای خانووی كثير بن الصلت، نوێژی کرد ئەنجا وتار، وە باسی بانگ و قامەتی نەکرد، ئەگەر لەبەر مەکانەتم نەبووایە لای ڕەسول الله ﷺ ئامادە نەدەبووم لەبەر بچووکیم.

حَدَّثَنَا وَكِيعٌ، عَنْ سُفْيَانَ، عَنْ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ عَابِسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى بِهِمْ يَوْمَ الْعِيدِ عِنْدَ دَارِ كَثِيرِ بْنِ الصَّلْتِ، فَصَلَّى قَبْلَ أَنْ يَخْطُبَ، وَلَمْ يَذْكُرْ أَذَانًا وَلَا إِقَامَةً، وَلَوْلَا مَكَانِي مِنْهُ مَا شَهِدْتُهُ مِنَ الصِّغَرِ.

المصنف لابن أبي شيبة ا ٥٧١٠ كتاب العيدين للفريابي ا ٨٧

**عطاء بن أبي رباح** دەڵێ: کاتێک عبدالله بن الزبير رضي الله عنه بەیعەتی پێدرا و بوویە خەلیفە عبدالله بن عباس رضي الله عنهما پەیامی بۆ نارد نوێژی جەژنی ڕەمەزان بانگی بۆ نەدەدرا، وە وتار پێش نوێژە.

عَنِ ابْنَ جُرَيْجٍ، قَالَ: وَأَخْبَرَنِي عَطَاءٌ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَرْسَلَ إِلَى ابْنِ الزُّبَيْرِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فِي أَوَّلِ مَا بُويِعَ لَهُ إِنَّهُ لَمْ يَكُنْ يُؤَذَّنُ بِالصَّلَاةِ يَوْمَ الْفِطْرِ، إِنَّمَا الْخُطْبَةُ بَعْدَ الصَّلَاةِ.

صحيح البخاري ا ٩٥٩ صحيح مسلم ا ٢٠٥٠ المصنف لعبدرزاق ا ٥٦٩٩

**إبن جريج** دەڵێ: عطاء بن أبي رباح بۆی گێڕامەوە وتی: عبدالله بن عباس و جابر بن عبدالله رضي الله عنهما وتیان: بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان بانگ نەدەدرا.

پاشان دوای ماوەیەک دەربارەی هەمان شت لێم پرسی، وتی: جابر بن عبدالله رضي الله عنهما بۆی گێڕامەوە: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش ئەوەی ئیمام بێتە دەرەوە، وە دوای هاتنە دەرەوەش نە بانگ دەدرا نە قامەت نە هیچ شتێکی تر. وتی: بێ بانگ بێ قامەت.

عَنِ ابن جُرَيْجٍ، قال: أخبرني عطاءُ، عَنِ ابنِ عبّاسٍ وَجابر بن عبدالله الأنصاري رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قالا: لم يكُن يُؤذن يوم الفِطر وَلَا يوم الأضحى.

ثُمّ سألته بعد حينٍ عَن ذالک، فأخبرني، قال: أخبرني وجابر بن عبدالله الأنصاري، أنّ لا أذان للصلاة يوم الفِطر حينَ يخرج الإمام، وَلَا بعد أن يخرج وَلَا إقامة وَلَا نِداء وَلَا شيء، قال: وَلَا نِداء وَلَا إقامة.

المصنف لعبدرزاق ا ٥٦٩٨

**محمد بن سيرين** دەڵێ: بانگ دان بۆ نوێژی جەژن بیدعە و داهێنراوە.

حَدَّثنا الثَّقفيُّ، عَن أيوبَ، عَن محمدٍ، قال: الأذان في العيد مُحدَثٌ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧١٦

**عبيدالله بن يحيى** دەڵێ: یحیی بۆی گێڕامەوە لە مالک ـەوە: بیستوویەتی زیاد لە یەکێک لە زاناکانیان وتوویانە: لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قورباندا بانگ و قامەت نەبووە لە سەردەمی ڕەسول الله ـوە ﷺ هەتا ئەم سەردەمەی ئەمڕۆ.

**مالک** دەڵێ: ئەمە سوننەتێکە لای ئێمە هیچ خیلافێکی تێدا نییە

حَدَّثَنِي يَحْيَى، عَنْ مَالِكٍ، أَنَّهُ سَمِعَ غَيْرَ وَاحِدٍ مِنْ عُلَمَائِهِمْ يَقُولُ: لَمْ يَكُنْ فِي عِيدِ الْفِطْرِ وَلاَ فِي الأَضْحَى نِدَاءٌ وَلاَ إِقَامَةٌ مُنْذُ زَمَانِ رَسُولِ اللهِ ﷺ إِلَى الْيَوْمِ .

قَالَ مَالِكٌ: وَتِلْكَ السُّنَّةُ الَّتِي لاَ اخْتِلاَفَ فِيهَا عِنْدَنَا.

الموطأ لمالک | ٤٣٧

**شافعي** دەڵێ: بانگ تەنها بۆ پێنج فەڕزەی نوێژەکانە، ئێمە نازانین بانگ درا بێ بۆ ڕەسول الله ﷺ لە غەیری فەڕزەکان، وە پێم خۆشە ئیمام فەرمان بکات بە بانگ بێژ لە جەژنەکان و ئەو مەسئەلانەی کە خەڵکی کۆدەبنەوە بۆ نوێژ بڵێ: الصلاة جامعة، یاخود بڵێ: إن الصلاة. وە ئەگەر بڵێ: هلم إلى الصلاة بە کەراهەتی نازانم.

قال الشافعي: وَلا آذان إلا للمكتوبة، فإنَّا لم نعلمه أُذِنَ لرسول الله ﷺ إلا للمكتوبة، وأُحِبُ أن يأمُرَ الإمام المؤذن أن يقول في الأعياد وما جمع الناسُ له مِنَ الصلاةِ: الصلاةُ جامعةُ، أو إنَّ الصَّلاة، وإن قال: هَلُمَّ إلى الصَّلاة لم نكرهه.

كتاب الأم للشافعي | **(٤٢١/١)**



# نوێژی جەژن پێش وتار ئەنجام دەدرێ

**إبن جريج** دەڵێ: عطاء بۆی گێڕامەوە، لە جابر بن عبدالله رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ڕۆژی جەژن نوێژی دەکرد پاشان وتاری دەدا، کاتێک تەواو دەبوو دادەبەزی دەهات بۆ لای ئافرەتەکان ئامۆژگاری دەکردن، پاڵیدابوو بە دەستی بلال ـەوە، وە بلال کراسەکەی کردبوویەوە ئافرەتەکان صەدەقەیان تێدەکرد. بە عطاء ـم وت: زەکاتی سەرفیترە؟ وتی نەخێر، بەڵکو صەدەقەیەک بوو لەو ڕۆژەدا دەیان بەخشی هەتا ئەڵقەکانیان دەبەخشی. وتم: وای دەبینی لەسەر ئیمام واجبە ئامۆژگاری ئافرەتان بکات؟ وتی: بەڵێ واجبە بۆچی وا ناکەن؟

عَنِ ابْنُ جُرَيْجٍ، قَالَ: أَخْبَرَنِي عَطَاءٌ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللَّه رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَامَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ ثُمَّ خَطَبَ، فَلَمَّا فَرَغَ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ فَذَكَّرَهُنَّ، وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلَالٍ، وَبِلَالٌ بَاسِطٌ ثَوْبَهُ يُلْقِي فِيهِ النِّسَاءُ الصَّدَقَةَ قُلْتُ لِعَطَاءٍ: زَكَاةَ يَوْمِ الْفِطْرِ؟ قَالَ: لَا، وَلَكِنْ صَدَقَةً يَتَصَدَّقْنَ حِينَئِذٍ تُلْقِي فَتَخَهَا وَيُلْقِينَ، قُلْتُ: أَتُرَى حَقًّا عَلَى الْإِمَامِ ذَلِكَ وَيُذَكِّرُهُنَّ؟ قَالَ: إِنَّهُ لَحَقٌّ عَلَيْهِمْ وَمَا لَهُمْ لَا يَفْعَلُونَهُ؟

صحيح البخاري | ٩٧٨ صحيح مسلم | ٢٠٤٧ سنن أبي داود | ١١٤١ مسند أحمد | ١٤١٦٣ المصنف لعبدرزاق | ٥٧٠٢ كتاب العيدين للفريابي | ٩٧

**جابر بن عبدالله** رضي الله عنهما دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ، نوێژی کرد پێش وتار بێ بانگ و بێ قامەت.

عَنْ عَبْدِالْمَلِكِ بْنِ أَبِي سُلَيْمَانَ، عَنْ عَطَاءٍ، عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: شَهِدْتُ الصَّلَاةَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فِي يَوْمِ عِيدٍ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلَا إِقَامَةٍ.

سنن النسائي | ١٥٦٢ سنن الدارمي | ١٦٢٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٠٨ كتاب العيدين للفريابي | ٩٥

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ ڕەسول الله ﷺ، وە أبي بكر و عمر و عثمان رضي الله عنهم، هەموویان نوێژیان پێش وتار دەکرد.

عَنْ طَاوُسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَأَبِي بَكْرٍ، وَعُمَرَ، وَعُثْمَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ، فَكُلُّهُمْ كَانُوا يُصَلُّونَ قَبْلَ الْخُطْبَةِ.

صحيح البخاري | ٩٦٢ سنن ابن ماجه | ١٢٧٤ سنن الدارمي | ١٦٣٠ مسند أحمد | ٣٠٦٣ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٣٠ كتاب العيدين للفريابي | ٦

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: شاهێدی دەدەم ڕەسول الله ﷺ لە ڕۆژی جەژندا پێش وتار نوێژی کرد، پاشان کە وتاری دا وای هەست کرد ئافرەتان نایبیستن، هات بۆ لایان و ئامۆژگاری کردن و فەرمانی پێکردن ببەخشن، وە بلال کراسەکەی گرتبوو، ئافرەت بە گوارەکانی و غەیری ئەویش دەهات پاشان دەیکردنە ناو کراسەکەی بلال.

عَنْ أَيُّوبُ السَّخْتِيَانِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ عَطَاءً، يَقُولُ: سَمِعْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يَقُولُ: أَشْهَدُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ بَدَأَ بِالصَّلَاةِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ يَوْمَ الْعِيدِ، ثُمَّ خَطَبَ فَرُئِيَ أَنَّهُ لَمْ يُسْمِعِ النِّسَاءَ، فَأَتَاهُنَّ فَذَكَّرَهُنَّ

وَوَعَظَهُنَّ وَأَمَرَهُنَّ أَنْ يَتَصَدَّقْنَ، وَبِلَالٌ قَابِضٌ بِثَوْبِهِ، فَجَعَلَتِ الْمَرْأَةُ تَجِيءُ بِالْخُرْصِ وَالشَّيْءِ ثُمَّ تُلْقِيهِ فِي ثَوْبِ بِلَالٍ.

صحيح البخاري | ١٤٤٩ صحيح مسلم | ٢٠٤٥ سنن ابن ماجه | ١٢٧٣ سنن الدارمي | ١٦٢٩ مسند أحمد | ١٩٠٢ كتاب الأم للشافعي | ٥٣٣ مسند الشافعي | ٢٦٥ المصنف لعبدرزاق | ٥٧٠٤ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٢٤ مسند إسحاق بن راهوية | ٩١٧ كتاب العيدين للفريابي | ٨٨

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا سەرەتا نوێژی دەکرد پاشان وتاری دەدا .

عَنْ أَنَسٍ، عَنْ عُبَيْدِاللَّه، عَنْ نَافِعٍ، عَنْ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ كَانَ يُصَلِّي فِي الْأَضْحَى وَالْفِطْرِ ثُمَّ يَخْطُبُ بَعْدَ الصَّلَاةِ.

صحيح البخاري | ٩٥٧ مسند أحمد | ٥٦٦٣

**عبدالله بن عمر** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ، وە أبی بكر و عمر رضي الله عنهما لە هەردوو جەژنەکەدا نوێژیان پێش وتار دەکرد .

عَنْ أَبُو أُسَامَةَ، عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَأَبُو بَكْرٍ، وَعُمَرُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ.

صحيح البخاري | ٩٦٣ صحيح مسلم | ٢٠٥٢ سنن الترمذي | ٥٣٩ سنن النسائي | ١٥٦٤ سنن الدارمي | ١٦٣٠ سنن ابن ماجه | ١٢٧٦ كتاب الأم للشافعي | ٥٣٤ مسند الشافعي | ٢٦٣ مسند أحمد | ٤٦٠٢ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٢٦ كتاب العيدين للفريابي | ٣ سنن الدارقطني كتاب العيدين | ١٤

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ وە غەیری ئەوانیشە نوێژی جەژنەکان پێش وتار دەکرێ، وە دەوترێ: یەکەم کەس وتاری پێش نوێژ خست مروان بن الحكم بووە .

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ: أَنَّ صَلَاةَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ، وَيُقَالُ: إِنَّ أَوَّلَ مَنْ خَطَبَ قَبْلَ الصَّلَاةِ مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ.

**أبي عبيد مولى ابن أزهر** دەڵێ: لەگەڵ عمر بن الخطاب رضي الله عنه ئامادەی نوێژی جەژن بووم نوێژی کرد پاشان وتار، پاشان ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عثمان رضي الله عنه نوێژی کرد پاشان وتار، وە ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ علي رضي الله عنه نوێژی کرد پاشان وتار .

حَدَّثنا ابن عُيَينة، عَنِ الزُّهري، عَن أَبي عُبَيد مولى ابنُ أزهَر، قال: شَهِدتُ العيد مع عُمر بنُ الخطاب فَبدأ بالصَلاة قبل الخُطبة، قال: ثُمَّ شَهِدتُ العيد مع عُثمانَ فَبدأ بالصَلاة قبل الخُطبة، قال: وَشَهِدتُه مع عَليَّ فَبدأ بالصَلاة قبل الخُطبة.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٣١

**أبي عبيد مولى ابن أزهر** دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عمر بن الخطاب رضي الله عنه نوێژی کرد پاشان چوو وتاری دا بۆ خەڵکی، وتی: ئەم دوو ڕۆژە ڕەسول الله ﷺ نەهی کرد لە بەڕۆژوو بوون تیایاندا: ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان، ڕۆژی جەژنی قوربان. پاشان ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ عثمان رضي الله عنه هات نوێژی کرد پاشان

چوو وتاری دا، وتی: لەم ڕۆژەتاندا دوو جەژن کۆبونەتەوە، هەرکەسێك لە خەڵکی دەرەوە حەزدەکات چاوەڕێ بکات بۆ جمعة ئەوە با بمێنێتەوە، وە هەر کەسیش حەز دەکات بگەڕێتەوە ئەوە ئیزنم داوە. پاشان ئامادەی نوێژی جەژن بووم لەگەڵ علي رضي الله عنه ئەو کاتەبوو عثمان گەمارۆ درابوو، هات نوێژی کرد پاشان چوو وتاری دا .

عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، عَنْ أَبِي عُبَيْدٍ -مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ- قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَصَلَّى ثُمَّ انْصَرَفَ، فَخَطَبَ النَّاسَ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ يَوْمَانِ، نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ صِيَامِهِمَا: يَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَالْآخَرُ يَوْمٌ تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ. قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: ثُمَّ شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، فَجَاءَ فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَخَطَبَ، وَقَالَ: إِنَّهُ قَدِ اجْتَمَعَ لَكُمْ فِي يَوْمِكُمْ هَذَا عِيدَانِ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْ أَهْلِ الْعَالِيَةِ أَنْ يَنْتَظِرَ الْجُمُعَةَ، فَلْيَنْتَظِرْهَا، وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَرْجِعَ، فَقَدْ أَذِنْتُ لَهُ. قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ: ثُمَّ شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ، وَعُثْمَانُ مَحْصُورٌ، فَجَاءَ فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ فَخَطَبَ .

الموطأ لمالک | ٤٤١ المصنف لعبدرزاق | ٥٧٠٧ كتاب العيدين للفريابي

| ٧

**يحيى بن يحيى الليثي** دەڵێ: پرسیار کرا لە مالك بن أنس دەربارەی پیاوێك لەگەڵ ئیمامدا نوێژی جەژنی ڕەمەزان دەکات، ئایا بۆی هەیە بڕوات پێش ئەوەی گوێ لە وتار بگرێ؟ وتی: نابێ بڕوات هەتا ئیمام دەڕوات.

قال يحيى: وسُئِل مالكُ عن رجل صلَّى مع الإمام يوم الفطر، هل له أن ينصرف قبل يسمع الخطبة؟ فقال: لا ينصرف حتى ينصرف الإمام.

الموطأ لمالک | ٤٥٠

شافعی دەڵێ: لە جەژنەکاندا نوێژ دەکرێ پێش وتار، ئەگەر هاتوو وتار پێش نوێژ درا وای دەبینم لە دوای نوێژ وتارەکە بدرێتەوە، ئەگەر وای نەکرد دووبارە کردنەوەی لەسەر نییە هەروەها کەفارەتیشی لەسەر نییە.

قال الشافعي: ويبدأ في الأعياد بالصلاة قبل الخطبةِ، وإن بَدَأَ بالخطبة قبل الصلاةِ رأيت أن يعيد الخطبة بعد الصلاة، وإن لم يفعل لم يكن عليه إعادة ولا كَفَّارة.

كتاب الأم للشافعي | **(٤٢٢/١)**

# نوێژی جەژن لە پێش و پاشیەوە نوێژی سوننەت نییە

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان هاتە دەرەوە دوو ڕکات نوێژی جەژنی کرد نە لە پێشیەوە نوێژی کرد نە لە دوایەوە، وە بلال ـیشی لەگەڵ بوو.

عَنْ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ خَرَجَ يَوْمَ الْفِطْرِ، فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا وَمَعَهُ بِلَالٌ.

صحيح البخاري | ٩٨٩ مسند أحمد | ٢٥٣٣

**عبدالله بن عباس** رضي الله عنهما دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ دوو ڕکات نوێژی جەژنی ڕەمەزانی بۆ کردین، نە لە پێشیەوە نوێژی کرد، نە لە دوایەوە نوێژی کرد، پاشان لەگەڵ بلال هات بۆ لای ئافرەتەکان فەرمانی پێکردن ببەخشن، ئەوانیش دەستیان کرد بە بەخشین، بە جۆرێک ئافرەت هەبوو گوارە و ملوانکەکەی دەبەخشی.

حَدَّثَنِي عَدِيُّ بْنُ ثَابِتٍ، قَالَ: سَمِعْتُ سَعِيدَ بْنَ جُبَيْرٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَلَّى يَوْمَ الْفِطْرِ رَكْعَتَيْنِ، لَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا

بَعْدَهَا، ثُمَّ أَتَى النِّسَاءَ وَمَعَهُ بِلَالٌ فَأَمَرَهُنَّ بِالصَّدَقَةِ فَجَعَلْنَ يُلْقِينَ، تُلْقِي الْمَرْأَةُ خُرْصَهَا وَسِخَابَهَا.

صحيح البخاري | ٩٦٤ صحيح مسلم | ٢٠٥٧ سنن أبي داود | ١١٥٩ سنن الترمذي | ٥٤٥ سنن النسائي | ١٥٨٧ سنن ابن ماجه | ١٢٩١ سنن الدارمي | ١٦٣١ مسند أحمد | ٢٥٣٣ كتاب الأم للشافعي | ٥٢٦ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٩١ كتاب العيدين للفريابي | ١٥٥

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای هەندێک لە ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، وە غەیری ئەوانیش. وە ئەمە قەولی شافعي و أحمد بن حنبل و إسحاق بن راهوية ـشە. وە هەندێک لە ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، وە غەیری ئەوانیش وای دەبینن نوێژ دەکرێ پێش نوێژی جەژن، وە دوای نوێژی جەژنیش، قەولی یەکەم دروستە.

وَالْعَمَلُ عَلَيْهِ عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ. وَبِهِ يَقُولُ الشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ. وَقَدْ رَأَى طَائِفَةٌ مِنْ أَهْلِ الْعِلْمِ الصَّلَاةَ بَعْدَ صَلَاةِ الْعِيدَيْنِ وَقَبْلَهَا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغَيْرِهِمْ، وَالْقَوْلُ الأَوَّلُ أَصَحُّ.

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما لە جەژنی ڕەمەزاندا نە لە پێش نوێژی جەژن نە لە دوایەوە نوێژی نەدەکرد.

عَنْ نَافِعٍ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا لَمْ يَكُنْ يُصَلِّي يَوْمَ الْفِطْرِ قَبْلَ الصَّلَاةِ وَلَا بَعْدَهَا .

الموطأ لمالك | ٤٤٦ المصنف لعبدرزاق | ٥٦٨٢ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٩٦ كتاب العيدين للفريابي | ١٥٨

**أبي بكر بن حفص** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما ڕۆژی جەژن چووە دەرەوە نوێژی جەژنی کرد نە لە پێشیەوە نە لە دوایەوە نوێژی نەکرد، وە وتی ڕەسول الله ﷺ وای دەکرد.

عَنْ أَبِي بَكْرِ بْنِ حَفْصٍ -وَهُوَ ابْنُ عُمَرَ بْنِ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ- عَنِ ابْنِ عُمَرَ أَنَّهُ خَرَجَ فِي يَوْمِ عِيدٍ فَلَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا، وَذَكَرَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ فَعَلَهُ.

سنن الترمذي | ٥٤٦ مسند أحمد | ٥٢١٢

**ثعلبة بن زهدم** دەڵێ: علي بن أبي طالب رضي الله عنه أبا مسعود ـی لەسەر خەڵکی جێهێشت، ڕۆژی جەژن چوونە دەرەوە، وتی: ئەی خەڵکینە لە سوننەت نیە نوێژ کردن پێش ئیمام.

عَنْ ثَعْلَبَةَ بْنِ زَهْدَمٍ، أَنَّ عَلِيًّا اسْتَخْلَفَ أَبَا مَسْعُودٍ عَلَى النَّاسِ، فَخَرَجَ يَوْمَ عِيدٍ، فَقَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ، إِنَّهُ لَيْسَ مِنَ السُّنَّةِ أَنْ يُصَلَّى قَبْلَ الْإِمَامِ.

سنن النسائي | ١٥٦١

**هشام دەڵێ**: محمد بن سيرين نوێژی نەدەکرد نە لە پێش نوێژی جەژنەوە نە لە دوایەوە .

حَدَّثنا ابنُ إدريسَ، عَن هِشامٍ، عَن ابنِ سيرينَ، قال: كانَ لا يُصلِّي قبل العيدِ وَلا بعده.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٩٨

**إسماعيل** دەڵێ: عامر الشعبي پیاوێکی بینی دوای نوێژی جەژن نوێژی دەکرد ڕایکێشا نەیهێشت.

حَدَّثنا ابنُ إدريسَ، عَن إسماعيلَ، قال: رأى الشَّعبيُّ إنسانًا يُصلِّي بعدما انصرفَ الإمام فَجَبَذَه.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٩٩ كتاب العيدين للفريابي | ١٧٧

**الضحاك** دەڵێ: نوێژی جەژن نە لە پێشیەوە نوێژ دەکرێ نە لە دوایەوە.

حَدَّثنا وَكيعٌ، عَن سَلَمَةَ، عَنِ الضَّحّاكِ، قال: لا صَلَّاة قبلها وَلا بعدها.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٠٠

**عامر الشعبي** دەڵێ: لەگەڵ شريح نوێژی جەژنم کرد نە لە پێشیەوە نوێژی کرد نە لە دوایەوە، هاتم بۆ مەدینە کەسێکم نەدی لە فوقەها پێش نوێژی جەژن نوێژ بکات وە لە دوایشیەوە.

حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ، حَدَّثَنَا عَبْثَرٌ، عَنْ مُطَرِّفٍ، عَنْ عَامِرٍ، قَالَ: صَلَّيْتُ مَعَ شُرَيْحٍ الْعِيدَ فَلَمْ يُصَلِّ قَبْلَهَا وَلَا بَعْدَهَا، وَأَتَيْتُ الْمَدِينَةَ وَهُمْ مُتَوَافِرُونَ، فَمَا رَأَيْتُ أَحَدًا مِنَ الْفُقَهَاءِ يُصَلِّي قَبْلَهُ وَلَا بَعْدَهُ .

كتاب العيدين للفريابي | ١٧٩

**إسماعيل بن أبي خالد دەڵێ:** عامر الشعبي: نوێژی نەدەکرد نە لە پێش نوێژی جەژنەوە نە لە دوایەوە.

حَدَّثنا وَكيعُ، عَن إسماعيلَ بنِ أَبي خالدٍ، عَنِ الشَّعبيُّ، أَنَّه كانَ لا يُصلِّي قبلها، وَلا بعدها.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٠١

ابن الحنيفة دەڵێ: نوێژی جەژن نە لە پێشیەوە نە لە دوایەوە نوێژ نییە.

حَدَّثنا وَكيعُ، عَن إسماعيلَ، عَن أَبي عُمَرَ، عَنِ ابن الحَنفيةَ، قال: لا صَلَّاة قبلها وَلا بعدها.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٠٢

عمرو بن عبدالله دەڵێ: ڕۆژی جەژن لەگەڵ مسروق چوومە دەرەوە، هەستام نوێژی سونەت بکەم کراسەکەی ڕاکێشام و داینیشاندم، پاشان وتی: نوێژ ناکرێ هەتا ئیمام نوێژ دەکات.

حَدَّثنا عُبيدالله بن موسى، قال: أَخبرنا إسرائيلَ، عَن أَبي إسحاقَ، عَن عمرو بن عبداللهِ الأَصَمِّ، أَنَّه خَرَجَ مع مسروقٍ في يومِ عيدٍ، فقُمتُ أُصَلِّي فأَخذَ بِثيابي فأَجلَسني، ثُمَّ قال: لا صَلَّاة حتى يُصلِّيَ الإمام.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٠٣

**محمد بن سيرين** دەڵێ: ابن مسعود و حذيفة نەهییان دەکرد لە خەڵکی یاخود وتی: هەرکەسێکیان بینیبا پێش ئەوەی ئیمام نوێژی جەژن بکات دایاندەنیشاند .

عَن مَعمَرٍ، عَن أيوب، عَنِ ابن سيرينَ، أَنَّ ابن مسعود وَحُذيفة كانا ينهيان النّاس. أو قال: يُجلسان مَن رأياه يُصلي قبل خروج الإمام وَبعده.

المصنف لعبدرزاق | ٥٦٧٧

**أبي إسحاق** دەڵێ: پرسیار کرا لە علقمة بن قيس دەربارەی نوێژ کردن پێش دەرچوونی ئیمام بۆ نوێژی جەژن، وتی: صەحابەی ڕەسول الله ﷺ پێش نوێژی جەژن نوێژیان نەدەکرد، کەسەکە وتی: سەیرکە ئەگەر بیکەم؟ وتی: من هەواڵم پێدای لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، ئیتر خۆت دەزانی.

عَن معمَرٍ، عَن أبي إسحاقَ، قال: سُئِلَ علقمة بن قَيسٍ، عَنِ الصلاة قبل خروج الإمام يَوم العيد، فقال: كانَ أَصحاب النبي ﷺ لا يُصلون قبلها، قال السائل: أرأيت قد صلّيت؟ قال: قد أَخبرتُكَ عَن فِعل أَصحابِ النبي ﷺ، وَأَنتَ أَعلم.

المصنف لعبدرزاق | ٥٦٧٨

**إبن شهاب الزهري** دەڵێ: لە هیچ یەکێك صەحابەی ڕەسول الله ﷺ ئەمان بیستووە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و قوربان‌دا پێش نوێژ و دوای نوێژ نوێژی سوننەت بکەن، ئیللا مەگەر کەسێك بە مزگەوتی ڕەسول الله ـدا ﷺ تێپەڕێ ئەوکات نوێژی سوننەت بکات.

حَدَّثَنَا إِسْحَاقُ بْنُ سَيَّارٍ، حَدَّثَنَا أَبُو صَالِحٍ، حَدَّثَنِي اللَّيْثُ، قَالَ: وَحَدَّثَنِي يُونُسُ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ: وَلَمْ يَبْلُغْنَا أَنَّ أَحَدًا، مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ كَانَ يُسَبِّحُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَالْأَضْحَى قَبْلَ الصَّلَاةِ وَلَا بَعْدَهَا، إِلَّا أَنْ يَمُرَّ مَارٌّ مِنْهُمْ لِمَسْجِدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَيُسَبِحُ فِيهِ.

كتاب العيدين للفريابي ا ١٦٤

**إسماعيل بن أبي خالد** دەڵێ: لەگەڵ عامر الشعبي چووم بۆ نوێژی جەژن، نە لە پێشیەوە نوێژی کرد نە لە دوایەوە، پاشان لەگەڵ مسروق و شريح چووین بۆ الجبانة دەشت و صەحرا، نە لە پێشیەوە نوێژمان کرد نە لە دوایەوە. پیاوێک هەستا دوای نوێژی جەژن نوێژ بکات، عامر نەهی لێکرد و نەیهێشت لە دوای نوێژی جەژن نوێژ بکات.

عَنِ ابن التيمي، عَن إسماعيل بن أبي خالد، عَنِ الشَعبي، قال: خَرجتُ معه في يوم عيدٍ، فلم يُصل قبلها ولا بعدها. قال: ثُمَّ خرجتُ أنّا وَمسروق

وَشُريحُ إلى الجَبّانة، فلم نُصلها قبلها وَلا بعدها. قال إسماعيل: وَقام رَجل يُصلي يوم العيد بعد الصلاة، فنهاه عامر فلم يدعها يصلي بعدها.

المصنف لعبدرزاق | ٥٦٧٩

**إبن شهاب الزهري** دەڵێ: نازانین کەسێك هەبووبێ پێش نوێژ کردنی ئیمام نوێژ بکات و نە لە دوایشیەوە.

عَن مَعمَرٍ، عَنِ الزُّهري، قال: ما علمنا أحدًا كانَ يُصلي قبل خروج الإمام يوم العيد ولا بعده.

المصنف لعبدرزاق | ٥٦٨٦

**إبراهيم النخعي** دەڵێ: نوێژی سوننەت ناکرێ پێش دەرچوونی ئیمام بۆ نوێژی جەژن .

حَدَّثَنَا قُتَيْبَةُ، حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ، عَنْ مُغِيرَةَ، عَنْ إِبْرَاهِيمَ، قَالَ: لَا صَلَاةَ قَبْلَ خُرُوجِ الْإِمَامِ.

كتاب العيدين للفريابي | ١٨٣

**أيوب السختياني** دەڵێ: بينيم أنس بن مالك و حسن البصري لە ڕۆژی جەژندا پێش دەرچوونی ئیمام نوێژی سوننەتیان دەکرد.

حَدَّثنا إسماعيل ابنُ عُلَيَّة، عَن أيوبَ، رأيتُ أنسَ بنَ مالِكٍ والحَسَنَ يُصَلِّيانِ قبل خروج الإمام، يعني يوم العيدِ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨١٥

**معاذ بن معاذ** دەڵێ: سليمان التيمي هەریەك لە أنس بن مالك و حسن البصري و سعيد ـی برای و جابر بن زيد ـی بينيون لە ڕۆژی جەژندا نوێژی سوننەتیان کردووە پێش دەرچوونی ئیمام .

حَدَّثنا مُعاذُ بنُ مُعاذٍ، عَنِ التَّيميِّ، أَنَّه رأى أَنَسًا وَالحَسَنَ وَسعيد بنَ أَبي الحَسَنِ وَجابرَ بنَ زَيد يُصَلُّونَ قبل الإمام في العيدين.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨١٧ كتاب العيدين للفريابي | ١٨٢

**عبدالله الداناج** دەڵێ: أبا برزة الأسلمي ـم بينی پێش نوێژی جەژن نوێژی سوننەتی دەکرد.

حَدَّثنا مُعاذُ، عَنِ التَّيميِّ، عَن عبداللهِ الدَّاناجِ، قال: رأيتُ أبا بَرزَةَ يفعله.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨١٨

**الحكم** دەڵێ: الأسود لە ڕۆژی جەژندا پێش دەرچوونی ئیمام نوێژی سوننەتی دەکرد.

حَدَّثنا غُندَرٌ، عَن شُعبَةَ، عَنِ الحَكَمِ، عَنِ الأسوَدَ أنَّ كانَ يُصَلِّي يوم العيدِ قبل خروج الإمام.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٨٢٠

**قتادة** دەڵێ: أنس بن مالك و أبو هريرة و حسن البصري و سعيد ی برای و جابر بن زيد لە ڕۆژی جەژندا پێش دەرچوونی ئیمام نوێژی سوننەتیان دەکرد هەروەها لە دوایشیەوە.

عَن معمَر، عَن قتادة، قال: كانَ أَنَسُ وَأبو هريرة والحَسَن وَأخوه سعيد وَجابر بن زيد يُصلون قبل خروج الإمام للعيد وَبعده.

المصنف لعبدرزاق | ٥٦٧١

**إبن هانئ** دەڵی: پرسیام کرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی نوێژی سوننەت پێش و دوای نوێژی جەژن؟ وتی: نوێژ ناکرێ نە لە پێشیەوە نە لە دوایەوە، ڕەسول الله ﷺ دەرچوو بۆ نوێژی جەژن نە لە پێشیەوە و نە

لە دوایەوە نوێژی نەکرد، ئەهلی بەصرە هەندێکیان پێش نوێژی جەژن سوننەتیان دەکرد، وە ئەهلی کوفە هەندێکیان دوای نوێژی جەژن سوننەتیان دەکرد.

وسألته عَنِ الصلاة قبل وبعد؟ قال: لا صلاة قبل ولا بعد، خَرَجَ النبي ﷺ إلى العيد فلم يصل قبل ولا بعد، وأهل البصرة يصلي بعضهم قبل، وأهل الكوفة بعضهم يصلي بعد.

مسائل أحمد بن حنبل رواية ابن هانئ | ٤٧٩

**إسحاق بن منصور الكوسج** دەڵێ: پرسیام کرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی نوێژکردن لە هەردوو جەژنەکەدا پێش دەرچوونی ئیمام؟ وتی: نوێژ ناکرێ نە لە پێشیەوە و نە لە دوایەوە.

**إسحاق بن راهوية** دەڵێ: بەو جۆرەیە کە وتوویەتی.

قلت الصلاة في العيدين قبل خروج الإمام؟ قال: لا يصلي قبل ولا بعد.

قال إسحاق: كَما قال.

مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية الكوسج | ٣٩٩



# نوێژی جەژن و تەکبیراتی

**نافع** دەڵێ: عبدالله بن عمر رضي الله عنهما تەکبیری دەکرد کاتێك دەڕۆیشت بۆ نوێژی جەژن بۆ موصەلا .

حَدَّثَنَا عَبْدُاللَّه بْنُ جَعْفَرِ بْنِ يَحْيَى، أنبَأَنَا مَعْنٌ، عَنْ مَالِكٍ، عَنْ نَافِعٍ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا : أَنَّهُ كَانَ يُكَبِّرُ إِذَا غَدَا إِلَى الْمُصَلَّى يَوْمَ الْعِيدِ.

كتاب العيدين للفريابي | ٣٩

**عبدالعزيز بن يحيى** دەڵێ: پرسیارم کرد لە عبدالله بن نافع، ئایا مالك بن أنس لە ڕۆژی جەژندا تەکبیری دەکرد؟ وتی: مالك بن أنس کە دەچوو بۆ موصەلا تەکبیری دەکرد هەتا ئەو کاتەی ئیمام دەهات.

حَدَّثَنِي أَبُو الْأَصْبَغِ عَبْدُ الْعَزِيزِ بْنُ يَحْيَى، قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ نَافِعٍ، كَيْفَ كَانَ مَالِكٌ يَفْعَلُ فِي التَّكْبِيرِ؟ قَالَ: كَانَ مَالِكٌ يُكَبِّرُ إِذَا أَتَى الْمُصَلَّى حَتَّى يَجِيءَ الْإِمَامُ.

كتاب العيدين للفريابي | ٤٠

**الوليد بن مسلم** دەڵێ: پرسیارم کرد لە الأوزاعي و مالك بن أنس دەربارەی دەرخستن و تەکبیر کردن لە جەژنەکاندا، وتیان: بەڵێ، عبدالله بن عمر رضي الله عنه لە ڕۆژی جەژندا تەکبیری دەکرد هەتا ئیمام دەهات.

حَدَّثَنِي صَفْوَانُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، قَالَ: سَأَلْتُ الْأَوْزَاعِيَّ، وَمَالِكَ بْنَ أَنَسٍ عَنْ إِظْهَارِ التَّكْبِيرِ فِي الْعِيدَيْنِ، قَالَا: نَعَمْ، كَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يُظْهِرُهُ فِي يَوْمِ الْفِطْرِ حَتَّى يَخْرُجَ الْإِمَامُ.

كتاب العيدين للفريابي | ٤١

**إبن شهاب الزهري** دەڵێ: لە ڕۆژی جەژندا تەکبیر بکەن، چونکە ئەوە ڕۆژی تەکبیر کردنە .

حَدَّثَنِي عَمْرُو بْنُ عُثْمَانَ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، عَنِ ابْنِ أَبِي ذِئْبٍ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، قَالَ: أَظْهِرُوا التَّكْبِيرَ يَوْمَ الْفِطْرِ، فَإِنَّهُ يَوْمُ تَكْبِيرٍ.

كتاب العيدين للفريابي | ٤٢

**شعبة بن الحجاج** دەڵێ: بە الحكم و حماد ـم وت: ئەگەر چووم بۆ نوێژی جەژن تەکبیر بکەم؟ وتیان: بەڵێ.

حَدَّثنا ابنُ عُلَيَّة، عَن شُعبَة، قال: قُلتُ لِلحَكَمَ وَحَمَّادٍ أُكَبِّرُ إذا خَرجتُ إلى العيد، قالا: نعم.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٦٧٨

**هشام بن عروة** دەڵێ: باوکم لە ڕۆژی جەژندا تەکبیری دەکرد.

حَدَّثنا حَفص بن غِياث، وأبو مُعاوية، عَن هِشام بن عُروة، أنَّ أباه كانَ يُكَبِّر يوم العيد.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٦٧٩

**إبن شهاب الزهري** دەڵێ: خەڵکی لە ڕۆژی جەژندا کاتێك لە ماڵ دەهاتنە دەرەوە تەکبیریان دەکرد هەتا دەگەیشتنە موصەلا و ئیمام دەهات، کە ئیمام دەهات ئیتر بێدەنگ دەبوون، کە ئیمام تەکبیری دەکرد ئەوانیش تەکبیریان دەکرد .

حَدَّثنا يزيد بن هارون، عَنِ ابن ذَئبٍ، عَنِ الزُّهري، قال: كانَ النَّاس يُكَبِّرون في العيد حينَ يَخرجون مِن منازلهم حتى يأتوا المُصَلى وَحتى يَخرُج الإمام، فإذا خَرَجَ الإمام سَكَتوا فإذا كَبرَّ كَبرَّوا.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٦٨٠ كتاب العيدين للفريابي | ٥٩

**جرير** دەڵێ: هیچم لە جعفر بن محمد نەبیست، بەڵام لەگەڵ عبدالله بن الحسن لە ڕۆژی جەژندا تەکبیریان دەکرد، وە دەنگیان هێندە بەرز بوو زاڵ بوو بەسەر دەنگی خەڵکیدا .

سَمِعْتُ عُثْمَانَ بْنَ أَبِي شَيْبَةَ، قَالَ: قَالَ جَرِيرٌ: لَمْ أَسْمَعْ مِنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ شَيْئًا، إِلَّا أَنِّي رَأَيْتُهُ وَعَبْدَ اللَّهِ بْنَ الْحَسَنِ يُكَبِّرَانِ يَوْمَ الْعِيدِ، وَقَدْ عَلَتْ أَصْوَاتُهُمَا أَصْوَاتَ النَّاسِ.

كتاب العيدين للفريابي | ٦٥

**شافعي** دەڵێ: الله ﷻ دەربارەی مانگی ڕەمەزان فەرموویەتی: ﴿وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ﴾. لە ئەهلی عیلمم بیستووە ئەوانەی لێیان ڕازیم و شارەزان بە قورئان دەڵێن: لِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ: ژمارەی ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان، وَلِتُكَبِّرُوا اللهَ: کاتێك مانگەکە تەواو دەبێ، تەکبیر بکەن لەسەر ئەو هیدایەتەی پێتان بەخشرا بەڕۆژوو بن، وە تەواو بوونیشی خۆرئاوابوونی کۆتا ڕۆژی مانگی ڕەمەزانە.

وە هەرکات مانگی شەوال بینرا پێم خۆشە خەڵکی بە تاك و جەماعەت تەکبیر بکەن لە مزگەوت و بازاڕ و ڕێگا و بان و ماڵەوە، وە بەهەمان

شێوەش موسافر و نیشتەجێ، لە هەموو حاڵێكدا تەكبیر بكەن لە هەر شوێنێك بن، بەردەوام تەكبیر دەكەن هەتا دەچن بۆ موصەلا، وە هەتا دەگەنە ئەوێش، هەتا ئەو كاتەی ئیمام دەردەچێ، ئەوكات واز لە تەكبیر كردن دێنن .

قال الشافعي: قال الله تبارکَ وَتعالى في شهر رمضان: ﴿ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ ﴾. فَسمعتُ مَن أرضى مِن أهل العلم بالقرآن يقول: «لِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ»: عِدَّةَ صَومِ شهر رمضان، «وَلِتُكَبِّرُوا اللهَ» عند إكماله، على ما هداكم، وإكمالُه: مَغيبُ الشَّمسِ مِن آخرِ أيام شهرِ رمضان.

فإذا رأَوا هلال شَوَّال أحببتُ أن يُكبِّرَ النَّاسُ جماعةً وفرادى في المسجدِ والأسواقِ والطُّرق والمنازل، ومسافرينَ ومُقيمينَ، في كُلِّ حالٍ، وأينَ كانوا، وأن يُظهروا التكبيرَ، ولا يزالون يكبِّرون، حتى يَغدوا إلى المُصَلَّى، وبعدَ الغُدُوِّ، حتى يخرج الإمامُ للصلاة، ثُمَّ يَدَعوا التكبير.

كتاب الأم للشافعي | **(٤١٤/١)**

**شافعي** دەڵێ: خەڵکی دەست دەکەن بە تەکبیر کردن کاتێك خۆرئاوا دەبێ لە شەوی جەژندا بە تاك و کۆ لە هەموو حاڵێکدا هەتا ئەوکاتەی ئیمام دەردەچێ بۆ نوێژی جەژن، پاشان تەکبیر کردن ڕادەگرن.

وە پێم خۆشە ئیمام لە دوای نوێژی مغریب و عیشا و بەیانی و لە نێوانیشیاندا تەکبیر بکات، وە هەتا دەگاتە موصەلا، پاشان تەکبیر ڕادەگرێ، وە ئەمەم بۆ ئیمام پێ خۆشە، وە ئەویش وەك ئەو خەڵکەیە کە پێم خۆشە بۆیان، وە ئەگەر ئیمام ئەمە تەرك بکات، ئەوە دەبێ خەڵکی بیکەن .

قال الشافعی: يُكبِّرُ النَّاس في الفطر، حينَ تَغيبُ الشَّمس ليلة الفِطرِ فُرادى وَجماعةً في كُلِّ حالٍ، حتى يخرج الإمامُ لصلاةِ العيدِ، ثُمَّ يقطعونَ التكبير.

وَأُحِبُّ أن يكونَ الإمام يُكبِّر خلفَ صلاةِ المغرب والعشاء والصبح، وبينَ ذالکَ، وغاديًا حتى ينتهي إلى المُصلَّى، ثُمَّ يقطع التكبير، وإنَّما أَحببتُ ذالکَ للإمام، أَنَّه كالنَّاسِ فيما أُحِبُّ لهم، وإن تركه الإمامُ، كَبَّرَ النَّاس.

كتاب الأم للشافعي | **(٤٣٠/١)**

**إبن هانئ** دەڵێ: پرسیارم كرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی تەكبیر كردن لە جەژنی ڕەمەزان و قوربان؟ وتی: لە جەژنی ڕەمەزاندا واجبترە، لەبەر قەولی الله ﷻ: ﴿ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَاكُمْ ﴾. ئەمما عبدالله بن عمر لە جەژنی ڕەمەزان و قوربانیشدا تەكبیری دەكرد.

پێم وت: تەكبیر دەكرێ كاتێك خەڵكی لە نویژ كردن دەگەڕێنەوە؟ وتی: تەكبیر دەكرێ كاتێك ئیمام پشت هەڵدەكات و دەگەڕیتەوە.

وتم: وای دەبینی تەكبیر بكرێ لەو ساتەوەی بەربانگ دەكرێتەوە مغریب؟ وتی: عبدالله بن عمر دوای نوێژی عیشا تەكبیری دەكرد .

سألته عَنِ التَكبير في الفطر والأضحى؟ قال: هو في الفطر أوجَب، لقول الله عَزَّ وَجَّلَ: ﴿ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ ﴾. وأمَّا ابن عمر يكبر في الفطر، وفي الأضحى.

قلت له: يكبر إذا رجع النَّاس مِنَ الصلاة؟ قال: يكبر إذا وَلى الإمام راجعًا.

قلت: فترى أن يكبر من ساعة الإفطار مِنَ المغرب؟ قال: كانَ ابن عمر يكبر إذا صلَّى العشاء.

مسائل أحمد بن حنبل رواية ابن هانئ ا ٤٧٢

**كثير بن عبدالله** لە باوکیەوە لە باپیریەوە دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە نوێژی دوو جەژنەکەدا لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت تەکبیرەی دەکرد، لە ڕکاتی دووەمیشدا پێنج تەکبیرەی دەکرد پێش قیرائە .

**عَنْ كَثِيرِ بْنِ عَبْدِالله، عَنْ أَبِيهِ، عَنْ جَدِّهِ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَبَّرَ فِي الْعِيدَيْنِ: فِي الْأُولَى سَبْعًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ وَفِي الْآخِرَةِ خَمْسًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ.**

سنن أبي داود ا ١١٤٩ سنن الترمذي ا ٥٤٤ سنن ابن ماجه ا ١٢٧٩ مسند أحمد ا ٢٤٣٦٢ سنن الدارقطني كتاب العيدين ا ٢٣

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: عەمەل کردن بەم حدیثەیە لای هەندێك لە ئەهلی عیلم لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ، وە غەیری ئەوانیش. وە بەم جۆرە لە أبی هريرة ـوە ڕیوایەت کراوە لە مەدینە بەم شێوازە نوێژی کردووە، وە ئەمە قەولی ئەهلی مەدینەیە، وە قەولی مالك بن أنس و شافعی و أحمد و إسحاق بن راهوية ـشە. وە لە عبدالله بن مسعود ڕیوایەت کراوە وتوویەتی: تەکبیراتی نوێژی جەژنەکان لە ڕکاتی یەکەمدا نۆ تەکبیرە، پێنجیان پێش قیرائە، وە لە دووەمیشدا دەست دەکات بە قیرائە، پاشان چوار تەکبیرە لەگەڵ تەکبیرەی ڕکوع. وە لە

غەیری کەسێك لە صەحابەی ڕەسول الله ﷺ لەم شێوازە ڕیوایەت کراوە. وە ئەمە قەولی ئەهلی کوفەیە، وە قولی سفیان الثوری ـیە.

وَالْعَمَلُ عَلَى هَذَا عِنْدَ بَعْضِ أَهْلِ الْعِلْمِ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ وَغيْرِهِمْ. وَهَكَذَا رُوِيَ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّهُ صَلَّى بِالْمَدِينَةِ نَحْوَ هَذِهِ الصَّلَاةِ، وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، وَبِهِ يَقُولُ مَالِكُ بْنُ أَنَسٍ، وَالشَّافِعِيُّ، وَأَحْمَدُ، وَإِسْحَاقُ، وَرُوِيَ عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّهُ قَالَ فِي التَّكْبِيرِ فِي الْعِيدَيْنِ: تِسْعَ تَكْبِيرَاتٍ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى، خَمْسًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ، وَفِي الرَّكْعَةِ الثَّانِيَةِ يَبْدَأُ بِالْقِرَاءَةِ، ثُمَّ يُكَبِّرُ أَرْبَعًا مَعَ تَكْبِيرَةِ الرُّكُوعِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنْ غَيْرِ وَاحِدٍ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ نَحْوُ هَذَا. وَهُوَ قَوْلُ أَهْلِ الْكُوفَةِ، وَبِهِ يَقُولُ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ.

**نافع** دەڵێ: ئامادەی نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان بووم لەگەڵ أبي هريرة، لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت تەکبیرەی کرد پێش قیرائە، وە لە ڕکاتی دووەمدا پێنج تەکبیرەی کرد پێش قیرائە.

عَنْ نَافِعٍ -مَوْلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ- أَنَّهُ قَالَ: شَهِدْتُ الْأَضْحَى وَالْفِطْرَ مَعَ أَبِي هُرَيْرَةَ، فَكَبَّرَ فِي الرَّكْعَةِ الْأُولَى سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ، وَفِي الْآخِرَةِ خَمْسَ تَكْبِيرَاتٍ قَبْلَ الْقِرَاءَةِ .

الموطأ لمالک ا ٤٤٥ كتاب الأم للشافعي ا ٥٤٤ مسند الشافعي ا ٢٧١ المصنف لعبدرزاق ا ٥٧٥١ المصنف لابن أبي شيبة ا ٥٧٥٧ كتاب العيدين للفريابي ا ١١٠

**نافع** دەڵێ: مروان بن الحكم ئەمیری مەدینە بوو أبا هريرة ـ رضي الله عنه لەسەر خەڵکی جێهێشت نوێژی دوو جەژنەکەی بۆ کردن لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت تەکبیرەی کرد، پاشان قیرائە ئەنجا تەکبیرەی ڕکوع، پاشان هەستایەوە لە ڕکاتی دووەمدا پێنج تەکبیرەی کرد، پاشان قیرائە ئەنجا تەکبیرەی ڕکوع.

حَدَّثنَا عَبْدُ الْأَعْلَى بْنُ حَمَّادٍ، حَدَّثنَا وُهَيْبٌ، حَدَّثنَا أَيُّوبُ، عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ، اسْتَخْلَفَهُ مَرْوَانُ بْنُ الْحَكَمِ، فَصَلَّى بِهِمْ فِي الْعِيدَيْنِ فَكَبَّرَ سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ فِي الْأُولَى، ثُمَّ قَرَأَ وَكَبَّرَ، ثُمَّ قَامَ فَكَبَّرَ خَمْسَ تَكْبِيرَاتٍ، ثُمَّ قَرَأَ وَكَبَّرَ.

كتاب العيدين للفريابي ا ١١١

**الوليد بن مسلم** دەڵێ: بە الأوزاعي ـ م وت: لە نوێژی جەژندا چەند تەکبیرە دەکرێ؟ وتی: حەوت و پێنج. بیستم إبن شهاب الزهري دەیوت:

ئەوەی سوننەتە و لە پێش خۆمانەوە پێمان گەیشتووە لە نوێژی جەژندا: لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت تەکبیرە پاشان قیرائە، پاشان تەکبیرەی ڕکوع، پاشان سوجدە دەبات، پاشان هەڵدەستیتەوە بۆ ڕکاتی دووەم پێنج تەکبیرە دەکات، پاشان قیرائە ئەنجا سوجدە دەبات .

حَدَّثَنا صَفْوَانُ بْنُ صَالِحٍ، حَدَّثَنا الْوَلِيدُ بْنُ مُسْلِمٍ، قَالَ: قُلْتُ لِلْأَوْزَاعِيِّ: كَمْ يُكَبِّرُ فِي صَلَاةِ الْعِيدِ؟ فَقَالَ: سَبْعَ وَخَمْسَ، سَمِعْتُ الزُّهْرِيَّ يَقُولُ: إِنَّ السُّنَّةَ مَضَتْ فِي صَلَاةِ الْعِيدِ: أَنْ يُكَبِّرَ سَبْعَ تَكْبِيرَاتٍ فِي الْأُولَى ثُمَّ يَقْرَأُ، ثُمَّ يُكَبِّرُ فَيَرْكَعَ، ثُمَّ يَسْجُدُ، ثُمَّ يَقُومُ فَيُكَبِّرُ خَمْسًا، ثُمَّ يَقْرَأُ فَيُكَبِّرُ وَيَسْجُدُ.

كتاب العيدين للفريابي ا ١٠٧

**جعفر بن محمد** لە باوکیەوە دەڵێ: علي بن أبي طالب رضي الله عنه لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان و نوێژە بارانەدا لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت تەکبیرەی دەکرد، وە لە ڕکاتی دووەمدا پێنج تەکبیرەی دەکرد، وە نوێژی پێش وتار دەکرد، وە قیرائەکەی جەهری بوو، وە دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ، وە أبي بكر و عمر و عثمان رضي الله عنهما وایان دەکرد.

عَنِ ابن أبي يحيى، عَن جعفر بن محمد، عَن أبيه، قال: كانَ عليٌّ يُكبرِ في الأضحى، وَالفِطرِ، وَالإستسقاء سبعًا في الأول وَخمسًا في الأخرى، وَيُصلي قبل الخطبة، ويجهر بالقراءة، قال: وَكانَ رسول اللهِ ﷺ، وَأَبو بكر، وَعُمر، وَعثمان يفعلون ذالکَ.

المصنف لعبدرزاق | ٥٧٤٩

**الوليد بن مسلم** دەڵێ: بە الاوزاعي ـم وت: لە نوێژی جەژندا دەستەکانم بەرز بکەمەوە وەك چۆن بۆ تەکبیرەی نوێژ بەرزیان دەکەمەوە؟ وتی: بەڵێ، بەرزیان بکەرەوە لەگەڵ هەموو تەکبیرەیەك.

حَدَّثَنَا صَفْوَانُ، حَدَّثَنَا الْوَلِيدُ، قَالَ: قُلْتُ لِلْأَوْزَاعِيِّ: فَأَرْفَعُ يَدِي كَرَفْعِي فِي تَكْبِيرَةِ الصَّلَاةِ، قَالَ: نَعَمْ، ارْفَعْ يَدَيْكَ مَعَ كُلِّهِنَّ.

كتاب العيدين للفريابي | ١٣٦

**الوليد بن مسلم** دەڵێ: پرسیارم کرد لە مالك بن أنس دەربارەی دەست بەرزکردنەوە لە نوێژی جەژندا؟ وتی: بەڵێ لەگەڵ هەموو تەکبیرەیەك دەستەکانت بەرزبکەرەوە، وە تا ئێستا هیچم نەبیستووە دەربارەی.

حَدَّثنا صَفْوَانُ، حَدَّثَنا الْوَلِيدُ، قَالَ: سَأَلْتُ مَالِكَ بْنَ أَنَسٍ عَنْ ذَلِكَ، فَقَالَ: نَعَمِ ارْفَعْ يَدَيْكَ مَعَ كُلِّ تَكْبِيرَةٍ، وَلَمْ أَسْمَعْ فِيهِ شَيْئًا.

كتاب العيدين للفريابي | ١٣٧

**شافعي** دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ دەستەکانی بەرز دەکردەوە کاتێك دەستی دەکرد بە نوێژ، وە کاتێك دەیویست بچێتە ڕکوع، وە کاتێك لە ڕکوع سەری بەرز دەکردەوە، ئەمما لە سوجدەدا بەرزی نەدەکردەوە، کاتێك کە ڕەسول الله ﷺ لە هەموو زیکرێکدا و لە هەموو تەکبیرەیەکدا، وە لە کاتی وتنی سمع الله لمن حمده، وە لە کاتی هەموو زیکرێکی الله ﷻ لە کاتی بەرزبوونەوەی بۆ وەستان یاخود بەرزبوونەوەی بۆ وەستان لە غەیری سوجدە دەستەکانی بەرز کردووەتەوە، ئەوکات هیچ نامێنێتەوە ئیللا دەبێ بوترێ: لە نوێژی جەژنەکاندا لەگەڵ هەموو تەکبیرەیەك دەبێ دەستەکان بەرز بکرێنەوە کاتێك کە وەستاوە جا تەکبیرەی دابەستنی نوێژ بێ یاخود حەوت تەکبیرەی ڕکاتی یەکەم و پێنج تەکبیرەی ڕکاتی دووەم، وە دەستەکانی بەرز دەکاتەوە کاتێك دەڵێ: سمع الله لمن حمده، لەبەرئەوەی ئەو شوێنەیە کە ڕەسول الله ﷺ تیایدا دەستەکانی بەرز کردووەتەوە، وە ئەگەر بە عەمدی تەرکی بکات یاخود بیری بچێ، بە

کەراهەتی دەبینم، بەڵام پێویست بە دووبارە کردنەوەی ناکات، وە سوجدەی سەهویشی پێویست نییە .

قال الشافعي: رَفَعَ رسول اللهِ ﷺ يَديه حين افتتح الصلاة، وحين أرادَ أن يركع، وحينَ رفع رأسه مِنَ الركوع، ولم يرفع في السجود، فلما رَفَعَ رسول اللهِ ﷺ في كل ذِكرٍ، تكبيرةٍ وقول: سمع الله لمن حَمده، وكانَ حينَ يَذكُرُ الله جَلَّ وَعَزَّ رافعًا قائمًا أورافعًا إلى قيام مِن غير سجود، فلم يَجُز إلا أن يُقال: يَرفَع المكبرِّ في العيدين يَديه عندَ كُل تكبيرةٍ كانَ قائمًا فيها وسواء تكبيرةُ الافتتاح والسَّبعِ بعدها والخمس في الثانية، ويرفع يديه عند قوله: سمع الله لمن حَمده، لأنَّه الموضع الذي رَفَعَ رسول اللهِ ﷺ فيه يدَيه مِنَ الصلاة، فإن تَركَ ذالكَ كُله عامدًا أو ساهيًا، أو بعضه، كرهتُ ذالكَ له، ولا إعادةَ للتكبير عليه، ولا سجود للسهو.

كتاب الأم للشافعي | **(١/٤٢٤)**

**عبيدالله بن عمر بن حفص** دەڵێ: یەکێك لە ئەمیرەکانی شام هاتە مەدینە لامان، کاتێك ویستی نوێژ بکات لە تەکبیرەکاندا کێشەی هەبوو، لای کردەوە بۆ عبیدالله بن عبدالله بن عمر وە من لەگەڵی بووم، وتی:

ئەی عبيدالله تەکبیرەکان چۆنن؟ وتی: لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت، لە ڕکاتی دووەمدا پێنج.

حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ الْمُثَنَّى، حَدَّثنا عَبْدُ الْوَهَّابِ، حدثنا عُبَيْدُاللَّه، قَالَ: قَدِمَ عَلَيْنَا أَمِيرٌ مِنْ أَهْلِ الشَّامِ، فَلَمَّا أَرَادَ أَنْ يُصَلِّيَ أَشْكَلَ عَلَيْهِ التَّكْبِيرُ، فَالْتَفَتَ إِلَى عُبَيْدِاللَّه بْنِ عَبْدِ اللَّه بْنِ عُمَرَ وَأَنَا مَعَهُ، فَقَالَ: كَيْفَ التَّكْبِيرُ يَا عُبَيْدَاللَّه؟ قَالَ: سَبْعٌ فِي الْأُولَى وَخَمْسٌ فِي الْآخِرَةِ.

كتاب العيدين للفريابي | ١٢٠

**إبن جريج** دەڵێ: بە عطاء بن أبی رباح ـم وت: ئیمام هەردوو دەستەکانی بەرز دەکاتەوە هەرکات تەکبیرە دەکات لە نوێژی جەژنی ڕەمەزاندا؟ وتی: بەڵێ، خەڵکیش دەست بەرز دەکەنەوە.

عَنِ ابن جُرَيجٍ، قال: قلتُ لعطاءٍ يرفع الإمام يَديه كُلما كَبرَ هذه التكبيرة الزيادة في صلاة الفطر؟ قال: نعم، يرفع النّاس أيضًا.

المصنف لعبدرزاق | ٥٧٧١

**معمر** دەڵێ: بیستم إبن شهاب الزهری دەیوت: تەکبیرە کردن لە نوێژی جەژندا پێش قیرائەیە ڕکاتی یەکەم حەوت ڕکاتی دووەم پێنج.

عَن معمَرٍ، عَنِ الزُّهري، قال: سمعته، يقول: التكبير يوم العيد قبل القراءة سبعًا وَخمسًا.

المصنف لعبدرزاق | ٥٧٥٤

**ثابت بن قيس** دەڵێ: لە پشت عمر بن عبدالعزيز ـەوە نوێژی جەژنی ڕەمەزانم کرد لە ڕکاتی یەکەمدا حەوت تەکبیرەی کرد پێش قیرائە لە ڕکاتی دووەمیشدا پێنج تەکبیرەی کرد پێش قیرائە .

حَدَّثنا خالد بن مخلد، قال: حَدَّثنا ثابتُ بنُ قَيسٍ، قال: صَلَّيت خلفَ عمر بن عبدالعزيزِ الفِطرَ فَكَبَّرَ في الأولى سَبعًا قبل القِراءةِ وَفي الثَّانيةِ خمسًا قبل القِراءةِ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٧٧ كتاب العيدين للفريابي | ١١٨

**عمار بن عمار** دەڵێ: عبدالله بن عباس رضي الله عنهما لە نوێژی جەژندا دوانزە تەکبیرەی دەکرد، حەوت تەکبیرە لە ڕکاتی یەکەمدا پێنج تەکبیرەش لە ڕکاتی دووەمدا.

حَدَّثنا يزيد بنُ هارونَ، قال: أنبأنا حُمَيدُ، عَن عَمَّارِ بن عَمَّارٍ، أَنَّ ابنِ عَبَّاسٍ كَبَّرَ في عيدٍ ثنتي عشرَةَ تَكبيرةً سبعًا في الأولى وَخمسًا في الآخرةِ.

المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٧٨

**إبن هانئ** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أحمد بن حنبل دەربارەی تەکبیرە کردن لە نوێژی جەژندا؟ وتی: حەوت تەکبیرە لە ڕکاتی یەکەمدا پێنج تەکبیرەش لە ڕکاتی دووەمدا.

سألته عن التَكبير في العيدين؟ قال: يُكَبِّر سبعًا في الأولى وَخمسًا في الآخرة.

مسائل أحمد بن حنبل رواية ابن هانئ | ٤٦٦

**إسحاق بن منصور الكوسج** دەڵێ: پرسیارم کرد لە أحمد بن حنبل تەکبیرەی نوێژی جەژن چەن دانەن؟ وتی: ئەمما من ئەوە حدیثی أبي هريرة هەڵدەبژێرم حەوت تەکبیرە لە ڕکاتی یەکەمدا پێنج تەکبیرەش لە ڕکاتی دووەمدا.

**إسحاق بن راهوية** دەڵێ: بەو جۆرەیە کە وتوویەتی.

قلت: كم التكبير في العيدين؟ قال: أما أنا فأختار حديث أبي هريرة رضي الله عنه سبعًا وخمسًا.

قال إسحاق: كَما قال.

مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية الكوسج | ٤٠٠

**النعمان بن بشير** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ لە نوێژی هەردوو جەژنەکەدا و نوێژی جمعة ـدا ئەم سورەتانەی دەخوێند: ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ﴾ وَ ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ ﴾ جاری وا دەبوو هەردووکیان لە یەك ڕۆژدا کۆ دەبوونەوە دەیخوێند تیایاندا.

عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْعِيدَيْنِ وَفِي الْجُمُعَةِ بِـ ﴿ سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى ﴾ وَ ﴿ هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ الْغَاشِيَةِ ﴾ وَرُبَّمَا اجْتَمَعَا فِي يَوْمٍ وَاحِدٍ فَيَقْرَأُ بِهِمَا.

صحيح مسلم | ٢٠٢٨ سنن الترمذي | ٥٤١ سنن النسائي | ١٥٦٨ سنن ابن ماجه | ١٢٨١ سنن الدارمي | ١٦٣٣ مسند أحمد | ١٨٤٠٩ مسند أبي داود الطيالسي | ٨٣٢ المصنف لعبدرزاق | ٧٥٧٨ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٨١

**عبيدالله بن عبدالله بن عتبة** دەڵێ: عمر بن الخطاب رضي الله عنه پرسیاری کرد لە أبا واقد الليثي، ڕەسول الله ﷺ لە نوێژی جەژنی قوربان و ڕەمەزاندا کام سورەتانەی دەخوێند؟ وتی: ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ ﴾ وَ ﴿ اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ ﴾ .

عَنْ ضَمْرَةَ بْنِ سَعِيدٍ الْمَازِنِيِّ، عَنْ عُبَيْدِاللَّه بْنِ عَبْدِاللَّه بْنِ عُتْبَةَ بْنِ مَسْعُودٍ، أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، سَأَلَ أَبَا وَاقِدٍ اللَّيْثِيَّ، مَا كَانَ يَقْرَأُ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي الْأَضْحَى وَالْفِطْرِ؟ فَقَالَ: كَانَ يَقْرَأُ بِـ ﴿ق وَالْقُرْآنِ الْمَجِيدِ﴾ وَ ﴿اقْتَرَبَتِ السَّاعَةُ وَانْشَقَّ الْقَمَرُ﴾ .

صحيح مسلم | ٢٠٥٩ سنن أبي داود | ١١٥٤ سنن النسائي | ١٥٦٧ سنن ابن ماجه | ١٢٨٢ الموطأ لمالك | ٤٤٤ كتاب الأم للشافعي | ٥٤٥ مسند الشافعي | ٢٧٣ مسند أحمد | ٢١٨٩٦ المصنف لعبدرزاق | ٥٧٧٥ المصنف لابن أبي شيبة | ٥٧٨٠ كتاب العيدين للفريابي | ١٣٨ سنن الدارقطني كتاب العيدين | ١١



# شەش ڕۆژ ڕۆژووی مانگی شەوال

**أبي أيوب الأنصاري** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: «هەرکەسێک مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ، پاشان شەش ڕۆژ لە مانگی شەوال بەڕۆژوو بێ، ئەوە وەک ئەوە وایە هەموو ساڵەکە بەڕۆژوو بووبێ».

عَنْ عُمَرَ بْنِ ثَابِتِ بْنِ الْحَارِثِ الْخَزْرَجِيِّ، عَنْ أَبِي أَيُّوبَ الْأَنْصَارِيِّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّهُ حَدَّثَهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: « **مَنْ صَامَ رَمَضَانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ، كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ** ».

صحيح مسلم | ٢٧٥٨ سنن أبي داود | ٢٤٣٣ سنن الترمذي | ٧٦٩ سنن ابن ماجه | ١٧١٦ سنن الدارمي | ١٧٨٠ مسند أحمد | ٢٢٥٣٣ مسند أبي داود الطيالسي | ٥٩٥ المصنف لعبدرزاق | ٨٠٦١ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٨١٣ مسند الحميدي | ٣٨٥ صحيح ابن خزيمة | ٢١١٤

**الترمذي** دوای ڕیوایەت کردنی ئەم حدیثە دەڵێ: کۆمەڵێک بە موستەحەب و چاکیان داناوە شەش ڕۆژ ڕۆژووی شەوال لەبەر ئەم حدیثە. عبدالله بن المبارك دەڵێ: شێکی باشە، وەک ڕۆژووی سێ ڕۆژە

لە هەموو مانگێکدا. وە عبدالله بن المبارک دەڵێ: لە هەندێک حدیثدا ڕیوایەت کراوە، وە بکرێتە پاشکۆی ڕۆژووی ڕەمەزان. هەڵبژاردەی عبدالله بن المبارک ئەوەیە شەش ڕۆژی سەرەتای مانگەکە بێ. وە ڕیوایەت کراوە لە عبدالله بن المبارک ـەوە وتوویەتی: ئەگەر شەش ڕۆژیش بەڕۆژوو بێ بە جیا دروستە و کێشەی نییە.

وَقَدِ اسْتَحَبَّ قَوْمٌ صِيَامَ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ بِهَذَا الْحَدِيثِ. قَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: هُوَ حَسَنٌ، هُوَ مِثْلُ صِيَامِ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ. قَالَ ابْنُ الْمُبَارَكِ: وَيُرْوَى فِي بَعْضِ الْحَدِيثِ، وَيُلْحَقُ هَذَا الصِّيَامُ بِرَمَضَانَ. وَاخْتَارَ ابْنُ الْمُبَارَكِ أَنْ تَكُونَ سِتَّةَ أَيَّامٍ فِي أَوَّلِ الشَّهْرِ. وَقَدْ رُوِيَ عَنِ ابْنِ الْمُبَارَكِ أَنَّهُ قَالَ: إِنْ صَامَ سِتَّةَ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّالٍ مُتَفَرِّقًا فَهُوَ جَائِزٌ .

**عبدالله بن أحمد** دەڵێ: پرسیارم کرد لە باوکم دەربارەی ئەم ڕۆژانەی دوای ڕەمەزان کە خەڵکی بەڕۆژوو دەبن تیایدا؟ وتی: کێشەی تێدا نییە. ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی شەش ڕۆژ لە شەوال، جا ئەگەر کەسێک شەش ڕۆژ بەڕۆژوو بوو کێشەی نەبێ و گوێ نەداتێ پێکەوە بەڕۆژوو بێ یاخود بە جیا.

سألتُ أَبي عَن هذه الأيام التي تُصام بعد رمضان؟ قال: لا بأَسَ بصيامها. إنّما قال النبي ﷺ ستة أيام مِن شَوال، فإذا صامَ ستة أيام مِن شَوال لا يبالي فَرّقَ أَو تابع.

مسائل أحمد بن حنبل رواية عبدالله بن أحمد | ٧٢٢



# قەزا کردنەوەی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

بۆ ئەو کەسانەی بە نیازن شەش ڕۆژ ڕۆژووی مانگی شەوال بگرن، بەڵام لە هەمان کاتدا چەند ڕۆژێک ڕۆژووی ڕەمەزان قەرزارن، ئەوە سەرەتا با قەرزەکەیان بگرنەوە ئەنجا شەشی شەشەڵان، چونکە هەرکەسێک هەموو ڕۆژووی ڕەمەزانی نەگرتبێ پێی ناوترێ ڕەمەزانی بە کامڵی گرتووە، بەڵکو پێی دەوترێ هەندێک ڕۆژی ڕۆژووی ڕەمەزانی گرتووە.

**ثوبان** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « هەرکەسێک دوای جەژن شەش ڕۆژ بەڕۆژوو بێ، ئەوە لەگەڵ ڕۆژی ڕەمەزان دەکاتە ڕۆژووی هەموو ساڵەکە ». ﴿ مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴾.

حَدَّثَنَا هِشَامُ بْنُ عَمَّارٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا بَقِيَّةُ، قَالَ: حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ خَالِدٍ، قَالَ: حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ الْحَارِثِ الذِّمَارِيُّ، قَالَ: سَمِعْتُ أَبَا أَسْمَاءَ الرَّحَبِيَّ، عَنْ ثَوْبَانَ مَوْلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَنَّهُ قَالَ: « **مَنْ صَامَ سِتَّةَ أَيَّامٍ بَعْدَ الْفِطْرِ كَانَ تَمَامَ السَّنَةِ** ». ﴿ مَن جَاءَ بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ﴾.

سنن ابن ماجه | ١٧١٥

وتم: سەرنج بدەن ڕەسول الله ﷺ ئیستدلالی بەو ئایەتە کردووە چاکە یەک بە دەیە، جا تۆ سی ڕۆژ بەڕۆژووی، چاکەش یەک بە دە حساب دەکرێ، ئەمە دەکاتە سێ سەد، هەروەها شەش ڕۆژیش لە ڕۆژووی شەشەڵان دەگری ئەمیش یەک بە دە حساب بکە دەکاتە شەست چاکە، کۆی گشتی هەردووکیان دەکاتە سێ سەد و شەست کە دەکاتە ساڵێکی تەواو.

ثوبان رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « ڕۆژووی ئەم مانگە بە دە مانگ حسابە، وە شەش ڕۆژی مانگی دوای خۆی بە دوو مانگ حسابە، ئەمە دەکاتە هەموو ساڵەکە ». واتە مانگی ڕەمەزان و شەش ڕۆژ دوای خۆی.

حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَسَّانَ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ حَمْزَةَ، حَدَّثَنَا يَحْيَى بْنُ الْحَارِثِ الذِّمَارِيُّ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ الرَّحَبِيِّ، عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: « **صِيَامُ شَهْرٍ بِعَشَرَةِ أَشْهُرٍ، وَسِتَّةِ أَيَّامٍ بَعْدَهُنَّ بِشَهْرَيْنِ، فَذَلِكَ تَمَامُ سَنَةٍ** ». يَعْنِي شَهْرَ رَمَضَانَ وَسِتَّةَ أَيَّامٍ بَعْدَهُ.

سنن الدارمي | ١٧٨١ صحيح ابن خزيمة | ٢١١٥

**ثوبان** رضي الله عنه دەڵێ: ڕەسول الله ﷺ فەرموویەتی: « هەرکەسێک ڕۆژووی ڕەمەزان بەڕۆژوو بێ ئەوە مانگەکە بە دە مانگ حسابە، وە لەگەڵ ڕۆژووی شەش ڕۆژ دوای جەژن پێکەوە دەکاتە ڕۆژووی تەواوی ساڵەکە ».

حَدَّثَنَا الْحَكَمُ بْنُ نَافِعٍ، حَدَّثَنَا ابْنُ عَيَّاشٍ، عَنْ يَحْيَى بْنِ الْحَارِثِ الذِّمَارِيِّ، عَنْ أَبِي أَسْمَاءَ الرَّحَبِيِّ، عَنْ ثَوْبَانَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: « **مَنْ صَامَ رَمَضَانَ فَشَهْرٌ بِعَشَرَةِ أَشْهُرٍ، وَصِيَامُ سِتَّةِ أَيَّامٍ بَعْدَ الْفِطْرِ، فَذَلِكَ تَمَامُ صِيَامِ السَّنَةِ** ».

مسند أحمد | ٢٢٤١٢

ئەگەر هاتوو کەسێک وتی: باشە ئێوە دەڵێن هەرکەس قەرزارە نابێ پێش قەرزەکەی شەش ڕۆژ ڕۆژووی شەوال بگرێ، ئێ ئەوەتا عائشة رضي الله عنها دەڵێ: « من ڕۆژووی ڕەمەزان قەرزار بووم، نەمدەتوانی بیگرمەوە ئیللا لە مانگی شەعبان نەبێ ». واتە مانگێک پێش مانگی ڕەمەزان قەرزەکەی گرتووەتەوە.

عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ، أَنَّهُ سَمِعَ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ ﷺ تَقُولُ: كَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَقْضِيَ إِلَّا فِي شَعْبَانَ.

صحيح البخاري | ١٩٥٠ صحيح مسلم | ٢٦٨٧ سنن أبي داود | ٢٣٩٩ سنن الترمذي | ٧٩٣ سنن النسائي | ٢٣١٩ سنن ابن ماجه | ١٦٦٩ الموطأ لمالك | ٧٠٣ مسند أحمد | ٢٤٩٢٨ المصنف لعبدرزاق | ٧٨٨٢ المصنف لابن أبي شيبة | ٩٨١٥ صحيح ابن خزيمة | ٢٠٤٨

لە وەڵامدا دەڵێم: لە کوێی ئەو حدیثەدا ئاماژەی ئەوەی تێدایە کە دایە عائشة رضي الله عنها شەش ڕۆژی ڕۆژووی شەشەڵانی گرتووە؟ بێگومان ئەو ئاماژەیەی تێدا نییە، جا ناکرێ گریمانە و عەقڵیات بیخەیتە مێشکت و بڵێی جا دەکرێ دایە عائشة رضي الله عنها ئەو شەش ڕۆژەی نەگرتبێ؟! بەڵێ بۆ ناکرێ هەر خودی دایە عائشة رضي الله عنها وەڵامی ئەم قسەیە دەداتەوە بەهۆی مەشغوڵیەتی بە ڕەسول الله ﷺ و کاروبارەکانی ئەو قەرزەی تەئخیر کردووە.

لە کۆتایی ڕیوایەتەکەی مسلم هۆکاری ئەوەی تێدایە کە چ شتێک بووەتە هۆکاری دواخستنی گرتنەوەی قەرزەکەی، ئەویش مەشغوڵ بوونی بووە بە ڕەسول الله ـەوە ﷺ. دەڵێ: « کَانَ يَكُونُ عَلَيَّ الصَّوْمُ

مِنْ رَمَضَانَ، فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَهُ إِلَّا فِي شَعْبَانَ، الشُّغْلُ مِنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ، أَوْ بِرَسُولِ اللهِ ﷺ )).

تم بحمد الله

# سەرچاوەکان

١- جامع بيان عن تأويل آي القرآن لأبي جعفر محمد بن جرير الطبري.

٢- تفسير القرآن العظيم مسندًا عن الرسول ﷺ والصحابة والتابعين لأبي محمد عبدالرحمن بن أبي حاتم الرازي.

٣- جامع المسند الصحيح لأبي عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري.

٤- المسند الصحيح لأبي الحسين مسلم بن الحجاج النيسابوري.

٥- سنن أبي داود لأبي داود سليمان بن الأشعث السجستاني.

٦- الجامع المختصر من السنن لأبي عيسى محمد بن عيسى الترمذي.

٧- المجتبى لأبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب النسائي.

٨- سنن إبن ماجه لأبي عبدالله محمد بن يزيد بن ماجه القزويني.

٩- سنن الدارمي لأبي محمد عبدالله بن عبدالرحمن الدارمي.

١٠- الموطأ لأبي عبدالله مالك بن أنس بن مالك بن أبي عامر المدني.

١١- الأم لأَبي عبدالله محمد بن إِدريس بن العباس الشافعي القرشي.

١٢- مسند الشافعي لأَبي عبدالله محمد بن إِدريس بن العباس الشافعي القرشي.

١٣- مسند أحمد لأبي عبدالله أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

١٤- المصنف عبدالرزاق لأبي بكر عبدالرزاق بن همام بن نافع الصنعاني.

١٥- المصنف لأبي بكر عبدالله بن محمد بن إبراهيم أبي شيبة القيسي.

١٦- مسند إسحاق بن راهوية لأبي يعقوب إسحاق بن إبراهيم بن مخلد الحنظلي المروزي.

١٧- مسند أبي دواد لأبي داود سليمان بن داود بن الجارود الطيالسي.

١٨- سنن الحميدي لأبي بكر عبدالله بن الزبير الحميدي القرشي.

١٩- سنن سعيد بن منصور لأبي عثمان سعيد بن منصور بن شعبة النيسابوري.

٢٠- المراسيل لأبي داود سليمان بن الأَشعث السجستاني.

٢١- كتاب المصاحف لأبي بكر عبدالله بن سليمان بن الأَشعث السجستاني.

٢٢- كتاب الصيام لأبي بكر جعفر بن محمد بن الحسن بن المستفاض الفريابي.

٢٣- كتاب العيدين لأبي بكر جعفر بن محمد بن الحسن بن المستفاض الفريابي.

٢٤- صحيح إبن خزيمة لأبي بكر محمد بن إسحاق بن خزيمة النيسابوري.

٢٥- سنن الدارقطني لأبي الحسن علي بن عمر الدارقطني البغدادي.

٢٦- مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي الفضل صالح بن أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

٢٧- مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي عبدالرحمن عبدالله بن أحمد بن محمد بن حنبل الشيباني.

٢٨- مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي داود سليمان بن الأشعث السجستاني.

٢٩- مسائل أحمد بن حنبل رواية أبي يعقوب إسحاق بن إبراهيم بن هانئ النيسابوري.

٣٠- مسائل أحمد بن حنبل وإسحاق بن راهوية رواية أبي يعقوب إسحاق بن منصور بن بهرام الكوسج المروزي.

٣١- كتاب ناسخ الحديث ومنسوخه لأبي حفص عمر بن أحمد بن عثمان ابن شاهين البغدادي.

٣٢- حلية الأولياء وطبقات الأصفياء لأبي نعيم أحمد بن عبدالله الأصبهاني.